محەمەد عەلی سوڵتانی

# ڕاپەڕینی عەلەویەکانی زاگرۆس
## یا
## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەسەر ئەهلی حەق



وەرگێڕانی لەفارسییەوە:
حەسەن عەبدولکەریم و کەمال ڕەشید

سلێمانی
2003

## ناونیشانی کتێبەکە بەفارسی

# قیام

# و

# نهضت علویان زاگروس

ویراسته وترجمه وتصحیح: محمد علی سلطانی/ خط جلد : فریبا مقصودی

طرح جلد: توبا/ جروفچینی: نخستین/ چاپخانه: رستم خانی

صفحات:۲۳۲م تیراژ:۳۰۰۰

ناشر: مؤسسه فرهنگی نشر سها

تهران ـ صندوق پستی: ۶۸۷ ـ۱۴۳۹۵

# وەزارتی رۆشنبیری

## بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

www.roshnbiri. org
khanaywargeran@yahoo.com


- ناوی کتێب: راپەڕینی عەلەوییەکانی زاگرۆس
- ئامادەکردنی: محەمەد عەلی سوڵتانی
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: حەسەن عەبدولکەریم و کەمال رەشید
- تایپ: بەهرە عیزەدین
- نەخشەسازیی کۆمپیوتەری: مەهدی ئەحمەد
- نەخشەسازیی بەرگ: ستار قادر
- زنجیرە: ١٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردنی ( ٢٢٧ )ی ساڵی ( ٢٠٠٣ )ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە
- چاپ: چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری
- چاپی یەکەم: ٢٠٠٣ـ سلێمانی

# ڕاپەڕینی عەلەوییەکانی زاگرۆس

لەسەردەمی سەفەوییەکانەوە تارۆژگاری ئەمڕۆ، دەبێ لەچوار بزافی چوونیەکدا لە ڕاپەڕینی عەلەوییەکان بکۆڵینەوە.

١-بزووتنەوەیەك کەپارێزگاری دەکرد لەسستمی سیاسی و مەزهەبی سەردەمی سەفەوییەکان و دژی هەر جۆرە گەڕانەوەو باسکردنێکی باری ئایینی سەردەمی عەباسیو سەلجوقی غەزنەوییەکان و ئەوانیتربوون لەلایەن دەسەلاتدارە سەفەوییەکانەوەو بەرەنگاریشی دەبوونەوە، وەك بزووتنەوەی گۆڕان و شۆڕشگێڕەکانی سەردەمی شائیسماعیلی دووهەمو پاش ئەو، کە لە مۆڵگەی بنارەکان و لوتکەکانی شاخی زاگرۆسدا نیشتەجێ بوون.

٢-بزووتنەوەی لایەنگرانی (شامیهمان )کە هەندێ جار هاوڕەوت لەگەڵ بزووتنەوەی سەفەوییەکاندا و لەناو جەرگەی ئەواندا دەجولانەوە، لەگەڵ سوود وەرگرتن لە ئەزموونی ڕاپەڕینە پێشووەکانی خۆیان، وەك (نوربەخشی )و (موشەعشەعی) کە پەیوەندییان هەبوو بەچەقی بازنەی بزووتنەوەکانەوە، واتە ئایینی (پەردیوەریی)، (ئەهلی حەق)و لەسەرەتاوە تاکۆتایی، لەگەڵ سستمی ئایینی سەفەوییەکاندا، بەیەك ئاقاردا هاوڕەتبوون و دوور لەدەسەلاتخوازیو بەپاراستنی کاروباری مەعنەویی ڕاستی لەهاوپەیمانییەکی چەند لایەنەداو بەرێزگرتن لەڕێنماییەکانی زانایانی ئایینی و پاراستنی کرداروگوتارو کۆبوونەوەکانی خۆیان، پایەیەکی پتەویان لەئایینی ئەهلی حەقی، هاوڕەتی ڕاپەڕینی عەلەوییەکان و لەپاڵ سەفەوییەکاندا هێنایە ئاراوە، وەك بنەماڵەی

(شامیهمان)ی ئاتەش بێگی، کەناوچەیەکی جوگرافیایی بەربڵاویان بەلایەنگرانێکی زۆرەوە لەخۆ کۆکردەوە.

٣-بزووتنەوەی نوێی (سەرهەڵدانی بەرچاو روونەکانی ئەهلی حەق) کە وردە وردە لەسەردەمی سەفەوییەکانەوە پەیدابوو و لەسەردەمی قاجارییەکاندا گەیشتە لووتکەو لەتورکیا وعیراقیشدا، کاریگەری و رەنگدانەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی، لەسەردەمی کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی قاجارییەکان و گۆڕانکارییەکانی دواتری بەدوی خۆیدا هێنا، وەك سەرهەڵدانی (تەیموور) لەئێرانی سەردەمی قاجارییەکان، راپەرینی سەید رەزای کوردی عەلەوی لەتورکیاو سەرهەڵدانی بزووتنەوەی حەقە لەعیراق، بەسەرکردایەتی شێخ عبدولکەریمی شەدەڵە کەگەڕانەوەیەك بوو بۆ سەرچاوەو شوێن گۆڕکێیەکی باوەڕ بوو لەڕێبازی نەقشبەندییەوە بۆ بنەماکانی ئەهلی حەق.

٤-چەند بزووتنەوەیەکی چوونیەك و جیاجیا کە لە(حروفیە)و بزاڤە هاوشێوەکانی، کەدامەزرێنەرانی پەیڕەوییان لە هێلێکی فیکری هەڵبژێراوی تایبەت دەکردو لەئەنجامدا بوو بەهۆی کەرت و پەرت بوون و ناکۆکی لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی ڕێبازی ئەهلی حەق، وەك (نوقطەوی)و هاوشێوەکانی. لەگەڵ دەرکەوتنی شائیسماعیلی سەفەویدا (٩٠٧-٩٣٠/ك)رێکخراوە سیاسی مەزهەبییە نهێنییەکانی عەلەوییەکانی زاگرۆس، بەتەواوی ئاشکرا بوون و پێشەواکانی سەفەوییەکان، تا بەتەواوی لەسەربەخۆیی و دەسەڵات گرتنە دەست دڵنیابوون، وابەستەی عەلەوییە توندڕەوەکان بوون و لەگەڵیاندا بوون و بەجۆرێ لەجیهانی ئیسلامیدا پشتگیرییان لێکردن لەرۆم و میسرو هندو وڵاتانی تردا، دەستیان کرد بەپروپاگەندە کردن و داڕشتنی نەخشەو پلان، بۆ لەناوبردنی ئەو حکومەتانەی کە عەلەوی نەبوون و هەروەها سەرکوتکردنی دوژمنە کۆنەکانی خۆیان کە یەکەیەکە ئاماژەیان

پێدەکەین. بەڵام هەر کە سەفەوییەکان بەدوا ئامانجی خۆیان گەیشتن، بۆ لاواز کردنی پێگەی پێشەواو شۆڕشگێڕانی بزووتنەوەکە، دەست بەکاربوون. گیان بەخشانی ئەهلی حەق بەتایبەت (هەفتەوانە) ناچاربوون سەر لەنوێ دەست بکەنەوە بەکاری نهێنیو شارەزوورو موسڵ بوون بەمەڵبەندێکیتری خەبات. پاشماوەکانی بزووتنەوەی (نوربەخشی) کە لەگەڵ بنەماڵەی شامیهمان ((ئاتەش بێگی)) هاوپەیمانییەکی مەزهەبیو مەعنەوییان پەیدا کردو، لەسەرهەڵدانی سەفەوییەکاندا بە((تاج بەخش)) دائەنران و بەگوێرەی ئەوەی کە لەسەرچاوە مێژووییەکاندا باسکراوە، شا ئیسماعیلی سەفەوی (خەتایی) لەپیاوانی بەردەستی گەورەکانی ئەو بنەماڵەیە دادەنرا، توانیان ئامادەییەکی بەرچاویان هەبێ. لەسەرەتای ئەم بەشەدا، باسێکی گوزەرای پلەوپایەی شا ئیسماعیلی یەکەم دەکەین، لەروانگەی عەلەوییەکانی زاگرۆسەوەو باسی چۆنیەتی گەیشتنی بەپلەوپایەی پاشایەتی دەکەین، بەگوێرەی ئەوەی لەدەقە مێژوویی و مەزهەبییەکانی ئەهلی حەقدا هاتووە. وەك دەزانین ئەهلی حەق، شا ئیسماعیل بەکەمتر لەحەزرەتی سەید ئەحمەدی عەلەوی (باوەیادگار) دائەنێن و حاجی نیعمەتی جەیحون ئابادی لەکتێبی (شانامەی حقیقەت)دا، ئەمەی باسکردووە:

| | |
|---|---|
| چـو آن یـادگـاری بـظلم شـدید | دویـم بـاره از دسـت قـوم پـلید |
| شهید گشت، زان پس شد لا مکان | وراکـرد سـلـطان دور جـهـان |
| کـه بـودی سماعیل شد نـام آن | نمودی مـسـخـر سـراسـر جهان |
| چـو بگذشت زان دور دیگر اساس | شدی ظـاهر از جامه شاه عباس |
| ز جام سـمـاعـیل، عـباس شـاه | شـده ظـاهـر انـدر زمـانه بـگـاه |
| کـه بـودند هـر دوز نـسـل صفی | نشـستند بـر تـخت شاهنشهی |

{شاهنامه حقیقت، ص٥٢٧}

# عەلەوییەکانی زاگرۆس،
# شا ئیسماعیلی سەفەویو یەزیدییەکان

خاکیکوردستانو ئازربایجانو خوزستانو میزۆپۆتامیا زێدی ئایینە سەرەتاییەکانو پارێزەری گەلێك دابونەریتی دانیشتوانی کۆنی ئێران بوونو بەسوود وەرگرتن لەکۆسپو سەرچاوە سروشتییەکان، هەزاران ساڵ بۆ پاراستنی بیروڕاو بۆچوونی پێشینانی خۆیان، هەوڵی بیٚوچانیان داوە. یەزیدییەکانی پاشماوەی ئایینی(میهری) کە لەگەڵ عەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەقی پاشماوەی (خوورەم دین)ەکاندا دراوسێیەتیو هاودەمی ئاڵوگۆڕکردنی بۆچوونو بیروڕایان هەبووەو کاریگەرییەکی هەمەلایەنەی فیکریو فەلسەفەییان لەسەر یەکتر هەبووەو، هاوسنووری لەکاتی ژیانی نهێنیو ئاشکرایاندا، بوو بووە هۆی پەیدابوونی گونجان لەگەڵ یەکداو هەندێ جاریش دژایەتیو ناکۆکی لەبزووتنەوە سیاسیو مەزهەبییەکانیاندا. هاوکات لەگەڵ هاتنی (سەید باباعەلی هەمەدانی) بۆ کوردستان عەلەوییە توندڕەوەکان بەیعەتیان پێکرد، لەبەرانبەردا یەزیدییەکان کەوتنە بەرەنگاریو روو بەروبوونەوەو سەرکردایەتی نەوەکانی شێخ عودەی کوڕی موسافیری هەکاری(کۆچکردوو لە٥٥٧ك)یان پیرۆز کرد، چونکە هاوکات لەگەڵ هاتنی سەید باباعەلی هەمەدانی بۆ کوردستانو بەیعەت کردنو پێشوازی کردنی عەلەوییە توندڕەوەکان لێیی، یەزیدیەکان، بنەماڵەی شێخ ئیسحاق سەفیەدینی کوردی سنجاری ئەردەبیلی باووباپیرانی سەفەوییەکان کە هاوپەیمانی عەلەوییەکان بوون، لەگەڵ هاتنی شێخ عودەی کوڕی موسافیری هەکاریدا لەسنجار، گەریان

کردبوون، ئەم هەڵوێستەی یەزیدییەکان، بووە هۆی پەیدابوونی دوژمنایەتی لەنێوان سەفەوی و یەزیدییەکانداو، هەروەك لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان کردووە، لەکاتی هێرشی تەیموریشدا، شێخ عەلائەدین عەلی هانی تەیموری دابوو، بۆ سەرکوتکردنی یەزیدییەکان و لەکاتی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی شائیسماعیلی سەفەویدا، یەزیدییەکان کە دوژمنایەتییەکی کۆنیان هەبوو لەگەڵ بنەماڵەکەی ئەو و هاوپەیمانەکانیدا، وەك یەکەم گروپ و تاقم دژی سەربەخۆیی و دەسەڵات گرتنە دەستی سەفەوییەکان راپەڕین و شێری سارمی کورد، پێشەوای یەزیدییە شۆڕشگێڕەکان بەرامبەر بەسوپای قزڵباشی عەلەوی خۆی راگرت، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو و بەهۆی خۆڕاگری عەلەوییە توندڕەوەکانەوە، لەساڵی(٩١٣/ك ١٥٠٦ن)دا، سەرکێش و رووبەڕووبوونەوەی یەزیدییەکان کپ کرایەوە.

بابەتی پەیوەندیدار بەبیرو باوەڕو کرداری یەزیدییەکانەوە، لەم لێکۆڵینەوەدا کە لەسەر لۆژیکی مێژوویی دامانناوە، بۆ کات و نووسینێکی‌تر دایئەنێین و بۆ رۆشنکردنەوەی فیکری خوێنەرەکان، دەست ئەکەین بەتاوتوێکردنی سەرچاوەی قسەکانی خۆم و شیکردنەوەیان و پێناسەکردنێکی سوودمەندو کورتی رەوتی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی یەزیدییەکان، تا لایەنی جیاوازیی ئەوان لەگەڵ ئەهلی‌حەقدا دیاری بکرێت.

خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی لەلێکۆڵینەوە بایەخدارەکانی خۆیدا، دەربارەی یەزیدییەکان و شەیتان پەرستەکان دەڵێ: (یەزیدییەکان هیچ کاتێك نەیانویستووە ئەم راستییە بشارنەوە کە پلەوپایەی خوایەتییان بۆ شێخ عودەی داناوە، لەڕاستیدا ئەوان لەمە زیاتر رۆیشتوون و یەزیدی کوڕی

موعاویەشیان بەخوا داناوەو پەرستوویانە، وا دێتە پێش چاو لەوکاتەدا کە پلەوپایەی گروپی عەدەوییەکان لەلایەن ئەلیەد بابائیز {کەئەم ناوە دەقاو دەق لەلایەن وەرگێر بۆ فارسییەوە هێنراوەو مەبەست سەید بابا عەلی هەمەدانییە} رووبەڕووی مەترسی دەبووەوە پلەی خوایەتییان بۆ یەزید دادەناو بەسومبلی بەرەنگاربوونەوەیان دادەنا.

ئەلیەد (سەیدعەلی) خەڵکی خۆراسان بووو لەگەڵ دەهەزار دەروێش لەمەغۆلستانەوە هەڵهاتبووو پەنای بردبووە بەر سنجاروناوچە کوێستانیو شاخاوییەکانی عیراق. شێخ عودەی لەو سەردەمەدا دژی هەڵبژاردنی یەزید بوو بۆ پلەی خوایەتیو، لەراستیدا دان نان بەخوایەتی بۆ قێزەونترین کەسایەتی سەرتاسەری مێژووی ئیسلام، ئەنجامێکی خراپی لێ کەوتەوە بۆ ئەم گروپە، چونکە بەهۆی ئەم کردارەوە، یەزیدییەکان لە جیهانی ئیسلام وەدەرنراونو ئەو تۆمەتانەی کەپاشتر ئاراستەیان کرا، زیاتر شوێنی خۆی کردەوە، بەتایبەتی تۆمەتی شەیتان پەرستی.

ئەلیەد بابا جگە لە(سەید بابا عەلی هەمەدانی) باپیری سوڵتان سەید ئیسحاقی عەلەوی بەرزنجی، کەسێکیتر نییە کە لەگێڕانەوەی ئەهلی حەقدا، بەباباعەلی دەروێش بەناوبانگە.

بەدوور نازانرێ کەلە سەربنەمای ئەو بەڵگەنامەو سەرچاوانەی تۆفیق وەهبی لێکۆڵینەوەی لەسەرکردوونو پوختەیەکی لێرەدا خراوەتە روو و هەروەها ئەوەی کەلە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا هاتووە، سەید باباعەلی لەخۆراسانەوە لەگەڵ سەید محەمەد زاهد پیر خدری شاهۆیی هاتبنە ناوچەی زاگرۆسو، ناوبانگ دەرکردنی بەهەمەدانی، پاش ئەوە بوو کە

لەوشـوێنەدا نیشـتەجێ بـووە، وەك چـۆن نازنـاوی شـاهۆییش، دوای کۆچکردنی پیر خدر بەکارهێنراوە.

دەربارەی ئەوەی کە گوایا سەید بابا عەلی لە مەغۆلستانەوە هاتبێ، گوایا وەرگێڕ بە هەڵەدا چووبێ، دەبێ دەقی (لەگەڵ دەهەزار دەروێشدا لە( ترسی) مەغۆلەکان هەڵاتووە )، راست بێت، چونکە یەکەم، کەمێك شارەزایی لەباری ئاینی و کۆمەڵایەتی مەغۆلستان ئەوە دەردەخات کـە مەغۆلـەکان مـورادو دەروێش و بابا ئەلیەدیان نەبووەو نییە. دووهەم، مەغۆل لەمەغۆل راناکاو تا بە شاخەکانی کوردستان پەنابەرێ. سێهەم، لەمەغۆلستانەوە لەگەڵ دەهەزار دەروێشـدا پـەنابردن بـۆ کوردسـتان هیـچ مانایـەکی نییـە. چـوارەم، بـۆ مەغۆلێکی وێڵی بیابان و نا موسڵمان، یەزیدو غەیری یەزید بەیەکچاو سەیر ئـەکرێن. بـە ئەگـەرێکی نزیـك لەراسـتیەوە، راسـتیی مەسـەلەکە ئەوەیـە کەلەسەرەتای باسەکەماندا روونمانکردەوە . وەك چۆن لەشوێنێکی تردا، لە روونکردنەوەی چوار کات لـە ئایینی یـەزیدیدا کەپشتی بەستووە بە دەقی کتێبـی (جیلوە)، کەیەکێکە لـە دوو کتێبـە پیرۆزەکەی یەزیدییەکان، تۆفیق وەهبی نووسیویەتی: (مەبەست لـەچوار کات کە لێرەدا بـەکارهاتووە، هـەر ئـەو چوار وەرزەیـە لـەمیترایزمدا هـاتووە، ئەوانـە هەریەکـەیان بەسـێ جـۆرو نیشـانە لەوێنـە گەردوونییـەکان داڕشتبوو و بـەو نیشـانانەوە ئەپەرسـتران، وادیارە بنیات نـەری ئایینی یـەزیدی پەرستنی ئەو دوانـزە نیشانەی وێنـە فەلەکییـەی وازلێ هێنـابێ، بەهۆی ئـەوەوە کـە شـیعە دوانـزە ئیمامییـەکان و عەلەوییـەکان کـەدوانزە ئیمـامیین پێیـان بـاش نـەبووبێ، لەبەرئـەوە پەرستنەکەی خۆیـان تـەنیا لـە چوار وەرزەکەدا چڕکردبووەوە، هـەر چـەندە هەریەك لەو چوار وەرزە بەسێ شێوە داڕێژرابوون. کـە ئەمـەش یـەکێکی تـرە

لەو ناکۆکییە سەرەکییانەی یەزیدییەکان لەگەڵ عەلەوییە میانەرەو و توندڕەوەکانداو جێی هیچ گومانێك ناهێڵینەوە، لەوەی ئەهلی حەق و یەزیدییەکان دژایەتی یەکتریان کردووە، لەسەرەتای پەیدا بوونی بزووتنەوەکەو بایەخدانیان بەسەرکردە سەرەکییەکانیان(سەید بابا عەلی هەمەدانی و شێخ عودەی هەکاری).

لەبەرئەوەی کەلەم توێژینەوەدا لەسەر بنەمای لۆژیکی مێژوویی و فیکرو لێکۆڵینەوەو نووسینی بێلایەنانە دەستمان بەکارکردووە، دەربارەی شەیتان پەرستی و چۆنیەتی پەیوەندیی یەزیدییەکان بە ئومەوییەکانەوە، دەبێ ئەوە بزانین کەلەسەدەی شەشەم بەدواوە، وشەی (یەزیدی) لەکتێبەکاندا بەرچاو ئەکەوێ و لەوەپێشتربە یەزیدییەکان گوتراوە داسنی و شەیتان پەرست و خوانەناس، ئێستاش زۆربەی کوردە موسڵمانەکان هەرپێیان دەڵێن ((داسنی)).

زەردەشتییەکان بەوانەی هێزە سروشتییەکانیان دەپەرست دەگوت دێوە یەسنا (دێوبەندە) و لە کتێبی زەند ئاویستادا، ئەو وشەیە هەیە کە لەگەڵ وشەی دێو لەزمانی فارسی و وشەی ( شیدا ) لەزمانی ئارامی و سامیدا، هاومانان و مانای (شیدادات) لەزەند ئاوێستادا، واتە دروستکراوی ئەهریمەن یان دروستکراوی شیداکان و لەبەر ئەوەی لەئاوێستادا وشەی شیدا بە ( ان ) کۆکراوەتەوە، بەتێپەڕبوونی کات، لەناوخەڵکدا ناوی لە (شەیدا بەندەگان ) یا (شەیدا پەرستان ) هاتووەتە ئاراوە کە بڕاوە بەسەر ئەو کەسانەدا، هێزە سروشتییەکان دەپەرستن و لەئەنجامدا شەیدا بەندەگان بەشەیتان پەرستان ناوبانگیان دەرکردووە . مەزدیە سنەکان بەگوێرەی ڕێنماییەکانی زەردەشت لەرۆحە پیسەکان نەئەترسان و رووبەڕویان

ئەبوونەوەو باوەڕیان بەسەرکەوتنی خۆیان هەبوو، بەڵام شیدا پەرستان، یاشەیتان پەرستان کەئەمڕۆ بووە بەناویان، دوو هێزی چاکەو خراپەیان ئەپەرستو لەبەر ئەوەی لەهێزی شەڕو خراپە دەترسان، لەبری ئەوەی بەربەرەکانێیان بکەن، قوربانییان پێشکەش ئەکردنو لەم کارەیاندا سێ مەبەستیان هەبوو:

یەکەم، خۆیان لەخراپەکاری ئەوان دوور ئەخستەوە.

دووهەم، داوای کۆمەكو یارمەتییان لێ ئەکردن کە رووبەرووی دوژمن ئەبوونەوە .

سێهەم، بێ ترس هێرشیان ئەکردە سەر خەڵك، چونکە لەهێزە سروشتییەکان پەیڕەوییان ئەکردو سوودیان لەکاری خۆیان وەرئەگرتو توانا و دەسەڵاتیان بەردەوام ئەبوو .

لەهەمان کاتدا ئەوان خوایەکی چاکەکارو گەورەتریشیان هەبوو کە ((دیاوسی باوکە ))و ئێستا یەزیدییەکان (داسنییەکان)ئەی پەرستنو بەناوی ((مەلیك تاوس )) یا (ئەب تاوس=عەب تاوس ) ناوی ئەبەن .

رەنگە وشەی یەزیدی لەیەزد یا یەزدان وەرگیرابێ کە لەوشەی (یەن)ی ئاوێستاییەوە هاتووەو بەمانا پەرستنو ستایش کردنەو لە سانسکریتیدا، بە شێوەی یەچ =Yaj یەژ هاتووەو لەوەوە وشەی (یەزەتا Yazata)ی ئاوێستایی وەسفێکی لێپەیدا بووە کە هەمان مانای دروستکەر یا خولقێنەر یا پەرستراوە.

لەزمانی پەهلەویدا، وشەی (یەزەتە) یەکەم جارسوککراوەتەوەو بووە بە(یەزەتYazat) پاشتر پیتی(ت) گۆڕاوە بە (د)و وشەکە بووە بە یەزەد(Yazad) کە بە( یەزەدان Yazadan) کۆئەکرێتەوەو دواتر لەسەردەمی

ئیسلامیدا، جارێكی تر كورتكراوەتەوەو بووە بە(یەزدان Yazdan)و لەبەرئەوەی عەرەبەكان مانای یەزدانیان نەزانیوە، كردویانە بەیەزیدو داسنییەكانیان گەڕاندووتەوە بۆ یەزیدی كوڕی موعاویەوناویان ناون یەزیدی.(مێژووی سۆفیگەری لەكوردستان، ل٢ بەفارسی).

هەرچەندە دەربارەی هۆی ناوبردنی داسنییەكان بە یەزیدی لە سەرەوە راستیەكەمان خستەڕوو، بەڵام دەربارەی مەسەلەی پەیوەندی بەیەزیدی كوڕی موعاویەوە (٦٠-٦٤ك )خودی یەزیدییەكان لەسەر ئەوە كۆكن كەیەزید دامەزرێنەری ئەم ئایینە نییە، بەڵكو ئەو شەریعەتو رێسای یەزیدییەكانی بەهێز كردووەو برەوی پێداوەو دامەزرێنەری راستەقینەی ئایینەكەیان (شاهدی كوڕی جەڕاح )ی كوڕی بێهاوتای ئادەم بووە ( ؟!). یەزیدی كوڕی موعاویە لەئایینی ئیسلام وەرگەڕایەوەو رووی كردە ئایینی یەزیدی،و هەرلەبەرئەوەشە یەزید بەدووهەمین مەلائیكە لە حەوت مەلائیكەكەی خۆیان دائەنێن،و لایان وایە كەرۆحیانەتی یەزید چووەتە لاشەی شێخ (عودەی كوڕیموسافیری)ی گەورە شێخی یەزیدییەكانەوە.
{كتێبی- بررسی مختصر از تاریخ ادیان كردان- لاپەرە ٥-٦ بەفارسی}

لەشەرحی (ملل ونحل)ی شەهرستانیدا،دەربارەی ئەو یەزیدییانەی ئەدرێنە پالّ (یەزیدی كوڕی ئەبی ئینسییە) چەند باسێك هاتووە كەپەیوەندیی بەیەزیدییەكانی شامەوە هەیەو پەیوەندییان بەمەبەستەكەی ئێمەوە نییە.

ئەوەی زیاتر بووە بەهۆی بلاوبوونەوەو تەشەنەكردنی ئەم بابەتەو راستییەكەی راگەیاندووەو ئێستاش هەر رای ئەگەیەنێ ئەوەیەكە لە هەشت پلە ئایینییەكەی یەزیدییەكاندا كەبریتین لە ئەمیر، باباشێخ، شێخ، پیر، فەقیر، قەوالی بچووك، مورید، پلەی شێخ دەبێ لەو سێ بنەماڵەیەی ئادانییە،

شەمسانییە، قابانییە بێت کە بەزانایانی ئایینی یەزیدی دائەنرێن و باوەڕیان وایە کە ئەم سێ بنەماڵەیە لەنەوەی یەزیدی کوڕی موعاویەن و بۆ پاراستنی پلەوپایەی خۆیان، دەستیان داوەتە تێکەڵ کردنی بنەچەو وەچە.

پیاوە گەورەو ئارامگە پیرۆزەکانی یەزیدییەکان، بە پێچەوانەی پیاوەگەورەو ئارامگە پیرۆزەکانی ئەهلی حەق کەلە سووکایەتی پێکردنی کەسانی تر پارێزراوو هەردەم ڕێزیان لێگیراوە، لەلایەن گروپە جیاجیاکانەوە، وەك لەباسی سەید ئەحمەدی عەلەویدا وەکو نموونە ئاماژەی پێدەکەین، قەڵەمڕەوی یەزیدییەکان دووچاری کارەسات و دەردەسەرییەکی زۆرهاتوون، لەوانە شێخ حەسەنی پێشەوای یەزیدییەکان لە موسڵ ساڵی (٦٤٤کۆچی) لەلایەن ناحەزانیەوە خنکێنراو لەساڵی (٦٥٢)ی کۆچیدا، فەرمانڕەوایەکی بەکرێگیراوی موسڵ ئەمیری یەزیدییەکانی ئیعدام کرد، لەگەڵ سەد کەس لەیەزیدییەکانداو پاشان گۆڕەکەی شێخ عودەی هەڵدایەوەو ئێسك و پروسکەکەی سووتاند، لەسەدەی نۆهەمیشدا (ساڵی ٨١٧ کۆچی) بەفیتی جەلالودین محەمەد کوڕی عیزەدین یوسفی حەلوانی) کە یەکێك بوو لەزاناناییینییە ناودارەکانی ڕێبازی شافعی لە ئێران، فەرمانڕەوای جەزیرەی ئیبن عومەرو کوردە نایەزیدییەکان کەوتنە کوشتن و تالان کردنی یەزیدییەکان . لەسەرەتای سەدەی دوازدەهەمیشدا(١١٢٧ کۆچی)، سوپای مەلیك موزەفەر بەیارمەتی مەلا حەیدەری کورد هێرشی کردە سەر یەزیدییەکان و ژن و منداڵەکانیان بەدیل گرت و ماڵ و حاڵیان بە تالان بردن، ژنەکانیان وەك کۆیلە فرۆشتن و کەنیزو کچەکانیان بۆ خۆیان هێشتەوە، لەنیوەی یەکەمی سەدەی سیانزە

هەمیشدا (١٢٤٧ کۆچی-١٨٣١ زایینی)موحەممەد پاشای ناسراو بە میرە کوێری ڕەواندز هێرشی کردە سەر قەڵەمڕەوی یەزیدییەکان و زیاتر لە٧٥٪یانی لە ناوبرد، لەسەرەتای سەدەی چواردەهەمیشدا، ساڵی (١٣٠٨ کۆچی) دەوڵەتی عوسمانی بەمەبەستی ملکەچ پێکردنی یەزیدییەکان بۆ خزمەت لەسوپادا، فەرمانی دەرکرد بۆ عومەر وەهبی، بەمەبەستی سەرکوتکردنیان و ملکەچ پێکردنیان. ئەویش هەندێ لەیەزیدییەکانی ناچارکرد کە ئیسلام ببن و کوڕەکەشی (عاسم بەگ ) فەرمانی کوشتن و تالآنکردنی یەزیدییەکانی وەرگرت و چی پەیکەری پیرۆزی یەزیدییەکان هەبوو بە تالآن بردی و گومەزی گۆڕی پێشەواکانی یەزیدییەکانی وێران کردو لەسەرگۆڕەکەی شێخ عودەی شتی ناشیرین و نالەباری وای کرد کە کەڵکی ئەوەیان نییە بنووسرێنەوە.

جارێکی‌تر لەساڵی ١٣٥٧ی‌کۆچیدا، بەهۆی یاخیبوونی یەزیدییەکان لە سەربازی، حکومەتی پاشایەتی عیراق تۆمەتی ئەوەی دایە پاڵیان کە هاوکاری مەسیحییەکان ئەکەن و چالاکی ئەنوێنن بۆ بەرژەوەندیی فەرەنسییەکانی نیشتەجێی سوریا و دەستی کرد بەسەرکوتکردنیان و لەئەنجامدا، دەیان کەسی لێیان کوشت و چەندەها کەسی خستنە زیندانەوەو دووری خستنەوەو هەندێکیشیان هەلآتن و هەندێکیشیان لە سێدارەدران.

تەحسین بەگی دوا میری یەزیدییەکان کە دوای مردنی باوکی، لەکۆتایی مانگی تەممووزی ساڵی ١٩٤٤دا، پلەی میریەتی گرتەدەست و هاوکاریی مەلامستەفای بارزانی کردو لەساڵی ١٩٧٥کە سیاسەتی بارزانییەکان

تووشی شکست بوو، لەگەڵ بارزانیدا پەنای بردە بەرئێران و ماوەیەک لەمەهاباد مایەوەو پاشان چوو بۆ ئەوروپا.

مەڵبەندی یەزیدییەکان لەشارەکانی شێخان ، دهۆک‌وسنجار لەپارێزگای موسڵی وڵاتی عیراقی ئێستادایە، یەزیدییەکانی دانیشتووی کوردستانی تورکیا، بەهۆی جەوروستەمی دەوڵەتی ناوەندی تورکیاوە کەم بوونەتەوە، بەڵام لە کوردستانی سوریادا، بەهۆی زۆریی لایەنگرانی ئومەوی و بەهۆی ئەوەی سەر بەو بنەماڵەیەن، ژمارەیەکی زۆر یەزیدی تێدا دەژین و، لەناوچە کوردنشینەکانی روسیاشدا، یەزیدی هەن و لەگەڵ عەلەوییەکاندا کەزۆربەیان عەلەوی توندڕەوی ئەهلی حەقن، پەیوەندییەکی باشیان هەیەو لەقەوقازو تفلیسیشدا بەپەرت‌وبڵاوی لێرەو لەوێ هەن. (جکسن) لە گەشتەکەی ساڵی ١٩٠٣یدا بۆ ئاسیای ناوەڕاست، ژمارەی (داسنی) یەزیدییەکانی روسیای بەدوانزە هەزار کەس داناوە. {شرفنامە/ تاریخ العراق الحدیث: یزیدیها وشیطان پرستها/ دین باستانی کردان/ سفرنامە ابراهیم بیگ/ سفر نامە ویلیافر جکسن} {تاریخ تصوف در کردستان، محمد رؤوف تومکی،ص ١١-٢٠} بەم شێوەیە دووئایینی میهری خوڕەم دین کە بەمەبەستی پاراستنی فەرهەنگ و ئایینی کۆنی باو باپیرانی خۆیان، یەکێکیان لەقەڵەمڕەوی نەجیبزادەکاندا مایەوەو گەڕایەوە سەر ڕێبازی گەورە پیاوانی ئومەوی و خۆ هەڵواسینیان بە واندا کردبووە هۆیەک بۆ گەڕاندنەوەی رۆڵ و شێوەی رابردوویان لەگەڵ ئەوەدا کە پەسەندکردنێکی سەرپێی و رووکەش بوو، لەلایەن دەسەڵاتدارە حکومی و دەسەڵاتخوازەکانەوە، بەرەو لادان برا و تووشی ئازارو مەینەتی و سەرکوتکردن بووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەناوجەرگەی وڵاتانی موسوڵمانی عەرەب و تورکەوە، بنەمای داب و نەریتی خۆیان پاراست و وەک خۆیان مانەوە، هەرچەند وەک لەسەرەوە باسمان کرد، بە تۆمەتی جۆراوجۆر

تاوانبارکران و لەبەر کەللەڕەقی خۆشیان، دانیان ئەنا بەو تۆمەتانەدا. لەبەرامبەردا عەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەق کەخاڵی بەرامبەری یەزیدییەکان بوون و کەوتبوونە بەر پڕوپاگەندەی گەورە پیاوانی عەلەوی و هەرچەند لە مێژووی چەند هەزار ساڵەی خۆیاندا پێش ئیسلام و دواتر، بەتایبەت لەسەردەمی پەیدا بوونی موبارەك شای عەلەوی کوردییەوە (شاخۆشین)، هیچ کاتێك ئارام نەبوون، بەڵام لەسەرانسەری وڵاتە ئیسلامییەکاندا، چەند نموونەیەکی لەسەر ئەهێنینەوە، بە پاراستنی فەرهەنگ و کلتوری ئیرانی، بانگەشەکەرانی لە خۆبردووو گیان لەسەر دەستی عەلەوییەکان بوون و لەپاراستنی نهێنیەکاندا بە جۆرێك ژیان کە هەمووئایین و رێبازە ئایینییەکان، بەچاوی رێزەوە بڕواننە پیاوە گەورەوپیرۆزەکان و داب و نەریتی ئەوان و چەندین سەدەیەکە ژیانێکی ئاسوودە بەسەردەبن. بۆ ئاگاداریی زیاتر لەسەر مامەڵەی شا ئیسماعیل لەگەڵ شۆڕشی عەلەوییەکاندان، بڕوانە{ عالم آرای صفوی، لاپەڕە ١٢٦/ تاریخ کامل ایران، عبدالله رازی،ج٤، لاپەڕە ٤١٣/ دین مذهب در عصر صفوی، دکتور مریم یار احمدی، لاپەڕە ٨٤}.

بەتاوتوێکردنی ڕووداوەکانی سەرەوە بۆ توێژەران روون ئەبێتەوەکە:

١-بە پێچەوانەی ئەوەوە کە بڵاوبووەتەوە، نە یەزیدییەکان و نەعەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەق شەیتان پەرست نەبوونە و نین و، مەسەلەی (باوکە دیاوس)=مەلەك تاوس=ئەب تاوس =عەب تاوس و دئیوە یەسناو(دێو بەند) شیدادات =شیدا بەندەگان=شیدا پەرستان (ئەوانەی کەهێزە سروشتییەکان ئەپەرستن) کەبەهۆی سووك کردنیانەوە لەسەر زمانی خەڵکی ئاسایی و دەمارگیرییەوە، وردە وردە گۆڕان بەشەیتان پەرست و مەلەك تاوسی، ئەمە هیچ بناغەیەکی زانستی نییە و لە تۆمەتێك

زیاتر هیچیتر نییە، لایەنێکی تری رێزگرتن لە شەیتان، لەناو خواناسە گەورەکاندا پێشینەیەکی کۆنی هەیە، کە بەگوێرەی قسەی (ابن ابو الحدید المعتزلی )کە کتێبی (نهج البلاغە)ی لێکداوەتەوە، باسی ئەوەی کردووە کەئەحمەدی غەزالی، کەمامۆستای عەینولقوازتی هەمەدانیو برای ئیمام محەمەدی غەزالی رۆژێ لەبەغدا لەسەر مینبەر گوتی: هەرکەس خواپەرستی لە شەیتانەوە فێرنەبێ ئەوە کافرە، چونکە ئەمری پێکرا کە سوجدە بەرێ بۆ غەیری خوداو ئەو قبولی نەکرد{شرح ابن ابي الحدید ج١،ص٣٥}و، ئەوەش کە (بگتر)ی گەورە پیاوی ئایینی (یارسان) لەقسە هەڵەشەو پەڵەشەکانی خۆیدا، خۆی بە شەیتانو لەویش کەمتر داناوە ئەوە بابەتێکیترە. بەهەر حاڵ رێزلێگرتنو پەرستن دووشتی لەیەك جیاوازنو تێکەڵو پێکەڵکردنی باسەکان لەسەر بنەمای توندڕەوی شێوازی کاری توێژەران نییە.

٢-لەگەڵ ئەوەدا کە لەناوخەڵکی رەشۆکدا بڵاوە، ئەهلی حەقو یەزیدییەکان هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نەبوەو نییە، بەڵکو دوو ئاینی جیاوازنو لەباری باوەڕو عەقیدەوە لەگەڵ یەکتردا ناکۆكو دژ بەیەکن. بەداخەوە ئەم بۆچوونە هەڵەیە لەدەقە مێژووییەکانی ئێمەدا هەر لەسەردەمی ئەفشارییەکانەوە پەیدابووو کەمن ئەو مێژوونووسانەی کە لەهەر کوێ باس لەعەلەوییە توندڕەوەکان کرابێت هەربە یەزیدی ناویان بردبن، کەئەمەش راست نییە. ( محمد كاظم مروي، عالم آرای نادري، ص٢٥٢-٢٥٥) {محمد علی سلطاني، ایلات وطوایف کرمانشاهان، ج٢،ص٨٩٠و...}

٣-ئومەوییەکان بەردەوامیو مانەوەی خۆ بەگەورە زانینی سەردەمی جاهلییەتی خۆیان، لە چوارچێوەی بیرو بۆچوونی یەزیدییەکاندا پاراستووەو یەزیدییە میهر پەرستەکانیش لەژێربالی ئومەوییەکاندا، دابو نەریتی ئایینی کۆنی خۆیان پاراستووە .

٤-جگە لەدوژمنایەتی و ناکۆکی قووڵی نێوان یەزیدی و عەلەوییە توندڕەوەکان، بەتایبەتی بنەماڵەی سەفەوی، یەزیدییەکان لەژێر کاریگەریی هاندانی ئومەوییەکانی شام و (مەمالیك)ی میسرو سوڵتانە عوسمانییەکان، بەردەوام لەدژی عەلەوییەکان لەکۆششدابوون .

## راپەڕینی عەلەوییەکانی ئەهلی حەق لەخاکی میسردا

هاوکات لەگەڵ راپەڕینی یەزیدییەکان بەسەرکردایەتی و رابەری (شێر سارمی کورد) لەدژی حکومەتی ساوای شائیسماعیلی سەفەوی(٩٠٧-٩٣٠ك) کەلەساڵی (٩١٣)ی کۆچیدا دەستی پێکردو هەر لەو ساڵەشدا سەرکوت کرا،ئەو عەلەوییە توندڕەوانەی کەلە بەرزاییەکانی خاکی میسردا نیشتەجێ بوون، بەلایەنگری لە بزووتنەوەو سەربەخۆیی شائیسماعیلی سەفەوی، لەدژی مەمالیکەکانی میسر ئاڵای یاخی بوونیان بەرزکردەوەو دەستیان دایە خەباتی چەکداری و هەڵوێستی بزافەکەیان بەسوودی سەفەوییەکان بەهێزکرد، راپەڕینەکەش بەکوژرانی سەرکردەکانی بەتۆمەتی خوانەناسی و رەخنەگرتن لەقورئان کۆتایی هات،{تاريخ ابی طولون، ريچارد هارتمان، برلين ١٩٣٦،ص٦١} {تشيع و تصوف ص٣٨٧} بەڵام سەرکوتکردنی ئەم راپەڕینە بووە ئاگری ژێر خۆڵەمێش و شائیسماعیل تا دوا هەناسەی بۆ برەودان بە ئایینی عەلەوی لەوڵاتە ئیسلامییەکاندا رانەوەستا و عەلەوییە توندڕەوەکان کە لەو وڵاتانەدا دەژیان، بەشێوەیەکی نیمچەنهێنی و رێکخراوی نهێنییەوە، گیانفیداوگوێڕایەڵی ئەم بزووتنەوەیە بوون، دواجار لەساڵی (٩٣٠)ی کۆچیدا، ساڵی مردنی شائیسماعیل، شۆڕشێکی تر لە میسر بەرپابوو کە

ئەحمەد پاشای غولامی سولتان سەلیم رابەری بوو، ئەو وەك یەكێك لەپروپاگەندەچییەکانی شائیسماعیل ناوبانگی دەرکردبوو بۆ برەودان بەرێبازی عەلەوی دوانزە ئیمامی{الكواكب السائره ج١،ص١٥٩}، لەئەنجامدا ئەو شۆرشە لەکۆتایی هەمان ساڵدا بەکوژرانی ئەحمەد پاشای فەرماندەی شۆرشەکە (یەكێك بوو لەشۆرە سوارانی عوسمانی کەبەپێی رێورەسمی ئەو سەردەمە لەنێوان (غولامانی) مەمالیکی سوڵتانە عوسمانییەکان هەڵبژێردرابوو) کۆتایی هات. {تشيع وتصوف،ص٣٨٧}.

جگە لە پاشماوەی فیکری فاتمییەکان لەمیسردا، عەلەوییە توندرەوەکان= ئەهلی حەق، لایەنگرانی ئاتەشبەگییەکان، کە بەپێی مینۆرسکی لە بزاڤێکی راگەیاندندا کە لەمیسرەوە بۆ عەرەبستان‌و لەوێشەوە بۆ ئێران گەڕاونەتەوە، بەدوور نازانرێ کەئەوان دینەمۆی ئەو بزووتنەوانە بووبن، وەك چۆن لەمەسەلەی عەلەوییەکان لەقەڵەمڕەوی سوڵتانە عوسمانییەکاندا، رۆڵێکی سەرەکییان هەبووەو راپەڕینی‌شاەقولی= شاوەیس قولی لەئەنەدۆڵ‌و دیاربەکردا بەهیمەتی پێشەوایانی ئەم بنەماڵەیە خۆی گرتووەو پێکەییوە. هەرچەندە سەرچاوەکانی ئەهلی حەق دەربارەی(شاوەیسقولی)و باسکردنی ئەو لەو سەرچاوانەدا، شوێنێکی زۆری گرتووە، بەلام بەهۆی شێواندنێکی تەواوی مەسەلە مێژووییەکانی ئەهلی حەق‌و هەڵەو ناتەواوی بەردەوام تائێستا، لەدوو توێی ئەم مەسەلانەدا، دەست ئەکەین بەباسی رووناکبیریی کەسایەتییەکان‌و پەیوەندیی نێوان پەیڕەوانی شاوەیسقولی لەپاڵ زنجیرەی سەفەوییەکاندا، لەسەر بنەمای سەرچاوە باوەڕپێکراوە مێژووییەکان.

# شائیسماعیلی سەفەوی‌و موشەعشیعییەکانی خوزستان

یەکێك لەبزووتنەوەی عەلەوییە توند ڕەوەکانی ناو ئێران کە شائیسماعیلی سەفەوی نیگەران کردبوو، بزووتنەوەی موشەعشیعییەکانی خوزستان بوو، کەلەم ڕێڕەوەدا، واتە لەکاتی چوون بەرەو بەغداو سەرکوتکردنی یەزیدییەکان‌و شۆڕشی عەلەوییەکانی میسر(٩١٣-٩١٤)ی کۆچی، شائیسماعیل کەوتە سەر خەیاڵی تەفروتووناکردنی ئەمارەتی موشەعشیعییەکان. هەرچەندە بیرو بۆچوونی جیاوازیی مێژوونووسان دەربارەی هۆی هێرشکردنی شائیسماعیل بۆ ناوچەی ژێر دەسەڵاتی موشەعشیعییەکان، لەزاری (ئەحمەد کسروی)یەوە ئەگێڕینەوە، بەلاّم هاوکاتیی شۆڕشی یەزیدییەکان‌و راپەڕینی عەلەوییەکانی میسر، ئەو بۆچوونەمان لا دروست دەکات کە لەگەڵ هەموو ئەو نووسینە جیاوازانەی لەسەر هەڵوێستی شائیسماعیل بەرامبەر بەموشەعشیعییەکان، نابێ ئەوە بەدوور بزانین کە خاڵی هاوبەشی نەتەوەیی مەمالیکەکانی میسر رۆڵی خۆی بینیوە،کە لەگەڵ ئەو هاوبیرو مەزهەبییەوە، لەنێوان موشەعشیعی‌و سەفەوییەکاندا، ئەو خاڵە هاوبەشەی سۆزی نەتەوەیی دەیتوانی هۆیەك بێت بۆ بەرژەوەندیی نێوان موشەعشیعی‌و مەمالیکەکان‌و لەلایەکی‌ترەوە کەسەرکردەکانی بزووتنەوەی موشەعشیعییەکان بەپێچەوانەی عەلەوییە توندڕەوەکانی ترەوە، شێوازی حوکمڕانی خۆیان گۆڕیبوو بۆ میرنشین‌و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی شائیسماعیل بکەوێتە گومانەوە لێیان، چونکە لەگەڵ ئەوەی لەلێکۆڵینەوەکانی کیسرەوی لەمەودوا دێت، شائیسماعیلی

سـەفەوی کاریگـەریی موشەعشـیعییەکانی ئـەهلی حـەقی لەسـەربوو، ئەوانەشی کەپەیڕەوییان ئەکرد بەرامبەر بـەخودی شائیسـماعیل تـاڕادەی پەرستن زیادە ڕەوییان ئـەکرد{النواقص،ص٩٨}و کڕنوشیان بۆ ئەبرد، تەنانـەت ئەگێڕنـەوە کەشـێخ عـەبدولعالی کرکـی ناسـراو بـە توێـژەری دووهـەم کەلـە ساڵی(٩٤٠)ی کۆچیـدا مـردووە، لـەرووی هـاوڕەوتی لەگـەڵ پـەیڕەوە توندڕەوەکـانی شـا ئیسـماعیلدا، بابـەتێکی نووسـیوە لەسـەر ئـەوەی کـە کڕنـوش بـردن بـۆ مـرۆڤ کـارێکی ڕەوایـە، یـەکێك لـەو بیروبۆچوونـە هاوبەشانەی نێوان شائیسماعیل و موشەعشـیعییەکان کـەخوێنی کەسـانی غـەیری شـیعەیان بـە حـەڵاڵ ئـەزانی{تشیع و تصـوف ص٣٩٠}، ئەمـە لایـەکی مەسـەلەکەیە، بـەڵام ئەحمـەدی کیسـرەوی لـەو بارەیـەوەو لەروانگـەی مێژوونووسـەکانی سـەردەمی سـەفەوییەکانەوە، بـەم شـێوەیەی خـوارەوە مەسەلەی هێرشی شائیسماعیل بۆسەر موشەعشیعییەکانی تاوتوێکردووەو لـەتێڕوانینێکی کورتـدا ئامـاژە بـە سـەرەتای بزووتنەکـەوە دەکـات: (پـاش سەید موحەمـەدی موشەعشیع، سەرەی فـەرمانڕەوایی گەیشتە سەر سـەید موحسـینی کـوڕی کەبـەهۆی هـەوڵ و تێکۆشـانی سـەید موحەمـەدو مـەولا عەلییەوە چل و ئەوەندە ساڵ بەئارامی و ئاسوودەیی فەرمانڕەوایی کرد.).

لەم سەردەمەدا لـەئێران و عیراق چەند شۆڕشێك بەرپا بووبوون. جیهان شا ناکۆکی و کێشەی هەبوو لەگەڵ ( پیربوداغ)ی کوڕیداو، لەئەنجامدا ساڵی ٨٦٩ی کۆچـی، جیـهان شـا لەشکرکێشـی کـرد بۆسـەر بـەغداو یەکسـاڵ ئابلۆقەی ئەو شارەیداو کاتێك گفتوگۆی سولح و ئاشتبوونەوە هاتە ئاراوە، پیربوداغ دەروازەی شاری کردەوە بۆ ئەوانەی لەدەرەوەن، جیهان شا کـەزۆر داخـی لـەدڵدابوو لەسەر کوڕە سەرکێشـەکەی، کوڕێکـی تـری خۆی کـەناوی

موحەمەدی بوو ناردە ناوشارو بەدەستی ئەو پیربوداغ لەناو برا، لەساڵی (٨٧٠)ی کۆچیدا. پاشان لەساڵی(٨٧٢)دا، (جیهان شا)یش بەدەستی (حەسەن بەگ)ی بایندەری (ئاق قۆینلو) لەناوچوو وزنجیرەی فەرمانڕەوایی ئێران کەوتە دەست( بایندەری)یەکان، سەردەمی ئەمانیش سەراپا شەڕو شۆڕو لەشکرکێشیبوو ولەماوەی سی و شەش ساڵدا، نۆکەس یەك لەدوای یەك بوون بەپاشاو بەردەوام جەنگ لەئارادابوو.

.. بەڵێ، ئەم شۆڕشانە بارودۆخێکی گونجاو بوو سەید موحسینی موشەعشیع چل و ئەوەندە ساڵ بێقرە فەرمانڕەوایی بکات و لەبەر ئەوەی کە بەرامبەر بەخۆی دوژمنێکی خۆڕاگرینەبوو، توانی ڕۆژ لەڕۆژ زیاتر هێزو توانای موشەعشیعییەکان زیاد بکاو لەسەردەمی ئەودا، هەموو دوورگەکان و خوزستان و بەسرەو دەوروبەرەکەی تا دەوروبەری بەغداو بەهبەهان و کۆهکیلویەو بەندەرەکانی کەنداوی فارس و بەختیاری و لورستان و پشتکوهو بە گوێرەی نووسینی سەید عەلی کرماشانیش کەوتبووە ژێر دەستی ئەوانەوە. پاش سەید موحسین، سەید عەلیکوڕیبوو بەجێنشینی. قازی نوروڵلاو چەند کەسێکیتر، ناوی ئەو و ئەیوبی برایان بەیەکەوە نووسیوە، بەڵام بڕوا ناکرێ کەدووکەس لەیەك شوێندا فەرمانڕەوابن، دەبێ بڵێین کەئەیوب وەزیر یا ڕاوێژکاربووە. لەم کاتەدا، تازە شائیسماعیل ڕاست بووبووەوە... یەکێك لەکارەکانی شائیسماعیل کوشتنی عەلی و ئەیوبی برای و لەناوبردنی سەربەخۆیی موشەعشیعییەکان بوو، بەڵام دەربارەی چۆنیەتی ئەو لەناوبردنە، قسەی جۆراوجۆر کراوە. قازی نوروڵلا دەڵێ: هەندێ پیاوخراپ وایان لە شائیسماعیل گەیاندبوو کەعەلی و ئەیوبی برای، ڕێبازی( مەولا عەلی) مامیان گرتووەبەرو، هەروەك ئەو قسەی بێجێ و

بێسەروبەر ئەکەن، ئەوە بوو لەکاتی هێرشی شائیسماعیل بۆسەر بەغدا، بەفیتی میر حاجی محەمەدو شێخ محەمەد رەعناشی کەکوڕی مامۆستای کوڕەکانی سەید محەمەد بوون، لەوێ داگیرکردنی حوێزە دای لەسەری، سەید عەلی لەبەر دڵنیابوون لەشیعەیەتی خۆی بێباکانە بەپەلە چوو بۆلای شاو گوێڕایەڵی خۆی راگەیاند، بەڵام شائیسماعیل چونکە لە راڕابوونی ئەوان دڵنیا بوو فەرمانی کوشتنی هەردوو براو گەورەکانی تری موشەعشیعییەکانی دەرکرد.

نووسەری کتێبی( تکملة الاخبار)یش، شتێکی نزیك لەمەی نووسیوەو دەڵێ: کاتێك شائیسماعیل لەشکرکێشی کرد بۆ سەرخوزستان، عەلی و ئەیوب نامەیان نووسی بۆی و کەئێمە(شیعە)ین و ئەوەی کەپیاوخراپەکان دەربارەی ئێمە باسیانکردووە، لەدرۆ زیاتر هیچی‌تر نییە. شائیسماعیل ئەم قسەیەی ئەوانی پەسەندکردو گەڕایەوەو دیاری بۆ ناردن، بەڵام پاشتر عەلی و ئەیوب لەشاری شوش کەسەید موحسین ئاوەدانی کردبوەوەو شوورەیەکی کێشابوو بەدەوریدا، نیشتەجێبوون، فەرمانڕەوای شوشتەر، کەلەئێرانییەکان بوو، هەردووکیان بەناوی میوانی و راوکردنەوە بانگ کردن و کوشتنی.

لە (تذکرة شوشتر)یشدا دەڵێت: عەلی و ئەیوب بەناوی ساداتو هاومەزهەبییەوە لەهێرش کردنی شائیسماعیل سەفەویدا بۆ سەر بەغدا، بەشداربوون، بەڵام شا گرتنی و کوشتنی. پاشان کەشائیسماعیل هێرشی کردەسەر (حوێزە)سەید (فەیاض)کوڕەکەی تری سەید محسن کەوتە شەڕەوەو لەگەڵیداو لەگەڵ هەموو سوپاکەیدا کوژرا.

بەڵام هەموو ئەمانە ڕاست نین، ئەوەی ڕاستەو جێی باوەڕپێکردنە، نووسینەکەی نووسەری کتێبی (حبیب السیر)ە کەخۆی هاوسەردەم بووە لەگەڵ شائیسماعیلداوچی کاروکرداری ڕۆژانەی شائیسماعیل بووە، هەمووی بەدوورو درێژی تۆمارکردووە. بەگوێرەی نووسینی دانەری ئەم کتێبە لەساڵی(٩١٤)ی کۆچیدا، شائیسماعیل هێرشی کردە سەر عیراقی عەرەبو شاری بەغدای گرت. پاش ئەوە چونکە هەندێ قسەی بیستبوو دەربارەی ئایینی موشەعشیعییەکان، کەگوایا ئەوان سەید فەیاز (کەوەك دەڵێن نازناوی سەید عەلی بووە)وەك خوائەپەرستن، ڕووی کردە حوێزە بۆ لەناوبردنیان. سەید فەیاز لەمە ئاگادار بوو، سوپای خۆی ڕێکخستو هەردوولەشکر لە دەرەوەی حوێزە بەیەکگەیشتن، شەڕێکی زۆر سەختیان کرد، بەقسەی ئەسکەندەر بەگی تورکمان:

| | |
|---|---|
| زخون مشعشع وران ساده دشت | توگفتی زمین و زمان لاله گشت |
| زبس خون دران سر زمین کله بست | فلك تا کمرگاه درخون نشست |
| زبس کشته بروی هم او فتاد | دران بادیه بسته شدراه باد |

واتە: خوێنی موشەعشیعییەکان لەو بیابانە ڕووتەدا ئەوەندە ڕژابوو دەتگوت زەوی هەمووی گوڵاڵە سوورەیە، ئەوەندە خوێن ڕژابوو فەلەك تاپشتێنەی لەخوێندا نوقم بووبوو ئەوەندە لاشەی کوژراو کەوتبوون بەسەریەکدا لەو بیابانەدا (با) ڕێگای لێگیرابوو. میرخواند دەڵێ: موشەعشیعییەکان ئازایەتی و پاڵەوانەتییەکی لەرادە بەدەریان نواند، لەخۆر هەڵهاتنەوە تاخۆر ئاوابوون، ئاگری شەڕ کڵپەی ئەهات، خۆیان ڕاگرت، بەڵام پاش ئەوە سوپای شا بەجارێ بەشمشێری ڕووتەوە هێرشیان کردە سەریان و لەوهێرشە چاوەڕوان نەکراوەدا فەیازو گەلێك لەمیرەکانی موشەعشەع کوژران، پاش کەمێك عەرەبەکان شوێنەکەیان جێهێشتو

پەرش و بڵاوبوونەوەو پەرێشان بوون. دوای ئەم سەرکەوتنە، شاگەیشتە حوێزەو پاشماوەی موشەعشیعییەکانی کوشت، یەکێکی لە قزڵباشەکان کرد بەفەرمانڕەوای ئەوێ و خۆی و لەشکرەکەی بەرەو( دزفول) کەوتنەڕێ.

{بەڵام وەك لەپێشەوە باسمان کرد، ئەم قسانە هەمووی لەلایەن مێژوونووسەکانەوە هەڵبەستراون، لەمەڕ هۆی هێرشەکەی شائیسماعیل بۆسەر موشەعشیعییەکانی خوزستان و ئەو راپەڕینانەی‌تر کەهاوکات بەرپا بوون و لە پیلانی نهێنی مەمالیکە عەرەبەکانی میسر لەگەڵ موشەعشیعییەکاندا بێئاگابوون، یان خۆیان لێکەڕ کردبوو و، دانانی ئەمیرێکی قزڵباش بۆ فەرمانڕەوایی حوێزە، بەڵگەیەکی روون و ئاشکرایە}.

قازی نوروڵڵای شوشتەری دەڵێ: سەید موحسین و کوڕەکانی لەسەر دەستی باپیری ئەو (میر نوروڵڵای مەرعەشی) کەمەلایەکی بەناوبانگ بووە لەشوشتەردا، پەشیمان بوونەتەوە لەتوندڕەوی خۆیان... بەڵام کەسانی‌تر پێچەوانەی ئەمە قسەیان کردووە. وەك لەپێشەوە گوتمان، مەلاو ئاخوندە شیعەکان، بەهۆی شیعە گەرییەوە چاویان پۆشیبوو لەهەندێ بۆچوونی موشەعشیعییەکان و ئەیانویست لێیان نزیك ببنەوە، موشەعشیعییەکانیش دڵنەوایی ئەوانیان ئەکردو چییان بویستایە درێغی‌یان لێنەئەکردن و دووریش نییە، هەندێك لەبیرو بۆچوونەکانی خۆیان لەوان شاردبێتەوەو هەر ئەمەشە بووەتە هۆی ئەوەی میر نوروڵڵا کەسانی‌تر بڵاویان کردبێتەوە کەئەوان تۆبەیان کردووەو لەبیرو بۆچوونەکانی خۆیان پاشگەزبوونەتەوە.

لەشوێنێکی تردا، کیسرەوی لەمیانەی دانانی بەبرەودان بەرەوتی میانڕەویی، لەنێو موشەعشیعییەکانی خوزستاندا، لەژێر ناونیشانی سەید موبارەك ئایینی موشەعشیعییەکان ئەخاتە لاوە، دەڵێ: ... وەك سەید عەلی

خانی کوڕی خەلەف نووسیویەتی: یەکەم کە لەو توندڕەوییە دوورکەوتەوە سەید موتەلیبی باپیری ئەوبووە کەلەسەرەتای تەمەنیدا لە ڕێبازی باوك و براکانی دوورکەوتووەتەوە، بەڵام لەترسی براو ئامۆزاکانی، نەیوێراوە قسە بکات و بێزاریی خۆی دەرنەئەبڕی، تا ئەو کاتەی (موبارەك)ی کوڕی فەرمانڕەوایی کەوتە دەست، ئەنجا بەهۆی ئەوەوە دەستیکرد بەهەوڵ دان بۆ بنبڕکردنی ئەو توندڕەوییانە.

مەولا موتەلیب پیاوێکی زاناو زانست دۆست بوو، بەرادەیەك، مەولانا کەمالودین محەمەد کوڕی حەسەن ئەستەرئابادی، لێکدانەوەی (فصول خواجە نصیر)ی بەناوی ئەوەوە نووسیوە. ئیتر شتێکی سەیر نییە کەخۆی لەتوندڕەویی بنەماڵەکەی دوور گرتبێ و موبارەکی کوڕیشی بەوپێڕەوەدا بردبێ. وەك نووسراوە، موبارەك چەند کەسێکی لەزانایانی شیعە کە (شێخ عەبدولەتیفی جامعی) یەکێك بوو لەوان، بانگ کردووە بۆ حوێزە، بەیارمەتی ئەوان رەگو ریشەی توندڕەوی هەڵکێشاو لەبری ئەو رێبازی ساکاری میانەڕەویی شیعەی لەناو موشەعشیعییەکاندا سەقامگیر کرد. (٩٩٩-١٠٢٥کۆچی){تاریخ پانصد ساله خوزستان، ص٤٠-٤٥-٦٢}.

هەر لەساڵی ١٠٢٥ی کۆچیدا، هاوپەیمانی موشەعشیعییەکان لەگەڵ عەلەوییەکانی ئەهلی حەقدا پەیدابوو ویەکێتیی نێوان موشەعشیعی و نوربەخشی، سەفەوی، ئەهلی حەق، لەم کاتەدا، لەگەڵ سەرهەڵدان و دەرکەوتنی ئاتاش بەگ= خان ئاتەش و پڕوپاگەندەیەی لایەنگرانی ئەو لەکوردستانی باکوورو ئازەربایجان و لوڕستان و کرماشان و شوێنەکانیتردا، هاتەبوون و ئەو موشەعشیعییانەی کەلەسەر رێبازی کۆنی خۆیان مابوونەوە. وەك قەرەقوینلوەکان وهیتر . خۆیان دایە پەنای ئەم

بنەماڵەیەو بزوتنەوە موشەعشەیعییەکان لەباری نەتەوەییەوە، نیشانەی عەرەبایەتی خۆیان لەدەست داو رواڵەتی راستیی ڕێبازی (پەردیوەری)، بەم بزووتنەوەیە بەدەست هێناو لەگەڵ پاراستنی هەموو بیرو بۆچوونەکانی خۆیان کە دەربارەی سەرکردە سەرەتاییەکانی بزووتنەوەکەیان، بوویان ڕێـڕەوی مێژوویی خۆیان لەخۆزستانەوە گواستەوە بۆ لوڕستان و کوردستان و ئازەربایجان و لەم قەڵەمڕەوەدا درێژەیان پێدا. پێش ئەوەی بچینە سەرباسی بنج وبنەوانی پەیوەندیی بنەماڵەی ئاتەش بەگ بە شائیسماعیل و سەفەوییەکانەوە، باسی پەیوەندیی نەقشبەندییەکانی ئەکەین لەگەڵ شائیسماعیلی سەفەوی و سەفەوییەکان و هاوکارییەکانی ئەم دوو گروپە کە بەدرێژایی مێژووی بزووتنەوەی عەلەوییە توندرەوەکان، بەچەند شێوازی جیاواز تەبایی و ناکۆکی و هاورەوتی و کارلێکردنی لەبواری سیاسی و کۆمەڵایەتی، تاسەردەمی ئەمڕۆ چ لەناوچەی خوراسان و چ لە کوردستاندا بوویان.

# بزووتنەوەی شائیسماعیلی سەفەوی و نەقشبەندییەکان

گروپی سۆفییە نەقشبەندییەکان یەکێکن لەو گروپە سۆفییانە کەرۆڵێکی گەورەو فراوانیان گێڕاوە بەدرێژایی مێژووی سۆفیزم لەئیسلامدا، پێش سەرهەڵدانی خواجە بەهائودینی نەقشبەندی بوخارایی، بەزنجیرەی خواجەکان ناوبانگیان دەرکردبوو، پاشان بەگروپی نەقشبەندی ناویان بلاوبووەوە. ناودارو گەورەکانی ئەم زنجیرەیە وەك خواجە عوبەیدوللای ئەحرارو ... هتد، لەسەردەمی تەیموورییەکاندا، لەوپەڕی توانا و دەسترۆیشتندا بوون، بەجۆرێك پاشا تەیمورییەکان ئاوزەنگی یان ئەگرت بۆ شێخە نەقشبەندییەکان و خۆیان بەپێ دەڕۆیشتن بەرێگادا. بەشی زۆری شێخانی ئەم زنجیرەیە پەیڕەویی رێبازی ئیمام ئەبو حەنیفە بوون و بەخواپەرستی ناویان دەرکردبوو و بەگوێرەی رێنماییەکانی شەرع کاریان دەکردو دەیکەن.

رێبازی نەقشبەندی زیاد لەهەر گروپێکی تر، داب و نەریتی رەسەنی رەفتارو هەڵسوکەوتی ئیرانییانەیان پاراستبوو، بەگوێرەی ئەوەی کەجێی زێدو شوێنی گەشەکردنی ئەو رێبازە خۆراسان و بوخاراو هەرات بوو. زنجیرەی خواجەکانی رێبازی نەقشبەندی دەگاتەوە سەر ئیمام جەعفەری سادق کەبیرەوەری و رەفتارە موعجیزە ئاساکانی و ناوی موبارەکی بووە بەدەسپێکی (تذکرة الاولیا)ی شێخ (عەتاری نەیشاپووری)و لەرێگەی ئیمامی سادقەوە بنەچەی خۆیان ئەگەیەننەوە سەر بنەماڵەی حەزرەتی عەلی

کوڕی ئەبی تالیب، لەدایکیشیانەوە زنجیرەی بنەچەکەیان دەگەیەننەوە سەریارانی قاسمی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەبوبەکرو پەیوەندیی نەقشبەندیو شیعە لەسەر ئەم بنەمایە پەیدابووە. پێشەوایانو پەیڕەوانی ئەو زنجیرەیە بەتەواوی خاڵە هاوبەشەکانیانو پەیوەندیی ڕێبازی ئایینیو نەتەوەییو بیروباوەڕیان لەگەڵ فەرمانڕەوایانی وڵاتی ئەوبەری ڕووباردا هەیانبوو، لەهێرشی شا ئیسماعیلی سەفەویدا بۆ ئەو ناوچەیە، زەمینەیان خۆشکرد بۆ سەرکەوتنو دەسەڵات پەیداکردنی قزڵباش، بڵاوبوونەوەی سەفەوییەت لە هەراتدا بەهۆی نەقشبەندییەکانو هاوڕەوتی موفتیو شێخی نەقشبەندییەکانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ شا ئیسماعیلدا هاتە ئاراوە، لەکتێبی (عالم ئارای سەفەوی)دا، بەجوانی باسی داگیرکردنی ناوچەی تورکستان، بەدەستی شائیسماعیلی سەفەوی کراوە {عالم آرای صفوی، باهتمام یدالله شکری، تهران، ١٣٥٠،ص٤٤٦}، لەم نەبەردەدا نوێنەرانو لەشکرەکەی شائیسماعیل بەهۆی پشتگیری کردنیانەوە لەلایەن خواجە عەبدورەحیمی نەقشبەندییەوە کەلەلایەن خەڵكو حکومەتی تورکستانەوە، زۆر ڕێزی لێ‌ئەگیرا، سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. {دین و مذهب در عصر صفوی،ص٢٦}

هەرچەندە ڕێبازی نەقشبەندی لەکوردستاندا، بەهۆی مەولاناخالیدی شارەزوری کەلەنەوەی شێخ میکائیلی دەودانی راوێژکارو یاوەری سوڵتان سەید ئیسحاقی بەرزنجی لەناوجەرگەی عەلەوییەکانەوە پەیدابوو، بەڵام ڕێبازی عەلەوییە سەفەوییەکان لەناوچەی خۆراسان، لەژێر چاودێریو سایەی نەقشبەندییەکاندا گەورەبوو، بەجۆرێك کەئەم دوو زنجیرەی نەقشبەندیو عەلەوییە، ناوبەناو بەبزووتنەوەیەکی ئایینی گەڕانەوەیەکیان هەبووە لەعورفو عادەتەوە بۆ ڕێبازی شەرعی، یابەپێچەوانەوە لەرەوتی

مێژوویی ئەم دوو ئایین و تەریقەتەدا، کەبەڕاشکاوی لەدووتوێی شیکارییەکانی ئەم کتێبەدا بەرچاو دەکەون، هەروەکو چۆن لەتورکیای سەردەمی عوسمانییەکانیشدا، پاش ئەوەی (حروفی)یەکان سەرکوتکران، ئەوەی لێیان بەجێما، بەنەقشبەندییەکانیان سپارد(قیام ونهضت علویان زاگرس،ج۱،ص۱۳۵)، و لەسەردەمی ئێستاشدا، نەقشبەندییەکانی سەرگەڵو لەکوردستاندا ئایینی پەردیوەرییان لەژێر ناوی (حەقە)، لەنێو خۆیاندا زیندوو کردەوە کەلەم کتێبەدا باسی لێوە دەکەین.یەکێك لەو نیشانە راست و بەڵگەدارانەی پەیوەست و پەیوەندیی فیکری نێوان نەقشبەندییەکانی هەرات و سەفەوییەکان ئەوەیە کەگەورەکانی نەقشەبەندی هەرات ڕێوڕەسمی لاواندنەوەی حوسێنیان لەهەرات دامەزراندو لەکۆبوونەوەی ئێرانی و عەرەبە شیعە مەزهەبەکاندا برەویان پێدا. تا ئەوەی مەلا محەمەد حسێنی واعیزی کاشفی کەیەکێکە لەگەورە پیاوانی نەقشبەندییەکانی خۆراسان، یەکەمین و گرنگترین کتێبی بۆ کۆڕی ماتەمینی حوسێن داناو ناوی ( روضة الشهداء فی مقاتل اهل البیت)ی لێنا.

ئەم کتێبە لەسەر داواکاری( مرشد الدولە عبداللە) لەنەوەی تەیمورو پاشای هەرات و لەکەسە نزیکەکانی سوڵتان حسێنی بایقرا ( ۸۷۳-۹۱۱) بوو. ئەم کتێبە باسی مێژووی ئەو کارەساتانە دەکات کە بەسەر پێغەمبەرەکاندا هاتووەو بەدرێژی باسی ئیمامەکانی شیعە دەکات، بەتایبەتی باسی کارەساتی کەربەلا کەبەپەخشانی فارسی نووسراوەو بەدەقی عەرەبی و شیعر رازاوەتەوە، گوایە فزولی بەغدادیی کە لە۹٦۳ی کۆچیدا مردووە، ئەو کتێبەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی و ناوی ناوە (حدیقة السعداء). (روضة الشهدا) دابەشکراوە بەسەر دە بەشدا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. باسی گرفتاری و مەینەتی هەندێك لەپێغەمبەران دەکات، هەر لەئادەمەوە تا ئەگاتە نوح و ئیبراهیم و یەعقوب و زەکەریاو یەحیا.

٢. ستەم و ئازاردانی پێغەمبەر لەلایەن قورەیشییەکانەوەو باسی شەهیدبوونی حەمزەو جەعفەری تەییار دەکات.

٣. باسی کۆچکردنی پێغەمبەر(د.خ) دەکات.

٤. باسی فاتیمەی زەهرا( س.خ)لەپەیدابوونیەوە تا مردنی دەکات.

٥. باسی ژیانی حەزرەتی عەلی( س. خ)لەپەیدابوونیەوە تا شەهیدبوونی دەکات.

٦. باسی رەوشتە بەرزەکانی ئیمام حەسەن( س.خ)و هەندێ مێژووی ژیانی، لەپەیدابوونیەوە تا شەهیدبوونی دەکات.

٧. دەربارەی گەورەیی ئیمام حوسەین و باسی لەدایکبوونی دۆخی ئەو پاش کۆچ کردنی براکەی دەکات.

٨. باسی شەهیدبوونی موسلیمی کوڕی عەقیل و دوو منالەکەی دەکات.

٩. باسی گەیشتنی ئیمام حوسەین بۆ کەربەلاو شەڕکردنی لەگەڵ دوژمنان و شەهیدبوونی خۆی و منداڵ و خزمان و یاوەرەکانی دەکات.

١٠. باسی ئەوکارەساتانەی هاتووە بەسەر خانەوادەی حسێندا پاش کارەساتی کەربەلاو سزای بکوژانی ئەو دەکات.

١١. کۆتایی کتێبەکە دەربارەی ژیانی کوڕەکانی ئیمام حسێن و ئیمام حەسەن و زنجیرەی رەچەڵەکی هەندێ لەوان دەکات.

لەگەڵ برەودان بەم کتێبە کۆڕی لاواندنەوە جێی داستانە کۆنەکانی پاڵەوانان و هەزارو یەك شەوەی گرتەوە، لەناوچە شیعە نشینەکانی ولاتە ئیسلامیەکانداو لەهەراتیش شوێنی ئەڵقەی زیکری سۆفییەکانی گرتەوە.

یەکێ لەو هۆ گرنگانەی زەمینەی رەخساند بۆ سەرکەوتنی راپەڕینی شائیسماعیلی سەفەوی لەناوچەی خۆراسان و سەرانسەری ئێراندا، ئەو کتێبەی مەلا محەمەد حوسێنی کاشفی نەقشبەندی بوو.

# هەڵسوکەوتی شا ئیسماعیل لەگەڵ هاوپەیمانانی عەلەوی زنجیرەی سەفەوییەکاندا

## شامحەمەد بەگ و شا ئیسماعیل

وەك لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، ئەو تاقمە عەلەوییانەی ئەهلی حەق کەلەگەڵ سیاسەتە ناوخۆییەکانی شا ئیسماعیلدا ناکۆك بوون، تێکۆشانی نهێنی خۆیان سەر لەنوێ دەستپێکردەوەو هەندێك لەوان کەجیابوونەوە سەربەخۆیی تازە بەدەست هێنراوی سەفەوییەکانیان بەباش نەئەزانیو لەرەوتی تێکۆشانی ئەو بنەماڵەیەدا، رەگو ریشەی قووڵیان داکوتابوو، لەگەڵ شائیسماعیلدا مانەوەو بەردەوام بوون لەسەر تێکۆشانو هاوکاریکردنی. عەلەوییە سەرکوتکراوەکان، لەپێناوی بیروباوەڕی خۆیانداو بۆ پاراستنی خۆیان لەئەگەری تەنگ پێهەڵچنینیانو لەترسی لەناوچوونی تەواوو نەمانی سەربەستی، لەبەجێهێنانی ریو رەسمی ئایینی خۆیاندا، دایانە پاڵ ئەو خانەدانو بنەماڵانەی هاوپەیمانی سەفەوییەکان بوون. ئەمانە بەمەبەستی راگەیاندنی ئایینی عەلەویو برەودان بەبیری شۆڕشگێڕانەی شا ئیسماعیل، بەشی زۆری چالاکییەکانی خۆیان بردە دەرەوەی سنووری ئێرانو لەولاتی میسرو شامو عەرەبستانو سوریاو بەتایبەتی ولاتی عوسمانی جێگیریان کرد، هەرچەندە لەناو ئێرانیشدا بنکەی فراوانیان هەبوو، لەهەمەدانو کرماشانو لوڕستانو کوردستانو ئازەربایجانو خۆراساندا، بەلام هێمای سەرکەوتنیان لەو گەڕانو ژیانی کۆچەریو خێڵەکییە ناجێگیرەی خۆیاندا دەبینییەوە کەهەم دووربوون لەدەستی شا ئیسماعیل کەبەهێرش بردن بۆ سەر موشەعشیعییەکان، سەرەتای سەرکوتکردنی عەلەوییە توندڕەوەکانی دەست پێکردبوو و

پەردەی لەسەر مەبەستە نهێنییەکانی خۆی لادابوو هەم ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ بنەماڵەی سەفەوییەکاندا بەستبوویان بیپارێزن و هەم دەستیشیان والآبێ لەبڵاوکردنەوەو برەودان بەنهێنییەکانی ڕێبازی ئایینی پەردیوەریدا، بەئارەزووەکانی خۆیان بکەن. گەورەو ناودارانی ئەم بزووتنەوە هاوڕەوتانە لە عەلەوییە توندڕەوەکان و لەسەیدە بە ڕەگەز کوردەکان بوون کەلەم سەردەمەدا لایەنگرانێکی زۆریان هەبوو لەهندو ناوچەی ئەودیو ڕووبارو ئەنادۆڵ و ئێرانی ناوەندو قەڵەمڕەوی عەلەوییەکان لەخوزستان (ئەروەند روود)، تا ئەگاتە ماکۆ و کەنارەکانی رووباری ئاراس بوو. ئەوانەش کەرایان کردبوو لەموشەعشیعییەکانیش هەر بەو جۆرەی کەباسمان کرد، هاتنە ناو ئەو بزووتنەوەو بوون بەهاوپەیمان.

پیاوە گەورەکانی خانەدانی ناوبراو، لەلایەن باوباپیری شائیسماعیلەوە، وەك حەیدەرو جونەیدو خودی شائیسماعیلەوە مۆڵەت پێدراوو ڕێز لێگیراوبوون و لەوڵاتی عەلەوییەکاندا، سەربەخۆ جێنشینییان کردووەو لەسەر ڕێو ڕەسمی عەلەوییەکانی قزڵباش ئەم سەیدانە بە(دەدە) ناوبراون.

ئەم پیاوە گەورانە بەهۆی هاتوچۆکردن و پەیوەندییان لەگەڵ کۆمەڵگە جیاکانی عەلەوییەکاندا لەتورکستان (ڕۆم)، عەرەبستان (میسرو..)و هەروەها کوردستان و لوڕستان کەشوێنی سەرهەڵدانی یەکەمجاری ئەوان بوو، بەزۆری شارەزاییان هەبوو لەزمانی تورکی و عەرەبی و کوردیدا، بەشی زۆری پەیڕەوانی ئەم بنەماڵەیە، لەسەردەمی سەفەوی و پاش ئەوانیش، لەرۆملو (قەرەقۆیونلوەکان)و (تەکلو)کان بوون، ئەم (تەکلو)یانە خۆیان بەکورد دائەنێن و چوونەتە بەرگی قزڵباشەکانەوە، وەك چۆن دکتۆر مەسعودی کەیهان لەجوگرافیای سیاسیدا نووسیویەتی : تەکلۆ. تەکلە لەو خێڵە کوردانەی دەوروبەری (ئەردەبیل)ن کەبەزمانی تورکی قسە دەکەن و

لـەپێنج سـەد مـاڵ پێکـهاتوون و هاوینـان دەچنـە (سـەبەلان)و زسـتانان لە(مـەغان) بەسـەر دەبەن. پاشتر ئەم تەکلوییانە لەکوردستان و دەینـەوەرو هەمـەدان دەسـەلاتێکی ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتریـان بەدەسـت هێنـا، تەنانـەت هەندێ خێڵیان لەسەردەمەکانی دواییدا، لەگەڵ دەرکەوتنی ناکۆکی لـەنێوان سـەفەوی و عەلەوییـەکاندا، ڕوویـان لەعەلەوییـەکان وەرگـێڕاو چوونـە پـاڵ حکومـەتی سـەفەوییەکان، وەك لەمـەودوا باسـی ئەکـەین، تـاقمێك لەمانـە کەپـەیوەندییان کـرد بەشـا ئیسـماعیلی دووهەمـەوە، لەسـەردەمی ئـەودا.. کاری سەرکوتکردنی ڕاپەڕیوە عەلەوییەکانیان پێسپێردرا.

یەکـەمین کـەس لـەناودارەکانی عەلەوییـە توندڕەوەکـان کەلـەدەقی نووسـراوو سـەرزاردا بـە(شـاوەیس قـولی) بەناوبانگـەو بـەگوێرەی ئـەو سەرچاوانەی باسیان کردووە لەکوردستاندا لـەدایك بووە. کتێبە مێژووییە باوەڕپێکراوەکانی سەفەوییەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە باسی ڕاپـەڕینی ئەویان کردووە.

# راپەڕینی شاوەیسقولی دژی خەلیفەی عوسمانی

باسی دەرچوونی بابا شاقولی (شاوەیسقولی) تکەئیلیو هاتنی سوفییەکانی رۆمو شوێنانیتر بۆ دەرباری شا، گەیشتنی سۆفییەکانی رۆم ئیلیو منتەشائیلیو تکەئیلی بۆ دەرباری پەناگەی سوڵتانەکان، یەکێك بوو لەرووداوەکانی ئەو ساڵە پڕ لەبەختەوەرییە، کاتێك کەسوپای جیهان گەرد لەگەشتی خۆراسان گەڕایەوە، لەدەوروبەری رەیو شەهریار گەیشتنە بەردەم شاو شەرەفی پێماچکردنیان بەدەست هێنا. لەم نووسینەدا بەکورتی ئەوەی لەساڵی ٩٠٥دا تۆمار کراوە ئەوەیە کەبابا شاقولی (شاوەیسقولی) کوڕی بابا حەسەنی خەلیفەی تەکلو پاش مردنی باوکی لەویلایەتی گەرمیان کە بەتکەئیلی ناوی دەرکردووە لەسەر کورسی رێنمایی کردنی سۆفییەکانی ئەو ناوچەیە بەگوێرەی راسپاردەی باوکی جێگیربوو و بەردەوام کاری (کەرامات)و لەکاری ئاسایی تێپەڕیوی لێوە دەرئەکەوت. ئەمانەتی (زەنگو ئەبڵەق)ی لەگەڵ دەدە موحەمەد دا بۆ دەرباری شا بەهەڵە ناردبوو. دەدە موحەمەد لە(دار السلطنة)ی تەبرێز، شەرەفی ماچکردنی پێی شای بەدەست هێنا. بەشێوەیەك بوو بەیەکێك لەباسەکانی ئەو ساڵە. کاتێك دەنگوباسی جیهانگیریی خەسرەوی وڵاتی گرتەوە بڵاوبوونەوەی رێبازی پیرۆزی ئیمامییەکان، لەهەموو دەوروبەرو کونو قوژبنی جیهاندا دەنگی دایەوە، بابا شاقولی تەکلو، لەویلایەتی منتەشائیلیو تکەئیلی لەگەڵ تاقمێك لەسوفییەکانی ئەو ویلایەتەدا، بڕیاری یاوەریی بەستو رووی کردە دەرگای شا سکەندەر لەبەرئەوەی فەرمانڕەوای ویلایەت کەوابەستەی سوڵتان بایەزیدی قەیسەری رۆم بوو، هەرکە بەمەی زانی لەگەڵ هەزار سواردا، بۆ رێگرتن لەسۆفییە پایەبەرزەکان کەوتەڕێ، بابا شاقولی

بەگەیشتنی ئەم هەواڵە، مـوژدەی سـەرکەوتنی دا بەسـووفییەکان و پشـتبە شانسی لەبن نەهاتووی شەهریار پێشـوازییان لـە رۆمییەکان کـرد. ئەودوو لەشـکرە کەبەیـەك گەیشـتن، ئاگری شەڕو کوشـتار کڵپـەی سـەند. ئەوانـەی خـاوەنی هیدایـەت و چـاودێریی خـوا بـوون زاڵ بـوون بەسـەر گومڕاکـاندا. فەرمانڕەوای ناوچەکە لەگەڵ سەرکردەکانی لەشکری رۆمدابوون بەخۆراکی شمشێرە تیژەکان و کۆمەڵێکی زۆریشیان بەدیل گیران و هـەموویان لەسـەر فـەرمانی بابا شـاقولی کوژران و ماڵ و کەلوپـەلێکی زۆریـش لەئەسـپ و چـەك بەتالان کەوتە دەست. کاتێك هـەواڵی سـەرکەوتنی بابا گەیشـتە پـەیڕەوانی ئـەو بنەماڵەیـە لەدەوروبـەری ویلایەتەکـەدا، لاوانـی چـەکدار روویـان کـردە سوپای باباو پاش گردبوونـەوەی سوپای ئـەو ناوچەیـە، بـەجارێ چوون بۆ پێشوازیی سۆفییە سەرکەوتووەکان و هـەر لەوێشدا بابـا شـاە قـولی لەگـەڵ خەلیفـەی خێڵـەکانی وەك سـوفییانی خەلیفـەی رۆملـۆو حەسـەن خەلیفـەو کەسانی‌تر، روویـان کـردە مـەیدانی جـەنگ، دوای ئـەوەی هـەردوولا لەیـەك نزیکبوونـەوە، ئاگری کوشتار کڵپـەی سـەندو سۆفییە دڵسـۆزو بـەوەفاکان، وەك شـێری برسـی کەوتنـە جـۆش و خـرۆش و هـاواری خۆڕاگرتـن و گیـان بەخشـین بـەرزبووەوەو بـەهێزی دەوڵـەتی هەمیشـە پایـەدارەوە سـەرکەوتن بەسـەر بەرامبەرەکـەیاندا، شـنەبای سـەرکەوتن ئـالآی بابـا شـاە قـولی شەکاندەوە، (قەرەگۆز) پاشا توانای بـەرەنگاری نـەماو بڕیـاری راکردنـی داو رووی کردە شیوی بـەرەو دوا گەڕانـەوە، سـۆفییەکان بـەدوای ئـەودا تـاوی ئەسـپەکانیان داو بەشمشـێری تیـژو نـێزەی گیـان دەرهێنـەر، کۆمـەڵێکی زۆریـان لێ کوشـتن و کەلوپـەلێکی زۆریـان بەدەسـتهێناو بـەرەو سـیواس کەوتنەڕێ. کاتێك ئەم هەواڵە گەیشت بە بایەزید قەیسەری سوڵتانی ئێڵدرم، ئـەویش خـادم عـەلی پاشـای سـەرەك وەزیرانـی، لەگـەڵ پـەنجا هـەزار سـوار ئامادە کـرد، بۆ جـەنگ لەگەڵ بابا شاە قولی و سۆفییە ناودارەکانی رەوانـە

کرد. پاشای ناوبراو لەگەڵ تاقمی عوسمانییەکاندا کەلەشەوی تاریکدا، بەنووکی نێزە پەڵەی مانگیان لائەبرد، کەوتنە جووڵە. بابا شاەقولی کە بەم هەواڵەی دوژمنانی زانی، دەستی کرد بەرێکخستنی لەشکرەکەی، هەزار غولامی حەبەشی هەبوو، لەپێشی لەشکرەکەوە رایگرتن، لەولاشەوە عەلی پاشا، چەپ و راستی لەشکرەکەی خۆی رێکخست و هاتە مەیدانەوە، لەشکری رۆم بەیەکجار هێرشیان کردە سەر پیادەکان کە لەپێش لەشکری داگیرکەرانەوە بوون ، نزیکەی پێنج سەد کەسیان لێکوشتن و ئەوانیتر چوونە ناو جەرگەی لەشکرەکەوە، بابا شاقولی کەئەمەی بینی، هەردوو باڵی راست و چەپی سوپاکەی لەناوەراستی لەشکرەکەدا کۆکردەوەو بەهەماهەنگیی یەکتر، هێرشیان کردە سەر ئەو لەشکرە بێئەندازەیە، ئەو دلێرە کلاو ئاسنینانە، بەیەکجار هێرشیان کردە سەر جەرگەی لەشکری دوژمن:

زدند آن دليران آهن كلاه　　　　بەيكبار برمكب گاه سپاه

شنەبای مەرحەمەتی ئیلاهی هەڵیکردو خادم عەلی پاشا پێی نەما لەسەری بوەستێ و لەترسی هێرشی دلێرانەی سۆفییەکان، رووی کردە شیوی هەڵهاتن، سوارەی رۆمی لەترسی ئەو راپەڕینە رێگای راکردنیان گرتەبەر:

سواران رومی از آن رستخيز　　　　گرفتند درپيش راهی گريز

تەکلۆییەکان دوایان کەوتن، بەهێزی شمشێری تیژو نێزەی گیان کێش خادم عەلی پاشاو کۆمەڵێك لە رومییەکانیان کوشت و باباشاە قولی لەمەیدانی نەبەرد دا شەربەتی شەهیدبوونی نۆشی و بەگوێرەی راسپاردەی خۆی، سۆفییەکان (دەدە موحەمەد)ی خەلیفەی رۆملو کەپیاوێکی دلێرو ئازابوو، کردیانە گەورەی خۆیان و لەوێوە رۆیشتن بۆ ئەرزەنجان. لەو دەوروبەرەدا بیستیان کە نزیکەی (٥٠٠) بازرگان لەگەڵ کەلوپەلێکی زۆردا لەتەورێزەوە

بەرەو ڕۆم دەڕۆن. هەندێك کەسی نەفام کەلەدوای خەڵکەکەوە وەك سەردەستەی سەرباز دانرابوون، هێزی تەماعیان کەوتە جووڵەو، وەك بەڵای ناگەهان دایان بەسەر ئەو بازرگانە داماوانەداو هەموویان کوشتن:

کسی جان، سلامت ازایشان نبرد بغیر ازاجل هیچکس جان نبرد

و هەرچییان هەبوو تالانیان کردو ناردیان بۆ بارەگای بەرزی دەربار. لەکاتێکدا کەخاقانی ساحیبقەران لەویلایەتی خۆراسان گەڕابووەوەو لەدەوروبەری ڕەیو شەهریار دابەزیبوون، سۆفییەکانی تەکلۆو ڕملو پەیوەست بوون بەو کاروانە بەرزەوەو بەماچکردنی خاکی بەر پێی پاشا سەرفرازبوون. کاتێك پاشا ئەو هەواڵەی پێگەیشت کە نەفامەکانی ئەو خێڵە تاقمێ بازرگانیان کوشتووەو کەلوپەلەکانیان تالان کردوون، ئاگری تووڕەیی پاشا گڕی گرت و فەرمانی دا سەرۆکی ئەو دەستە سەربازانە، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا، بەسزای خۆیان بگەیەنرێن و ئەوانی تریشی دابەشکرد بەسەر چەند شوێنێکی ترداو سۆفییەکانی خەلیفەی ڕوملو بۆ خۆراسان و هەندێ شوێنی تر ڕەوانەکران لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیاندا. {جهانگشای خاقان (تاریخ شاه اسماعیل)، مقدمەو پیوستها، د.مضطر،ص٤٠٥-٤٠٨}

لەسەر بنەمای ئەوەی کەلەسەرەوە ڕابورد، کەسایەتی (شاه وەیسقولی) و ئەنجامی ڕاپەڕینەکەی ڕوون بووەوە. لێرەدا بەپێویستی دەزانم چەند خاڵێك ڕوون بکەمەوە. یەکەم: مێژوونووسە سەفەوییەکان بەهەموو ئەو خێڵ و تیرانەی کەلەگەڵ قزلباشەکاندا بوون و ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو لەدەسەڵات گرتنە دەستی سەفەوییەکاندا، دەگوت سۆفی، لەبەرئەوەی کەئەوانە لەپەیڕەوانی شێخ سەفی باپیرەی سەفەوییەکان بوون، نەك بەو مانایەی کەئێستا بەکاردەهێنرێ. چونکە پەیڕەوەو گیان لەسەر دەستەکانی

سەفەوی و عەلەوییەکان لەرێ‌و رەسمی تەریقەتدا (دەروێش) بوون نەك سۆفی. دووهەم، ناوهێنانی دەدە (سەیید) موحەممەد، یا وەك عەلەوییەکان دەڵێن، ئاتەش بەگی (شامحەمەد بەگ) کەبەبەڵگەوە باسی پلەو پایەی ئەو دەکەین، لەسەردەمی سەفەوییەکانداو لەسەر بنەمای دەقەکانی نەخشەی بنەماڵە (شجرە) لەسەییدە پەسەند کراوو پێگەدارەکان دادەنرێ، لەم باسەدا بەروملو ناوبراوە، کەبەگوێرەی لێکۆڵینەوەکان، (روملو) هەر ئەو (قەرەقویونلو)یانەن کەخاوەنی مێژووی قزڵباش نووسیویەتی: (بەشەکانی روملو، ئەم کۆمەڵە لەدەوروبەری شارۆچکەی توقات‌و سیواس‌و ئەماسیەو فاراواو مەشهەدو چەند شوێنێکی تر لەولاتی رۆمدان، هەندێکیان کۆچەری‌و هەندێکیان نیشتەجێن. جیهان شا میری بڕوا پێکراوییان بوو، پاش کوشتنی سوڵتان ئەبو سەعید، چووە دەرباری حوسێن شا و پلەی میری بەدەستهێنا. میرێکی تری ئەوان ناوی حاجی حوسێن بەگە کە پێش حەسەن عەلی کوڕی جیهان شاه فەرمانڕەوای قەزوین بوو{تاریخ قزلباش، میرهاشم محدث،ص١١}، دەزانین سادات‌و شێخەکانی هەر زنجیرەیەك یا خێڵ‌و ناوچەیەك بەناوی ئەو زنجیرەو خێڵ‌و ناوچەوە ناوبانگ دەردەکەن، هەرچەندە پەیوەندیی خزمایەتی لەپشتەوەیان بەهۆی ژنخوازییەوە یان وابەستەی سستمی کۆمەلایەتی ئەوان نین.

سێهەم: ئەوەی کەمینۆرسکی لەنووسینەکانی خۆیدا دەربارەی بنەماڵەی ئاتەش بەگی باسیکردووە، ئەوەیە کەچەند گرووپێك لەوانە لەهەمەدان‌و تاران‌و وەرامین‌و مازندەران (کلاردەشت)و تەنانەت لەخۆراسانیشدا دەژین، دەوترێ کەیەکێك لەبراکانی خان ئاتەش کۆچیکردووە بۆ خۆراسان، {مقالات مینورسکی،ص٥٥} ئەوە روون دەکاتەوەو ئەم

یاداشتەی مینۆرسکی لەو بەڵگەیەی کتێبی (جیهان گوشای خاقان) خستوویەتە ڕوو، پشتگیری دەکات کەئەو بەڵگەیە نووسینەکەی مینۆرسکی ڕاستدەکاتەوە، بەم ڕوونکردنەوەیە کەدەڵێ: عەلەوییەکان (ئاتەش بەگی، موشەعشیعی، نور بەخشی و سەفەوی کەهەرچوار زنجیرەی عەلەوییەکانی لەئەهلی حەق و پەردیوەرییەکاندا کۆکردبوەوە، لەسەر زەوی خۆراساندا پێشینەیەکیان هەبوو و دوور نییە برای خان ئاتەش بەم هۆیەوە کۆچی کردبێ بۆ خۆراسان، چونکە هەروەك لەدەقی نووسینەکەی (مێژووی جیهان گوشای خاقان)ەوە دەرئەکەوێ، شا ئیسماعیل توربەتی خۆراسان و هەندێ ناوچەی سەر بەوی داوە بەشا محەمەد بەگ و تاقمەکەی و لەگەڵ دەستوپێوەندەکەیدا ڕەوانەی ئەو ناوچەیە کراوە، کە مینۆرسکی لەدرێژەی نووسینەکەیدا دەڵێ: لەناوچە تورك زمانەکان لەئازەربایجاندا، چەند لقێك لەگروپی ئەهلی حەق لەنێوان تەورێزو مەراغەدا (لەدەوروبەری کێوی سەهەند) داو لەماکۆ (ناوچەی قەرەقۆیونلو) چەند تاقمێك لەو گروپە تەنانەت لەباکووری ئاراکس لەقەرەباغدا دەژین، {مقالات مینورسکی،ص٥٥}کە ناوچەی خۆراسان و ئەفغانستان تا دەگاتە هیند، کەلەمەودوا باسی دەکەین،سەربە قەڵەمڕەوی ئەم بنەماڵەیە بوون، ئەم پەیوەندییە هەروەها تا ئەم چەند سەدەی دواییە بەردەوام بوو. هەر وەکو ئیعتیماد وسەڵتەنە دەنووسێ. بەگوێرەی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم بارەوە کراوە، باپیرانی ئەم بنەماڵەی ئاتەش بەگییە لەگوندی (ئاتەش بیکندی) کەیەکێکە لەدێهاتەکانی (هەشترود) نیشتەجێبوون، لەسەردەمی پاشایەتی (نادر شا)دا چوونەتە خۆراسان و پاش کوژرانی ئەو سوڵتانە قارەمانە، چوونەتە قوچان و لەوێوە ڕێگای کرماشانیان گرتەبەرو ئیتر خەیاڵی ئازەربایجانیان لەسەردا نەبوو،

ئـەم بنەماڵـەی ئاتـەش بەگییـە بەسـەییدەکانی خۆیـان دەڵێـن (دەدە).
{اعتماد السطنة، چاوپێکەوتنێك لەگەڵ محەمەد کلاردەشتی، دەسنووس،ل١٦}

چـوارەم: بـەهۆی ئـەوەی ئـەم بنەماڵـە هاوپـەیمانو بەتوانایـەی سەفەوییەکانیش، پاش ئەوەی تووشـی چەندین گرفـتو شـەهیدبوونو ئـازاری یـەك لـەدوای یـەك هـاتن، دوا بـەدوای سـەرکوتکردنی موشەعشیعییەکان بەبیانووی لـەرێ لادان، شمشێر بەدەستەکانی تـەکلوو هـەوادارەکانیان کەخـەریکی پڕوپاگـەندە کـردن بـوون، بـۆ بڵاوکردنـەوەی دەسەڵاتی شائیسماعیل، بەفەرمانی شا ئیسماعیل خۆی، بڵاوەیان پێکرا هـێزە سـەربازییەکانیانی دابەشـکرا بەسـەر میرەکـانیتەرداو سـەرکردە رۆحییەکانیشـیان لەگـەڵ پێبەخشـینی زەویو زارو دوورخسـتنەوەیەکی بەرێزەوە بۆ خۆراسان، لـەنێوەندی دەسەڵات دوورخرانەوە. لەگەڵ ئـەوەدا کەئەمانە، هیچ کات خـەیاڵی دەسەڵات گرتنەدەستیان لەسەرا نـەبوو، بەڵام شا ئیسماعیل ترسی هەبوو لەتوانای سیاسیو ڕێبازی ئایینی ئەوانو بەم شێوەیە لەلایەن شا ئیسماعیلەوە، پـەیمانی نێوانیـان خرایـە ژێـر پـێ، هەرچەندە ئەوان هـەر لەسـەر پـەیمانی خۆیـان بـەردەوام بـوونو توانییـان بنـەمای فکـری عەلەوییـە تونـدڕەوە پێشـووەکان وەك (پـەردیواری، نووربەخشی، سەفەوی، موشەعشـیعی) لـەناوخۆیاندا گەشـەی پـێ بـدەنو بیپارێزن.

پێویستە ئەوە روون بکەینەوە کەبەگوێرەی ئەوەی کەلەبەڵگەو نەخشەی بنەماڵـەکاندا هـاتووە، شـا موحەممـەد بـەگ (دەدە موحەممـەد) لەسـەییدە هاشمییەکانـەو لەگـەڵ دەروێـش موحەممـەد خـانی روملـوی فـەرمانڕەوای گیلانو نەیشاپور کەدوایین کاری ئەو باڵیۆزی ئێران بووە، لەساڵی نۆهـەمی حوکمی شا عەباسی یەکەمی سەفەویدا، یەك کەس نینو شا موحەممەد بەگ

پێش دەروێـش موحەممـەد خـان ژیـاوە. دەدە موحەممـەد پلـەو پایەیـەکی مەعنەوی باشی هەبووەو لە ئەنجامدا کە گەڕاوەتـەوە بۆ بناری شاخەکانی زاگرۆس کۆچی دوایی کردووەو لە بورجی قوربان تەرمەکەی لە هەمەدان بەخاك سپێردراوەو ئارامگاکەی بووە بەزیارەتگەی پەیڕەوان و موریدەکان و ئەوانەی سۆزیان هەیە بۆ بنەماڵەی عەلەوییەکان.

لێرەدا ئەوەی لە کتێبی (جیهان گوشای خاقان) دا هاتووە، دەربارەی شا موحەممەد بەگ لە گەشتەکەیدا بۆ (مەککە) باس دەکەین و بەراوردی دەکەین لەگەڵ گەشتەکەی شێخ عیسای بەرزنجی، وەك لە کتێبەکاندا هاتووە بۆ مەککە. نووسەری کتێبی جیهان گوشای خاقان دەڵێ: دەدە موحەممەد یەکێ بوو لە دەروێشە پاك باوەڕەکانی حەسەن خەلیفەی تەکلو کەلەناو تیکەئیلی و رۆم ئیلییەکاندا نیشتەجێبوو، حەسەن خەلیفە یەکێك بوو لە دڵسۆزو موریدە پاك باوەڕەکانی ئەم بنەماڵەی خاوەن کەرامەت و ویلایەتەی سەفەوییەکان. جارێك بەخزمەتی حەزرەتی سوڵتان جونەیدو دووجار بەخزمەتی سوڵتان حەیدەر گەیشتووە، سوڵتان حەیدەر لەگەڵ چل کەسی تر لە سۆفییەکان دەینێرێ، بۆ (چلەخانە)و هەریەك لەوانە نانێك و یەك گۆزە ئاویان دەداتێ، تا لەماوەی چل رۆژەکەدا، بەو بڕە ئاوو یەك نانە قەناعەت بکەن، پاش تێپەڕبوونی چل رۆژەکە لەچلەخانەکە دێنە دەرەوە، هاوڕێکانی حەسەن خەلیفە هەموویان نان و ئاوەکەی خۆیان تەواو کردبوو، تەنیا ئەو نەبێ کەنان و ئاوەکەی چۆن بردبوو هەراو هێنابوویەوە، پیری گەورە مۆڵەتی پێداو رەوانەی ناوچەی تکەئیلی کردو لەبارەی دەرکەوتن و دەرچوونی حەزرەتی شا ئیسماعیلی یەکەم بەڵێنی پێدابوو، کاتێ گەیشتە ئێلی ناوبراو کەشف و کەرامەتێکی زۆری لێدەرکەوت، چەند جار پەیڕەوانی خۆی لەکاتی

دەرکەوتنی شا ئیسماعیل ئاگادار دەکردەوە، کاتێ کۆچی کرد، کوڕەکەی خۆی بابا شاە قوڵی کەئەویش خاوەنی کەشف و کەرامەت بوو، لەجێی خۆی داینا (ئەبڵەقی) یەکەی بەو سپارد؛ "ساڵی ١٩٠٧ پیری ئێمە لەتەورێز، لەسەر تەختی پاشایەتی ئێران دادەنیشێت و ئەمە ئەمانەتی ئەوە، لەگەڵ سەلامی مندا پێی بگەیەنە. بابا شاە قولی هەر چاوەڕوانی ئەوکاتەی دەکرد تا لەساڵی ١٩٠٥دا، دەدە موحەممەد کەموریدی خەلیفە بوو خەیاڵی زیارەتی مەککەی پیرۆزی کردو لەبابا شاە قوڵی داوای مۆڵەتی کرد. بابا شاە قوڵی گوتی بڕۆ مۆڵەت دراوی، کە لەزیارەتی مەککە لێ ئەبیتەوەو دەچی بۆ زیارەتکردنی ئارامگە پیرۆزەکان و لەوێوە ئەکەویتەرێ بەرەو (دار السلطنة)ی تەورێز. ڕۆژی یەکەم کەئەگەیتە ئەوێ، بەخزمەت نەوەی چاکان و پاکان ئەگەی. پارەی بەناوی خۆیەوە لێداوەو وتاریشی بەناوەوە خوێنراوەتەوەو لەگۆڕەپانی تەورێزدا، ئەو شەهریارە دەبینی خەریکی گۆچان بازییە. دەچیتە لای و سەلامی منی پێئەگەیەنی ئەم ئەبڵەقشی دەدەیتێ کەدەیدورێ بەتاجەکەی سەریەوە {مەبەست لەئەبڵەق پەڕێکی ڕەش و سپییە کەدروشمی ئەهلی حەق و نوور بەخشییەکان بووەو شا ئیسماعیل داویەتی لەقەراغی تاجەکەی".

پاشان دەدە موحەممەد ئەمانەتەکەی لێوەرگرت و بەرەو مەککە کەوتەرێ. دوای گەیشتنی بۆ مەککەو سووڕانەوە بەدەوری کەعبەدا سەردانی مەدینەی کرد، ڕووی کردە بەغدا، لەنێوان شاری باتسکێنە (؟) و (دار السلام)دا لەکاروانەکە جیا ئەبێتەوەو خەو ئەیباتەوە {لەو شوێنەدا کەبەقسەی دەفتەرەکە شێخ عیسا خەوی لێکەوتووە}. کاتێك چاوی کردەوە دەبینی کاروان ڕۆیشتووەو هیچ ئاسەوارێکی دیار نییە، کەوتە ڕێگاو ماوەی سێ

ڕۆژ بە دەروێشی، بیابانی بڕی تا پەکی کەوت و توانای ڕێکردنی نەما، کەوت و زمانی هاتە دەرەوەو لەتینویەتیدا خەریك بوو بمرێ. کاتێك خۆر گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان، بینی کەئەسپ سوارێکی عەرەبی گەنج لەسەر سەری ڕاوەستاوەو پێی دەڵێ: دەروێش هەستە سەرپێ لەئاوەدانییەوە نزیکی، دەروێشەکە بە هێما پێیگوت توانای ڕۆیشتنم نەماوە، کوڕە گەنجەکە دەستی گرت، هەر لەگەڵ دەستی بەردەستی کوڕەکە کەوت هەستی کرد کەتوانای بۆ گەڕاوەتەوە، هەڵسایە سەرپێ و لەپشتیەوە سواربوو، کەگەیشتە سەر تەپۆلکەکە بینی تا چاو بڕ ئەکا بیابانەکە پڕە لەسەوزی و گوڵ و لالەو، کەپرو چادری زەربافت و ئاوریشمی تیا هەڵدراوە، بەکوڕە عەرەبەکەی وت نەلەبیابانی مەککەو نەلەبیابانی نەجەفدا، کەس شوێنی وا خۆشی نەدیوە، ئەمە کوێیەو خاوەنی ئەم بارەگاو شوێنە خۆشە کێیە؟ کوڕە گەنجە عەرەبەکە پێیگوت، پاشتر دەزانی. دەروێشەکە لەپێشیەوە دەرۆیشت تا گەیشتە بارەگایەك، گومەزەکەی لەجوانیدا وەك مانگ و خۆر وابوو، کەچووە ژوورەوە، شوێنێکی هاتە پێش چاو کەتا ئێستا شتی وای نەدیبوو، کورسی ئاڵتوونی لەتەنیشت یەکەوە ڕیزکراون و یەکێك لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، ڕووپۆشێکی دابوو بەسەر دەم وچاویدا. دەدە موحەممەد دەستی نا بەسینگیەوەو سەلامی لێکردو پاڕایەوە. پاشان ڕوو داپۆشراوەکە وەڵامی دایەوەو پێی گوت، دەروێش دانیشە، دوایی فەرمانی دا خواردنێکیان بۆ هێنا، لەهەموو ژیانی خۆیدا شتی وا خۆشی نەخواردبوو، ئاوێکی ساردیشیان بۆ هێنا کەهیچ کات ئاوی وا سازگاری نەخواردبووەوە. کە لە خواردن بووەوە، بینی کۆمەڵێك کەس هاتن منداڵێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، تەمەنی نزیکەی چواردە ساڵ ئەبوو،

موو سوور، دەم‌و چاو سپی، چاوی جوان، تاجێکی سووری لەسەربوو کەهاتە ژوورەوە سەلامی کردو راوەستا، جوانە روو داپۆشراوەکە گوتی ئەی ئیسماعیل کاتی ئەوە هاتووە خۆت دەرخەیت، ئەویش وتی فەرمان لەئێوەی بەرێزەوەیە. پاشان گوتی وەرە پێشەوە، ئەویش چووە بەردەمی. ئەو گەورەیە پشتێنەی گرت‌و سێ جار لەزەوی بەرزی کردەوەو داینایەوە سەر زەوی‌و بەدەستی پیرۆزی خۆی پشتێنەکەی بەست‌و تاجەکەی لەسەر لابردو جارێکی تر خستیەوە سەری‌و خەنجەرێکی کوردی کە بە پشتیەوە بوو {ئەم سومبولە مایەی تێڕامانە} هەڵیگرت‌و لەبەردەم دەروێشەکەدا (دەدە موحەممەد) دایناو گوتی؛ ئەمە هەڵگرە بەکەڵکت دێت. شمشێرێکیشی لەیەکێك لەیاوەرەکانی وەرگرت‌و بەدەستی پیرۆزی خۆی بەستی بەپشتییەوەو فەرمووی بڕۆ مۆڵەتت دراوە. فاتیحەیان خوێندو سپاردی بەو دوو سێ کەسەی کەهێنابوویان. کاتێك کوڕە گەنجەیان برد، ئیشارەی کرد بۆ گەنجە عەرەبەکە گوتی، دەروێش بگەیەنە کاروانەکەو ئەویش دەروێشی هێنایە دەرێ‌و پێی گوت ئەوە کاروانەکەیە کەلێی دابڕابووی کاتێك دەدە موحەممەد کاروانەکەی بینی، گوتی: ئەی گەنج سوێندت ئەدەم بەخودا، پێم بڵێ ئەو زاتە گەورەیە کێ‌بوو، ئەو کوڕە جوانە چ کەسێك بوو، گوتی ئەی دەروێش هێشتا نەتزانیوە ئەو زاتە گەورەیە حەزرەتی مەهدی بوو.. ئیتر دەروێشەکە بەناچاری خۆی گەیاند بەکاروانەکەو پاشماوەی ئەم بابەتەی دەدە موحەممەدی رۆلمۆ لەناو رووداوەکانی ساڵی ۹۰۷ی کۆچیدا باس دەکرێ. {تاریخ جهانگشای خاقان، لاپەڕەکانی ۴۳ا تا ۴٤ ب، عالم آرای شاه اسماعیل، ص٤١-٤٢، دەسنووس زانکۆی کەمبریج Add 200 لاپەڕەکانی ٤٢ب و۴۳ا}

لەباسی رووداوەکانی ساڵی ۹۰۷ی کۆچیدا، سەردەمی چوونە سەر تەختی شا ئیسماعیل لەتەورێز، بەم شێوەیە هاتووە : ( لەو کاتەدا دەدە

موحەممەد کەپێش دوو ساڵ لەرۆم ئیلی‌یەوە چوو بوو بۆ زیارەتی مەککەو مەدینەو لەبیابانی مەککەدا چاوی بەو حەزرەتە کەوتبوو، لەگۆڕەپانی ساحیب ئابادی تەورێزدا بەخزمەت ئەو زاتە پیرۆزە گەیشتبوو و شەرەفی ماچکردنی پێی ئەوی دەسکەوتبوو.

ئەم باسە لەنێو ڕووداوەکانی ساڵی ۹۰۵دا، ئەوکاتە کەشا ویستبووی لەلاهیجان بچێتە دەرەوە نووسراوە، دەدە موحەممەد عەرزی کرد خەنجەرە کوردییەکەی کەلەو شوێنە پیرۆزەدا بەوی سپاردبوو بەئاگاداری بابا حەسەنی تەکیە ئیلی گەیاندوویەتیە دەستی شازادەی بەئاوات گەیشتوو و خەڵاتی سەرفرازیشی وەرگرتووەو بەگوێرەی داوای دەدە موحەممەد ئەسپێك‌و بڕێك پارەی نەخت‌و هەندێ شتی تریشی وەرگرتووەو مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدراوە.{جهانگشاه خاقان (تاریخ شاه اسماعیل)،ص١٥٤-١٥٥}

١. لەیەکچوونی داستانی چاوپێکەوتنی مەعنەوی شا موحەممەد بەگ (دەدە موحەممەد) لەگەڵ شا ئیسماعیلدا لەگەشتی مەککەدا، لەگەڵ داستانی چاوپێکەوتنی سەیید عیسای بەرزنجی (شێخ عیسا) لەگەڵ سوڵتان ئیسحاقدا لە گەشتی مەککەو موژدەی سەرهەڵدان‌و دەرکەوتنی ئەو گەورەیە لەکاتی دیاریکراودا، بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کەدەنگ‌وباسی هیچ لەو دوانە لەدەستنووس‌و بڵاوکراوەکانی ئەهلی حەقدا نەکراوە، وەك چۆن هی گەورەکان باسکراوە، نەکراوە. بەڵام لە(تذکره اعلی) کەئیڤانۆف لەهیند بەچاپی گەیاندووە، بەشێکی تایبەتە بەباسی سەردەمی موحەممەد بەگ‌و دەربارەی شێخ عیسای بەرزنجیش، وەك پێشەکی لەبەرهەمە چاپکراوەکانی ئێراندا ئاماژەی پێکراوە (؟!!) یەکێکی تر لەنیشانە لێکچووەکان: ا- خەنجەرە کوردییەکە. ب- هاوڕێکانی شا موحەممەد بەگ کەسێ کەس

بوون. ج- پشت بەستنەکەی شا ئیسماعیل لەلایەن حەزرەتی مەهدییەوەو سپاردنی خەنجەرە کوردییەکە بەشا موحەممەد بەگ کەبیدا بەشا ئیسماعیل {تشکیل دولت صفوی و...، د.محمد کریم یوسف جمالی،ص ١٢٣-١٢٥}{ جهانگشتی خاقان، د.مضطر،ص٨٥} لەکاتێکدا کەدەچێتە سەر تەختی پاشایەتی، ئەمانە هەمووی گوزارش لەرووی لەیەکچوون و نیشانە هێماییەکانی ئەم دوو رووداوە ئایینییە دەکەن.

بەم شێوەیە بنەماڵەی ئاتەش بەگی، مۆژدەدەری ویلایەتی سەفەوییەکان و پاشایەتی شا ئیسماعیل سەفەوی بوون و گەلێك بنەماڵەی عەلەوییە توندڕەوەکانیان لەمەترسی سەرکوتکردن و لەناوبردن رزگارکرد، بەهۆی نزیکردنەوەیان لەخۆیان و بوون بەخاڵێکی سەرەکی بۆ یەکگرتن و هاوپەیمانی (عەلەوی = ئەهلی حەق و سەفەوی و موشەعشیعی و نووربەخشییەکان) کە لەشوێنی خۆیدا ئاماژە بەکارو چالاکی ئەوان لەهیندو ئەفغانستان دەکەین ئەوەش دەبێ بڵێین کەلە(تذکرە اعلی)دا، شا ئیسماعیل وەك عەلی قەلەندەر ناوبراوە.{تذکرە اعلی،ص١٩٥} ئێستاش بۆ سەلماندنی زیاتری ئەوەی لەسەرەوە رابوردو چالاکیی ئەو عەلەوییە گەورانەی ئەهلی هەق کەنێرراوو نوێنەری سەفەوییە راپەڕیوەکان بوون بۆ وڵاتی عوسمانی، دەست دەکەین بەباسکردنی راپەڕینی شاوەیسقولی لەزارو نووسینی مێژوونووسە تورکەکانەوە.

پرۆفیسۆر ئیسماعیل حەققی لەمێژووی عوسمانیدا دەنووسێت: لەسەر خاکی ئەنادۆڵدا، واتە سەر زەوی عوسمانییەکان، ژمارەیەکی زۆر لەعەلەوییەکان دەژیان و لەزووشەوە پەیوەندییەکی پتەو هەبوو لەنێوان ئەوان و سۆفییەکانی ئەردەبیلدا. شائیسماعیل (٩٠٧ - ٩٣٠کۆچی) بەمەبەستی راکێشانی تەواوی عەلەوییەکانی ئەنادۆل بەلای خۆیدا،

تاقمێکی نارد بۆ ئەو ناوچەیە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی خۆیان. بەم شێوەیە بەنهێنی یاخیبوونێکی بەربڵاوی دژی عوسمانییەکان بەرپاکرد. هەندێ هۆیتریش هەبوون کەئاسانکارییان دەکرد بۆ چالاکییەکانی شا ئیسماعیل، لەوانە لاوازیی فەرمانڕەوایی عوسمانی، کەمتەرخەمیو بێفیکری وەزیرەکان، ناکۆکیی نێوان شازادەکانو رکابەرایەتیکردنی یەکتر، بۆ گەیشتن بەسەر کورسی دەسەڵات، بەتایبەتی کاتێك کە ئەم ناکۆکییەی نێوان شازادە عوسمانییەکان گەیشتە ئەوپەڕی. شا ئیسماعیل بۆ سوود وەرگرتن لەو بارودۆخە، نور عەلی خەلیفەی خەڵکی ئەنادۆلی نارد بۆ ئەوێ. کەنورعەلی گەیشتە ناوچەی قویلوحەسار، سێچوار هەزار نەفەر لەعەلەوییەکانی ئەو ناوچەیە لەدەوری کۆبوونەوەو ئەویش هێزە سێ چوارهەزار نەفەرییەکەی عوسمانی کەفایەق بەگ (پاشا) فەرمانڕەوایان بوو، شکاندو شاری (تۆقات)ی خستە ژێر دەستی خۆیەوەو بەناوی شائیسماعیل خوتبەی خوێندەوەو هێزێکی زۆری لەخێڵەکانی ئەفشارو ئەرساق، قەرە بانلو، تورگوتلو، بۆزاوقلو، تکەلیو حەمیدالی کۆکردەوەو دەستی کرد بەچالاکی نواندن. یولار. قستی ئەحمەد پاشا کەبەفەرمانی شازادە ئەحمەدی والی (ئەماسیە) هێرشی کردە سەریان ئەویش شکستی هێنا، بەڵام پاش ماوەیەكو دوای ئەوەی کەیاوز سوڵتان سەلیم بوو بەفەرمانڕەوا، کۆتایی بەم بارودۆخە مەترسیدارە هێنا. {تاریخ عثمانی،ج٢،ص٢٥٧-٢٥٨}

شاە قولی بابا تکەلی (خەڵکی تکە)، یاقزڵباشی کەقەرابیق ئۆغڵییان پێدەگوتو عوسمانییەکان بە (..قولی) ناویان دەبرد، کوڕی کابرایەکە ناوی حەسەن خەلیفە بوو یەکێك بوو لە جێنشینەکانی شێخ حەیدەری عەلەوی، باوکی شا ئیسماعیلو خەڵکی گوندی (یالملی) سەر بەناحیەی قورقودایلی

بوو. حەسەن خەلیفە دووجار هاتبووە خزمەتی شێخ حەیدەری باوکی شا ئیسماعیل، ئەویش وەك خەلیفەیەکی خۆی، ناردی بۆ ناوچەی نکەئیلی (ئەنتالیاو دەوروبەری) بوو بەلێپرسراوی راکێشانی خەڵکی ناوچەکە بە لای شێخ حەیدەردا.

حەسەن خەلیفەو شاقولی کوڕی لەئەشکەوتێکدا، لەنزیکی گوندەکەی خۆیاندا کەکەوتووەتە دەروبەری (ئەنتالیا) خەریکی خواپەرستی بوونو ناوبانگیان زۆر بڵاوبووەوە، بەشێوەیەك شۆرەتی خواپەرستی ئەوان کەوتە بەرگوێی سوڵتان بایەزیدو ئەویش هەر ساڵێك شەش حەوت هەزار (ئاقچە)ی بۆ نزاکردن بۆ سوڵتان، بۆی ئەنارد. بەم شێوەیە، پاش ئەوەی قەرابیق بەهەوڵوکۆششی خۆی لایەنگرانێکی زۆری لەخۆی کۆکردەوە. شا ئیسماعیل بەهۆی ئەوەوە (شاقولی) لەئەنادوڵی رۆژئاوا، رۆم ئیلی، لەناوچەی سرز، سولانیك، زاگارای، یەنیجە، فیلیبە، سوفیەو ناوچەکانیتر لەرێگەی خەلیفەکانیەوە خەڵکەکەی بانگ ئەکرد، بۆ ئەوەی بچنە ژێر ئالای ئەوەوەو بەیعەتی پێ بکەن. شاه قولی بەسوودوەرگرتن لەناکۆکیی نێوان شازادەکانو کەمتەرخەمی کاربەدەستە گەورەکانی دەوڵەت، دەستی کرد بەراپەرینو شۆڕش، دە هەزار کەسی لەگەڵدابوو، گەنجینەی شازادەی (قورقود کەلەو کاتەدا لەئەنتالییەوە دەیانبرد بۆ مانیسا تالانیان کردو پاش ئەوەی بڕێکی باش پارەیان کەوتە دەست، بەناوی خەلیفەی شا ئیسماعیلەوە، هێرشی کردە سەر ناوچەکەو قازی ئەنتالیای کوشتو ئینجا هێرشی کردە سەر شارۆچکەکانی قزڵجەکایا (قایا)، ئیستانووس، ئەلمالی، بوردور، کچی بورلیو لەوێش قازیو هەندێ کەسی تری لەخەڵکی ناوچەکە کوشتو گەیشتە دەوروبەری کۆتاهیە. ئامانجی یەکەمی ئەو داگیرکردنو

دەست بەسەراگرتنی ناوچەی قەرامان بوو. قەرەگوزلو ئەحمەد پاشا بەگلەر بەگی ئەنادۆل کرا بەلێپرسراوی سەرکوتکردنی ئەوانە، قەرەگوزلوپاشا کەئەزموونێکی وای نەبوو، هیچ بایەخێکی پێنەدان و بەهێزێکی کەمەوە کەوتەرێ. لەسەرەتادا سەرکەوت بەسەریاندا، بەڵام لەئەنجامدا خۆی شکاو گیرا بەدیل. شاه قولی ئابلۆقەی کۆتاهیەی داو ئەحمەد پاشای لەبەرامبەر قەڵادا کوشت، بەڵام هەربۆی نەکرا قەڵاکە داگیربکا.{٢٣ی موحەرەمی ٩١٧ی کۆچی= ١٥٢٢/٤/٢٢زایینی}

شازادە قورقود فەرمانڕەوای مانیسا، ئەم دەنگوباسەی بەحکومەتی ناوەندی گەیاند، خادم علی پاشای سەرەك وەزیران، شازادە ئەحمەد، فەرمانڕەوای ئاماسیا عوسمانی کوڕی شازادە ئەحمەدو موحەممەدی کوڕی شازادە شاهەنشا= سنجق بەگی بێ شەهر(بەگ شەهر)یان (نیدە)، کران بەلێپرسراوی سەرکوتکردنی ئەوانە. هێزەکانی شاه قولی پاش کوشتنی حەیدەر پاشا، بەگلەر بەگی قەرامان بەرەو باکوور چوونە پێشەوە، ئەو شازادانەی کەدانرابوون بەلێپرسراوی سەرکوتکردنی ئەوانە، لەشوێنێکدا کەپێی دەگوترێ ئاڵتون تاش لە کۆتاهیە، بە ڕێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد پاشادا، لەکێوێکی سەختدا شۆڕشگێڕەکانیان ئابلۆقەدا، شازادە ئەحمەد لەبری ئەوەی رووبەرووی شۆڕشگێڕەکان ببێتەوە، رایگەیاند کە(پاشایەتی بە من سپێردراوە). بەم شێوەیە ئەحمەد پاشا داوای لەچەکدارەکانی یەنی چەری کرد کە لەگەڵیدابوون بەیعەتی پێبکەن و بچنە ژێر سێبەری بەیداخی ئەوەوە، ئەوانیش ئەمەیان رەتکردەوە. لەم سەروبەندەدا، شۆڕشگێڕەکان ڕێگایەکیان دۆزییەوەو خۆیان لەئابلۆقەکە رزگارکرد. عەلی پاشا خێرا دوایان کەوت و شازادە ئەحمەدیش گەڕایەوە شوێنی خۆی. ئەم کەمتەرخەمی و بێسەروبەرییە، بوو بەهۆی نیگەران بوونی چەکدارە یەنی

چەرییەکان. خادم عەلی پاشا (سەرەك وەزیران) لەچیق ئاوا، بەهێزەکانی شاقولی گەیشتن و شەڕ دەستی پێکرد، لەشوێنێکدا بەناوی (گدیك خانی). سوپای عوسمانی بەهۆی ناکۆکیی نێوان خۆیان، دەستیان لەشەڕ کێشایەوەو بڵاوەیان لێکرد. عەلی پاشا هەوڵ و کۆششێکی زۆری کرد کەرێگا لەشکان و بەزینی سوپاکەی بگرێ. لەهەمانکاتدا شاقولی بەتیرێك پێکراو مردو لەنێو قزڵباشەکاندا ئاژاوە پەیدابوو. خادم عەلی پاشا بەبوێری و چاو قایمییەکی تەواوەوە ئاوزەنگی دا لەئەسپەکەی و تاوی دا. بەڵام لەبەر ئەوەی کەلەهێزە سەرەکییەکەی دوورکەوتبووەوە، بەهۆی جەنگاوەرەکانی شاقولی ئابڵۆقەیان داو بەتیرێك پێکراو کوژرا (ربیع الثاني ٩١٧ = ٢ تەمووزی ١٥١١)، هێزی عوسمانییەکان کە لەحاڵەتی سەرکەوتندابوون، بەهۆی نەبوونی فەرماندەوە، نەچوونە پێشەوە،و پاشماوەی هێزەکانی شاقولیش بەرەو ئێران کشانەوە. {دەوڵەتی عوسمانی پاش ئەم بەزمەی شاقولی، ئەو قزڵباشانەی کەلەدەوروبەری ئسپارتاو ئەنتالیە دەسگیرکرابوون، گواستنیەوە بۆ دەوروبەری مودون و کورن لەنزیکی مورە}.

{پاشماوەی سوپاکەی شاقولیش کەبەرەو ئێران گەڕابوونەوە}، لەنزیك ئەرزەنجان تووشی کاروانێك بوون کە پێنج سەد بازرگان لەتەورێزەوە بەرەو ئەنادۆڵ دەرۆیشتن، هێرشیان کردە سەریان و هەموویانیان کوشت، لەبەرئەوەی کە شائیسماعیل بایەخی زۆری ئەدا بەکاری بازرگانی و بازرگانان، هەموو سەرکردەکانی ئەو شۆڕشگێڕانەی کەلایەنگری خۆی بوون، کوشت؟! (٩١٧ی کۆچی = ١٥١١زایینی) {هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل٢٥٨-٢٦٠}

هەروەها لەشوێنێکیتردا نووسیویەتی (... نور خەلیفە کەیەکێك بوو لەخەلیفەکانی شا ئیسماعیل، لەرێگای لایەنگرو موریدەکانیەوە دەستیان کردبوو بەچالاکیی نواندنو، عەلەوییەکانی ناوچەی سیواس، توقات، ئەماسیا، چوروم یان بەناوی شا ئیسماعیلەوە بانگ ئەکرد بۆ یەکگرتنو یەکێتی. هەروەها شاقولی کوڕی حەسەن خەلیفە کەلەعەلەوییەکانی ئەنادۆڵو لەخەلیفەکانی شێخ حەیدەری باوکی شا ئیسماعیل بوو، ئەویش بەناوی شائیسماعیلەوە، لەناوچەی ئەنتالیەو دەروبەری، لەچالاکیدا بوو و بەهۆی لایەنگرەکانیەوە، پەرەی بەچالاکییەکانی دابوو و، گەیاندبوویە ناوچەی رۆم ئیلی (٩١٥ ك ـ ١٥٠٩ز).

شا ئیسماعیل لەو کاتەدا کەبەنهێنی چالاکی ئەکرد، چالاکییەکانی خەلیفە شاقولیش لەساڵی ١٥٠٩ ز، لەناوچەی ئەنتالیا لەرۆژئاوای ئەنادۆڵدا پەرەی سەندبوو. شا ئیسماعیل هەندێ لەپەیڕەوانی خۆی خستبووە ناو گروپو لایەنگرانی هەندێ لەو شازادانەی کە لە ویلایەتەکاندابوونو لەگەڵ ئەو شازادانەدا دەستی دابووە نامە گۆڕینەوە.

کوڕی حەسەن خەلیفە کەلەکتێبە مێژوویەکاندا بەشا قولی ناوبراوە، (نەزانراوە ناوی خۆی چی بووە) خەڵکی گوندی (یالین لی)ی سەر بەناحیەی قورقودئیلی بووە. لەئەشکەوتێکی نزیکی گوندەکەیاندا، خەریکی خواپەرستی بوو، ئەو کەسانەی کەئەهاتن بۆ زیارەتکردنی، بەوەلی ناویان ئەبرد، تەنانەت سوڵتان بایەزیدی دووەمیش پارەی بۆ ئەنارد.

شاقولی کەبەم شێوەیە ناوبانگی بڵاوبووەوە، بۆ جێبەجێکردنی مەبەستی نهێنی خۆی، چاوەڕوانی هەلێکی گونجاو بوو. کاتێك بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت لەلایەن سوڵتان بایەزیدەوە بەرەو رووی

وەزیرەکـان کرایــەوەو خـۆی لەبــەڕێوەبردنی کـار گۆشــەگیرکردو هەڵپــەی کوڕەکانیشــی، بـۆ ئـەوەی بگەنـە پلـەی فـەرمانڕەوایی وای کـرد لەشـاقولی جورئـەت و بوێـری پـەیدا بکـات. شـازادە قورقـود، سـونجق بـەگی ئەنتالیـە ئاگاداربوو لەپیلانەکانی شاقولی و لەگەڵ ئەوەدا کە هێزێکی بەسەرکردایەتی یەکێك لـەپیاوەکانی کـەناوی سوباشـی حەسـەن ئاغا بـوو، توانـی تاقمەکـەی شاقولی پەرتەوازە بکات، بەڵام خودی شاقولی دەرباز بوو. ئەوانەی لەو تاقمە گیران مەرام و پیلانەکانی شاقولییان خستەڕوو.

شاقولی پاش ئەوەی رایکرد، گەیشـتە دەربەندی (یەنیجـە) لەگـەڵ ٤٠٠- ٥٠٠ کـەس لەلایـەنگرانی دەسـتی کـردەوە بەسەرکێشــی کـردن و هــەرچی قـازی و والییــەکی بەردەســت بکەوتایـە ئەیکوشــت، کـاروانی شــازادەکانی قورقـود، کەدەڕۆیشـتن بـۆ (مانیسـا) تـالانی کرد. پــاش ئـەوەی کەسـوپای شـازادە چوونــە پــاڵ شــاقولی کـەنێررابوون بـۆ شـەڕکردن لەگـەڵیدا، هــێزی دەوڵەت تووشی شکست هات و شاقولی ڕووی کردە ئەنتالیاو ئابلۆقەی دا.

ئـەم ڕووداوە کەدەوڵـەتی نـاوەندیی بـەیاخیبوونێکی ناوچـەیی دەزانــی و هیچ گرنگییەکی پێنەدەدا، بڵاوبووەوەو زیـاتر هـانی شاقولیدا بۆ پـەرەدان بەبزووتنەوەکـەی و هەڵیکوتایـە سـەر دەوروبـەری بـوردور، گیجـی بـورلی، ئیسـتانووس، (قوریقودئیلـی) ، ئیسـپارتا، گـوڵ حەسـار، سـەندوقلی و دەسـتیکرد بـەتالان کـردن و کوشـتوبڕی خەڵکەکـە. هەرچـەندە قــەرەگوز ئەحمەدو پاشای والی ئـەنادۆل بۆ ڕووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵیاندا کەوتـەڕێ، بەڵام لەنزیکی کوتاهیە، تووشی شکست بوو و کوژراو، لەلایەن شاقولییەوە هەڵواسرا (٢٣ محرم ٩١٧ ك = ١٥١١/٤/٢٢ز)

شاقولی پاش ئەوە بەرەو (بورسە) پێشڕەویی کرد. حەسەن ئاغا کەبۆ ڕووبەڕووبوونەوە نێردرابوو لەگەڵیدا، شکستی خواردو کوژرا. نیگەرانی لەناو خەڵکی بورسەدا ڕووی لەزیادی کردو شازادە قورقود پەنای بردە بەر قەڵای مانیسا. لەدوای ئەوەی قازی بورسە نامەیەکی نارد بۆ ئەستەنبوڵو تیایدا نووسیبووی کەئەگەر تا دوو ڕۆژیتر، هێزی یارمەتی نەگاتە بورسە، بارودۆخەکە خراپتر ئەبێ، دەوڵەتی ناوەندی کەوتە خۆیو خادم عەلی پاشای سەرەك وەزیران کرا بە بەرپرسی سەرکوتکردنی یاخیبوونەکە.

شاقولی کەلەهاتنی خادم عەلی پاشا لەگەڵ هێزی یەنیچەری ئاگادار بوو، ناچاربوو پاشەکشە بکات، بەڵام سەرەك وەزیران هەر بەدوایەوە بوو. لەشەڕێکا کە لە چپق چاییو یاگوگ چای لەنزیك سیواس ڕوویدا، خادم عەلی پاشای سەرەك وەزیران کوژراو هیچ هەواڵێك دەربارەی شاقولی کە شکستی هێنابوو، دەست نەکەوت (ربیع الاول ٩١٧ = تەمموزی ١٥١١)

شازادە سەلیم والی تەرابزون، لەگەڵ ئەوەدا کەچالاکیو جموجوڵی شائیسماعیل لەئەنادۆڵیو بەزمو بەسەرهاتی شاقوڵیو راپەڕینی ناوبەناوی عەلەوییەکانی بەوردی خستبووە ژێر چاودێرییەوە، لەخراپی بارودۆخەکەو پەیوەندیی هەندێ لەشازادەکان لەگەڵ شا ئیسماعیلدا، و تاج کردنە سەری مورادی کوڕی شازادە ئەحمەدی برازای، بەدەستی خەلیفەی شائیسماعیل ئاگاداری پەیدا کردو چاوەڕوانی دوا ئەنجامی ئەم بارودۆخە بوو، چوونە سەر تەختی پاشایەتی سەلیم، وای کرد کەسوڵتان (شازادە) ئەحمەدو مورادی کوڕی بەبێ بەسەرکردەی راپەڕینی عەلەوییەکانو لەئەنجامدا کارەساتی دەوروبەری توقات، چوروم، سیواس ڕوو لەزیادی بکات.

یاوز سوڵتان سەلیم، پاش ئەوەی لەماوەی دوو ساڵدا، مەترسیی شازادەکانی لەکۆڵ خۆی کردەوە، خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگ لەگەڵ ئێراندا،

عەلەوییە(قزڵباش)کانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان، بەفیتی نهێنی شائیسماعیل لەئەنادۆلی بایان دایەوە بەلای ئەوداو روویان کردە ئەو، کە بەزمی شاقولی نموونەیەك بوو لەوانە. بەم هۆیەوە، راپەڕینی ناوبەناوی عەلەوییەکانی ناو ولاتی عوسمانی، لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ شائیسماعیلدا، دەیتوانی ببێتە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی. بەم شێوەیە، پاش ناردنی فەرمان سونجق بەگو بەگلەربەگەکانی ئەنادۆلی، ئەوان دەستیان کرد بەلێکۆڵینەوەو لێپرسینەوەو ناوی لایەنگرانی شائیسماعیلو ئەو کەسانەی کەمەترسی ئەوەیان لێدەکرا دەست بەراپەڕین بکەن، لەدەفتەرێکدا تۆمارکرا. چل هەزار کەس کەبەزیان بەخشو مەترسیدار دانران، یا کوژران یا خرانە زیندانەوە. پاش ئەوە سوڵتان سەلیم، پیاوێك کەلەلایەن شائیسماعیلەوە نێردرابوو بۆ ئەنادۆلی، بۆئەوەی بەناوی ئەوەوە زانیاری کۆبکاتەو هەم خەڵك بانگ بکا، بۆ ئەوەی بەیعەت بەشائیسماعیل بکەن، لەزیندان ئازادی کردو کاغەزێکی بەفارسی لەژێر ناوی (وەرەو ئەوەی کەدیوتە بیگێڕەرەوە) پیا نارد بۆ شائیسماعیل {تاريخ عثماني، پرفيسور اسماعيل حقى، اوزون چارشلى، ترجمة وهاب ولى، ص٢٩٢-٢٩٤}.

لەنووسینی مێژوونووسە تورکەکاندا، بەراشکاوی بۆچوونی جیاواز دەربارەی دەنگوباسو راپەڕینی شاه وەیسقولی هەیە، لەسەرەتادا دەڵێن: شاه وەیسقولیو باوکی لەلایەن شائیشماعیلەوە نێردراون بۆ ولاتی عوسمانیو لەلایەکی ترەوە دەڵێن، خەڵکی ناوچەکە خۆیەتی؛ لەیەکەم توێژینەوەدا، باس لەمردنەکەی دەکەنو لەتوێژنەوەی دووەمدا دەڵێت: (سەبارەت بەشاقولیش کەشکستی خواردبوو، هەواڵێك بەدەست نەکەوت)و لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو بەناوی خۆیو بەناوی باوکییەوە پێناسە کراوە، بەڵام هەر دەنووسێت کە: (نازانرێت ناوی چی بووە)؟!

راپــەڕینی عەلەویـیــەکان لەناوچــەی ئــەنادۆلی وەنــەبێ هــەر لــەکاتی سـەرهەڵدانی سـەفەوییەکاندا بووبێـت، بـەڵکو هاوکـات لەگـەڵ دەرکـەوتن و سـەرهەڵدانی سـەیید موحەممەد زاهید پـیرخدری شـاهۆیی، هـاوڕێ لەگـەڵ سـەیید باباعـەلی هەمـەدانی و هـاتنی لەناوچەی خۆراسـانەوە بـۆ ناوچـەی رۆژئـاواو بنارەکـانی زاگـرۆس، لەسـەردەمی سـەلجوقییەکانی ئـەنادۆلی و لەسـەردەمی غەیاسـەدین کەیخوسـرەو، دووەمـین راپـەڕینی عەلەوییـەکان لەئـەنادۆڵی نـاوەندی دەوروبـەری سـیواس، ئاماسـیا، توقـوت، چـوروم و مەلاتیە، بەسەرکردایەتی ئیسحاق بابا (کەئەویش لەخۆراسانەوە چووبووە ئــەنادۆڵ) دەسـتی پێکـردو لــەوە بـەدواوەش، رووداوی خوێنینــی وەك راپەڕینی عەلەوییەکان کەبەدرولدینی کوری قازی سیماونا لـەباڵکان و رۆم ئیلی و ئەنادۆڵی رۆژئاوا رووی‌دا. {تاریخ عثمانی،ص٢٩١}

ئــەم رووداوانــە کەبەڵگـەی مێژووییـان هەیــە دەربـارەی پــەیدابوون و راپــەڕینی شـاوەیس قـولی و شــەهیدبوونی و مێـژووی سـەرهەڵدانی شـا موحەممـەد بـەگ لەگێڕانـەوەو داسـتانەکانی (تذکرۀ اعلـی) بـەم شـێوەیە باسکراوە: (محەمەد بەگ بەیارە بەرچاو روونەکانی خۆی بەڵێنی داو گوتی لەسەر کاری خێری خۆتان بەردەوام بن، کە پاش ماوەیەکی تر دێم و ئەگەمە لاتان و، پاش ئەوە رووی کردە وڵاتـی عوسمـانی و لەشـوێنێکدا کەبـەقاپی بەناوبانگـە چـوو بـەدەم جێبـەجێکردنی ئـەو گفتـەوە کەپێشـتر دابـووی بەهەندێ کەس و لەوێ ناوی خۆی گۆڕی و کردی بە (حاجی بەکتاش وەلی) و مـاوەی حــەوت ســاڵ لــەوێ مایــەوەو پــاش ئــەوە گفتـی دا بـەیاران و خزمـەتکارەکانی و پێـی راگـەیاندبوون کەبـەردەوام بـن لەسـەر خزمـەتکردنی خۆیان {تذکرهٔ اعلی،ص١٢٤}.

جارێکی‌تر، لەروونکردنەوەی بەشی حەوتەمدا، هاتنی پاشای جیهان حەسەن خەلیفەو کوڕەکەی بەشێوەیەکی عیرفانی لە (تذکرهٔ اعلی)دا، بەم شێوەیە هاتووە: (ماوەیەك تێپەڕی بەسەر ئەوەدا کەگفتی بەخەڵکی رۆم (عوسمانی) دابوو، ئەوانە چەند کەسێك بوون کەبەدوای پاشای جیهاندا دەگەڕان و لەئاجری (رووبارێکە لەباشووری شاخی سەبەلانەوە ئاوەکەی هەڵدەقوڵی و دوای ئەوەی بەناو شاری تەورێزدا تێدەپەڕێ دەرژێتە دەریاچەی ورمێوە لەم رۆژگارەدا پێی دەڵێن تەلخەرود) چاویان کەوت بەشای جیهان و کەوتن بەسەر دەست و پێیداو گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان و موژدەیان دا بەخەڵکی رۆم و لەناو ئەوانەدا حەسەن ناوێك هەبوو، تاقە کوڕێکی هەبوو ئیتر نەکوڕو نەکچ هیچی نەبوو، پێش چەند رۆژێك ئەو کوڕە مردبوو، باوك و دایك و کەسوکاری کوڕەکە چوونە سەر گۆڕەکەی و هەڵیاندایەوەو لاشەی کوڕەکەیان هێنایە دەرەوە، هەڵیانگرت و بردیانە بەردەم پاشای جیهان لەئاجری، زیارەتیان پێکردو پێیان گوت ئەی شا ئەم مردووەی خۆمان بەزیندوویی لەتۆ دەوێت و لەگەڵ خۆشیاندا هەندێ قوربانییان هێنابوو، شای جیهان لەسەر بەردێك دانیشتبوو..){تذکرهٔ اعلی، ل١٣٢}.

فەرموودەکانی ترو زاراوەی تورکی، لەو سەردەمەدا لەناو (تذکرهٔ اعلی)دا برەویان پەیداکردو کاریگەریی خۆیان هەبوو و بنکەی راپەڕین دەچێتە ئازەربایجان و پاشتر بۆ خۆراسان و سەر لەنوێ بۆ ئازەربایجان و کرماشان دەگەڕێتەوە، هەر وەکو محەمەد بەگ دەربارەی کاتی سەرهەڵدانی ئاتەش بەگ کەخۆی لەرۆمەوە دەچێتە خۆراسان و پاشتر هاتە لوڕستان، دەفەرموێ:... ئاگرێك دێتە جیهانەوەو لەدێی قاسم قولی نیشتەجێ دەبێ و دەبێتە ئاگری جیهان:

آقاچە (دورو)

شەهوار ئەزەلەن ئاماج دووڕوو

چراغ جیهان تا رۆ مەگرۆ

هەرکەس شکبارە و لکش مەبرۆ

مەیۆ ج هەردە

نەخچیر دائیم مەیۆ ج هەردە

ج دەستی ئەوەن زیندەو مردە

ج دون ئاتەش مەخێزو جە پەردە

ئاماج (دووڕوو) (مەبەستی دووڕوو فرامانە جەمسەری ئەو بنەماڵە لەنزیکی کرماشانەوە)

بەیارانی فەرموو وەرن بۆ ئەوێ (گوندی قاسم قولی) و خۆی چوو بۆ ئاجیرو گوتی: رۆژێك دوازدە خەلیفە لەلوڕستانەوە دەهاتنە خزمەت محەمەد بەگ کە گەیشتنە کەنار رووباری ئاجری، چوار کەسیان پێیان گوت: ئەوەی شاراوەیە لێمان بۆمان ئاشکرا بکە، تا بزانین دوارۆژمان چییە. شای جیهان فەرمووی: پاش ئێمە خان ئاتەش دێت، پاش ئەو ئیمام قولی دێتو بەدوای ئەودا سەرخۆشو دوای ئەو سوڵتان مەحمودو پاش ئەو میرزا عەباس بەگو پاش ئەو میرزا نیزامو بەدوای ئەودا ئاغا میرزا دێت کەئێمە ئەوانینو ئەوانیش ئێمەن ( مەڵبەندی ئەم زنجیرە ئاماژە پێکراوە هەر ئەو گوندەی دوروفرامانە کەلەپێشەوە ناومان هێنا). پاشان فەرمووی، شەرت بێ ئەوکاتە لەپێش هەموو میللەتەکانەوە ئاشکرابوونی ئەو پیاوە گەورەیە ئێوە بیزانن و ئەگەر کەسێك باوەڕی بەم وتە نهێنییە نەبوو لەزومرەی بەنیامین چووەتە دەرەوە. {تذکرهٔ اعلی،ص٥٣}.

بەکورتی لەسەردەمی مێژوویی شاوەیس قولی و محەمەد بەگ بەدەرکەوتن و سەرهەڵدانی خان ئاتەش کەشا میهمان بوو گەیشتە لووتکەو قۆناغێکی نوێ لەهاوپەیمانیەتی (ئەهلی حەق، نوور بەخشی: سەفەوی، موشەعشیعی) لەسەر بنەمای یاسای (پەردیوەری) هاتە بوون. لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین کەلەکتێبی (تذکرهٔ اعلی)دا، تەنیا باس لەکەشف و کەرامەتی شاوەیس قولی کراوە، لەناوچەی سیروان و هەورامان و شاهۆدا، لەبەرئەوەی مەبەست و ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە، تاوتوێکردنی مێژوویی و سەبارەت بە باسی کەسایەتییەکان نییەو پێناسەکردنی ئەو جێنشینانە دەهێڵینەوە بۆ نووسینێکی تر.

## سەردەمی شا تەهماسبو نوێبوونی راپەڕینی عەلەوییەکان لەهیند دا.
## (٩٣٠-٩٨٤ کۆچی)

شا ئیسماعیلی سەفەوی (٩٠٧ - ٩٣٠ کۆچی) پاش ئەوەی گەیشتە پلەی پاشایەتیو دەستی گەیشت بەمیرایەتی دنیاییو لەلای لایەنگرانو پەیڕەوانی بنەماڵەکەی خۆی ویلایەتی ئاینیشی بەدەستهێنا، کەوتە هەوڵی دژایەتیکردنی بزووتنەوەی عەلەوییە توندرەوەکان بەناوی قزڵباشو پەیوەندیی بەردەوامیان لەگەڵ زنجیرەی سەفەوییەکان، بەشێوەیەك کەجارێکیتر ئەو بزووتنەوەیە لەشارەزوورو موسڵو گۆرانو پڵنگانو داڵەهۆو دلفانو ئازەربایجانو .. هتد، دەستی کردەوە بەچالاکیی نهێنیو هەرجارەی بەجلوبەرگێکی جیاوازو شێوازی جۆراوجۆرەوە بۆ برەودان بەرێبازە ئاینییەکەیان خۆیان دەخستەروو، وەك چۆن پاش سەرکوتکردنیان، موشەعشیعییەکان خۆیان دانا بەهاوپەیمان لەگەڵ عەلەوییە ئاتەش بەگییەکانداو، کاتێك شا ئیسماعیل دەستی دایە نانەوەی دووبەرەکیی لەنێوان لایەنگرانی شا محەمەد بەگ (ئاتەش بەگییەکانی پاشتر)، ئەگەرچی مەترسیی کۆبوونەوەو هێزی سەربازی ئەوان، لەسەردەوڵەتی ساوای سەفەوییەکان رەویبووەوە، بەڵام بووبوون بەپەناگەیەك بۆ ئەو عەلەوییانەی لەدەست پیاوخۆرە سەفەوییەکان لەخۆراسانو ئازەربایجاندا هەڵهاتبوونو لەئەنجامی چالاکیو پڕوپاگەندەکردنیاندا رێبازی، عەلەوییان لە زێدی خۆی (ئەو ناوچانەی کەوتبوونە ئەوبەری رووبارەوە) زیندووکردەوەو بەهۆی ئەو نوور

بەخشییانەی کەپەیوەندییان پێوە کردبوون، بە نیمچە کیشوەری هیندستان گەیشتن.

شا تەهماسب (٩٣٠ – ٩٨٤ی کۆچی) لەماوەی دەسەڵاتی پەنجاو چوار ساڵەی خۆیدا، بەمەبەستی سەرکوتکردنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕەکان و ڕێ گرتن لەبزووتنەوە هاوشێوە بەردەوامەکان، هەموو هەوڵ و کۆششێکی خۆی خستبووەکار، بۆ لەناوبردنی ڕاپەڕینی عەلەوییەکان و بەبیانووی ڕێزگرتن لەبیروبۆچوونی زاناو موجتەهیدەکان، دەستی کرد بەپەرچدانەوەو بەگژداچوونەوەی بیروبۆچوونی فیکری و فەلسەفی و ئایدیۆلۆژیی شۆڕشگێڕەکان، ئەو لەلایەك ڕابەری گەورەو پێشەوای زنجیرەی سەفەوییەکان بوو و خۆی بەجێگری جێنشینی ئیمام دانراو لەلایەن ڕێبەری ئیسلامەوە دادەناو تووشی نەخۆشی دەروونی دوودڵی (وەسوەسە) بووبوو، بەجۆرێك زۆربەی ڕۆژەکان لەبەیانییەوە تا ئێوارە لەحەمامدا خەریکی خۆشتن و خۆ پاککردنەوە بوو و زۆرترین شتی بەپیس ئەزانی و لەئەنجامیشدا هەر بەو نەخۆشییەوە مردو سەری نایەوە. هۆی ڕوو وەرچەرخاندنی عەلەوییەکان لەسەفەوییەکان بەتایبەتی لەشا تەهماسب، ئەوەبوو لەماوەی ئەو پەنجاو چەند ساڵەی پاشایەتی خۆیدا، جگە لەیارمەتیدانی جێگیربوون و ئامادەبوونی نوێنەرانی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان کە سیاسەتێکی قورسی داگیرکەرانی لێکەوتەوە، بۆ ئێران و ئێرانییەکان و بەپێچەوانەی بیری نیشتمانپەروەریی عەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەق بوو، بەگوێرەی نووسینی مێژوو نووسەکان (هیچ کەس لەگەورە پیاوان و ناودارانی وڵاتانی ژێر دەسەتی سەفەوییەکان بەتایبەتی ناوچەی خۆراسان نەبوو کەلەو سەردەمەدا لەدەرگای دەرباری شا تەهماسب دا، بەشێوەیەك

لەشێوەکان، وەك بارمتە لەوێ کۆ نەبووبێتەوە، هەموو ئەو کۆمەڵو کەسانە لەئاوارەیی‌و دوور لەخێزان‌و ماڵ‌و منداڵی خۆیان لە(قەزوین)دا بەخەم‌و پەژارەوە سەریان نایەوە) هەر لەسەر فەرمانی شا تەهماسب (٩٣٠ - ٩٨٤ی کۆچی) سام میرزای برای خۆی لەسێدارە داو کوڕەکەشی لەخەوا خنکێنراو کوڕەکەی تری کەخەبەری بوویەوە، ئەویشیان کوشت، کوڕەکانی ئەلقاس میرزای برایشی هەموو لەخەودا کوژران. ئەمانە چەند نموونەیەکی بەرزو بالای خزم دۆستی بوون کەلەماوەی چەند دەقیقەیەکدا خرانە روو، لەگەڵ دانیشتنی شا تەهماسب لەسەر تەخت، بەرامبەر بەبنەماڵەی سەفەوییەکان‌و ئەوانەی پەیوەندییان هەبوو لەگەڵیاندا، ئەنجام درا.

لەو شێوازانەی کە ئەم شا تەهماسبە بەکاری دەهێنا، بۆ کوشتن‌و ئازارو ئەشکەنجەدانی مرۆڤ: بەندکردن لەقەفەزی ئاسنینداو، هەڵواسین بەمنارەدا، ئاگر تێبەردان‌و سووتاندن، سووژن کردن بەزماندا، بەندکردن لەناو کوپەی گەورەدا، بەزیندووی کەوڵکردن‌و پڕکردنی پێستەکان لە کاو کردنی بەسەرداروە، ئاگرنان بەریش‌و چەناگەوەو، بەگون هەڵواسین بەمنارەدا. ئەم شێوازانە تەنانەت بۆ زاناو هزرمەندانیش بەکارهێنراوە. بۆ نموونە کاتێك مەلا روکنودین حەکیمی کازرۆنی پزیشکی زانای شا تەهماسب لەسەر داوای یەکێك لەشازادەکان خوازبێنی کچی شا دەکات بۆ ئەو شازادەیە، شا تەهماسب فەرمانی‌دا، لەنۆی مانگ موحەرەمدا بەزیندوویی سوتاندیان.

ئەم تاوان‌و کارە دڕندانانە، هەرچەند لەژێر پەردەی برەوپێدان‌و بڵاوکردنەوەی ڕێبازی بنەماڵەی پێغەمبەردا ئەنجام دەدراو لەسەرانسەری ئێراندا، عەلەوییەکان بەمەبەستی گەیشتن بەم ئامانجە، بڵاوکردنەوەی

پڕوپاگەندەو ڕێبازی سەفەوییەکانیان خستبووە ئەستۆی خۆیان، بەڵام ناکۆکی بنەڕەتی ئەوان، لەگەڵ ئەو یاساو بەهایانەی کە پەسەندبوون لەلایەن دەزگای شیعەگەری‌و ڕاگەیاندنی وەزیری شا کەدەیگوت: هەر شوێنێك داگیرکرا دەبێ خەڵکەکەی ڕەشەکوژ بکرێ‌و هیچ جیاوازییەك نەبێ لەنێوان شیعەو سوننەو گەورەو بچووك‌و تاوانبارو بێ‌تاوان...، بەو مانایەی کەسەفەوییەکانیش وەك ئەو بنەماڵانەی کەبەپەنابردنە بەر بیروباوەڕو بۆچوونی ڕاپەڕیوە شمشێر وەشێنەکان‌و لەژێر پەردەی پەیڕەوی کردنی ڕێبازی فیکری‌و فەلسەفەی دام‌و دەزگا پێشەنگەکاندا، دەسەڵاتیان گرتە دەست، مەبەستیان تەنیا کۆکردنەوەی هێزێکی گەورەو بەپشت بەستن بەپلەو پایەی باووباپیران بوو، لەپێناوی کەڵەکەکردنی سەرمایەی قەبەو زۆر، لەناوچەکانی ژێر دەسەڵات‌و ملکەچ پێکردنی گروپ‌و تاقمەکان، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان‌و، لەمە زیاتر مەبەستێکی تریان نەبووە.

تلیاك‌و تووتن لەم سەردەمەدا، بەیارمەتی‌و پشتگیری کردنی دەرباری سەفەوییەکان، برەوێکی تەواوی پەیدا کردبوو، بەوەی کەبەشێکی زۆر لەمەلاکانی ئەو چەرخە، تەنانەت بەکارهێنانی تووتن و تەماکۆیان حەرام کردبوو و زۆر وتارو بەرهەم‌و نامیلکەی تایبەتیان لەو بارەیەوە دانابوو و بەشێکی هەرە زۆری زانایانی شەرع، لەحەرام بوونی مادە بێهۆشکەرەکاندا هیچ گومانیان نەبوو و چەندین فەرموودەیان لەم بارەیەوە گێڕاوەتەوە.

دەوڵەتی ڕوسیا کەچاوی بڕیبووە خاکی ئێران‌و داخی‌ئەو برینە قوڵانەی لەدڵدابوو کەعەلەوییەکان لەژێر ئالای جونەیدو حەیدەرو شا ئیسماعیلدا لەگەڵ گاورەکانی ڕوسیادا دەجەنگان‌و دەچوونە غەزا. لەسەردەمی شا تەهماسبدا، هێرشەکانیان بۆسەر ناوچەی باکووری قەوقازو خۆرهەڵاتی

گورجستان دەستی پێکرد. تەنانەت ئەوگروپە لەزانا گەورەکانی شیعە کەبەپێچەوانەی ئارەزووی شاتەهماسبەوە دەجولانەوەو بەگوێرەی شەرع پارێزگارییان لەدنیا نەویستی و خواپەرستی و لەخواترسانی خۆیان دەکرد، کەوتنە بەر شەپۆلی رق و تورەییەوە، بەنموونە (قەتیفی) کەپێی ناخۆش بوو پاداشت و بەخشیش لەکاربەدەستانی زۆردارو زاڵم وەربگرێ، شاتەهماسب بەپاداشتێکی شایستە بەسەری کردەوە، بەڵام ئەو دیاری و بەخششەکانی شای وەرنەگرت و گوتی: من پێویستم بەم شتانە نییەو وەریان ناگرم. ئەوانەی کەدیارییەکەیان هێنابوو بەناچاری گەڕاندیانەوە، هەندێ کەس لەم بارەیەوە رەخنەیان لێگرت و ئەویش وەڵامی دانەوەو قسەی شەهیدی یەکەمی بەبەڵگەهێنایەوە کەگوتوویەتی دیاری پیاوی زۆردار وەرنەگرتنی باشترەو، هەڵوێستی هەندێ لەزاناکانی تر کەدیاری پاشاکانیان وەردەگرت، بەهەڵە دەزانی و لۆمەی دەکردن. هەندێکی تر لەمەلاو ئاخوندەکان (لەنێویاندا موحەدیسی بەحرەینی) لایەنی ئەویان گرت و گوتیان لەبارەی مەسەلەی وەرگرتنی دیاری پاشای ستەمکارەوە ئەو راستەو ئەوانەی بەپێچەوانەی هەڵوێستەکەی ئەوەوە قسە دەکەن، قسەکانیان سەرلێشێواندنی بەروونی پێوە دیارە.(پێشەکی کتێبی جیهانگوشای خاقان. لاپەرە ٥-٨).

هاوکات لەگەڵ فەرمانڕەوایی شاتەهماسبدا (٩٣٠ ٩٨٤)ی کۆچی، نووربەخشی یەکان، لەئێرانی ناوەند، دەوروبەر، رەی و تاران، شەمێرانات، وەرامین، قەزوین و ساوەو دەماوەندو... لەوپەری تواناداوون و لەبرەودان و پەرەپێدانی رێبازی نووربەخشی لەعەلەوییە توندرەوەکان، کەمتەرخەمیان نەدەکردو شا (قەوامودینی نووربەخشی سەرکردەی عەلەوییە نوربەخشییەکان، پلەو پایەو توانایەکی تەواوی هەبوو. ئەو کەلە نەوەی

(قاسمی فەیز بەخش) بوو، لەکاتی هاتنی لەشکرییەکانی شا تەهماسبی سەفەوی بۆ رەی، ساڵی (٩٢٥)ی کۆچی، دەستڕۆیشتوی و پلەو پایەی ئەو، ترسی خستبووە دڵی شاتەهماسبەوە، لەبەرئەوە بەبیانووی ئەوە کەپەیڕەوانی نووربەخشی دەستیان هەبووە لەکوشتنی شاعیرێکدا بەناوی (ئومێدی تارانی)، فەرمانی دەرکرد کەئاگر بەربدەنە ریشی شا قەوامودینی نوربەخشی و دەموچاویان سووتاند، پاشان شاربەدەریان کردو موریدەکانیشی پەرتەوازە کرد، (٩٤٣ کۆچی)} تاریخ نظم و نثر فارسی، سعید نفیسی، تهران ١٣٤٤،ج١، ص٤٤١} {تحفة سالی، وحید دستگری، ص ١٠١}.

بەناچاری نووربەخشییەکانیش وەك موشەعشیعییەکان پەنایان بردە بەر عەلەوییە توندڕەوەکان و بۆ ئەوەی بگەنە لایان، بەنهێنی رێی ئازربایجان و بەتایبەتی خۆراسانیان گرتەبەرو لەژێر سێبەرو پەنای ئەوانەدا کەشائیسماعیل ناردبوونی بۆ خۆراسان، بۆ سەرکوتکردنی دۆستانی شاه وەیس قولی لەوێ دەرکەوتن، لەم رێگایەوە پاش ئەوە، پەنابەرە عەلەوییەکان لەدام و دەزگای تەیمورییەکانی هند کەدواتر ئاماژەیان پێدەکەین دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی رێبازی نوربەخشییە عەلەوییە توندڕەوەکان. لەنێو ئەو رووداوانەدا کەبووە هۆی رەخساندنی هەڵ و دەرچوون و کۆچکردنی خەلیفەو ئەوانەی کەپەیوەندییان هەبوو بەعەلەوییە توندڕەوەکانەوە (ئەهلی حەق) بەرەو هند، ئەوەبوو پاش سەرکەوتنی گەورە لەبەشی زۆری ناوچەکانی خۆراسانی گەورە، کەئەوکاتە ولاتی ئەفغانستانی ئیستاشی دەگرتەوە، کەتا ئەو وەختەش عەلەوییە توندڕەوەکان بەشێکی زۆری لقە سەربازییەکانی سەفەوییەکانیان (قزڵباش) پێکدەهێنا، بوون بەلێپرسراوی جێگیرکردنی پێگەو پایەی هومایۆن شا لەخاکی هینددا، راستی

رووداوەکەش ئەوەبوو کە هومایۆن پاشای فەرمانڕەوای تەیموریيەکانی هیند کەپاش مردنی باوکی (زەهیرودینی بایەری باوکی) کە هاوپەیمانی پێشووی شائیسماعیل لەشەڕی ئوزبەکەکاندا بوو، لەسەرتەختی پاشایەتی هند دانیشت و بەهۆی شۆڕشی (شێرخان لودی) کەسەردارێکی ئەفغانی خۆی بوو دژی هومایۆن پاشا، هەڵساو چەندین جار شکانی، پەنای هێنا بۆ دەرباری شاتەهماسب (٩٥١)ی کۆچی. هەرچەند لەسەرەتادا، ئەوەندە بەگەرمی پێشوازیی لێنەکرا، بەڵام پاش یەك ساڵ مانەوە لەئێراندا، بەفەرمانی شاو بەیارمەتی تاقمێك لەسوپای قزلباش گەڕایەوە بۆ هیندو توانی سەرکەوێ بەسەر دوژمنەکەیداو دەسەڵات بگرێتەوە دەست. بەدوای ئەم رووداوەدا، شاری قەندەهار بوو بەهی ئێران و پەیوەندیی دۆستانە لەنێوان سەفەوی و تەیمووریيەکانی هینددا کەلەسەردەمی شائیسماعیلەوە هاتبووە ئاراوە، زیاتر پتەوبووو چەند ئاکامێکی هونەری و ئەدەبی باشی لێ پەیدابوو. {روزگاران،ص٤٤-٤٥}

عەلەوییە توندڕەوەکان کە هۆگرییەکی کۆنیان هەبوو لەگەڵ خاکی هینداو لەلایەنی داب و نەریت و رەوشت و رۆشنبیری و دەربڕینی بیروباوەڕەوە، هیندستان ئەو شوێنە بوو کە بەدوایدا دەگەڕان، لەشێوەی دوو گروپ لەعەلەوییە توندڕەوەکان لەهینددا بەدەرکەوتن و لەوێ نیشتەجێبوون، یەکەم جار، نووربەخشییە عەلەوییەکان کەبوون بەپەیڕەوانی گیان بەخش و دڵسۆزی بنەماڵەی ئاتەش بەگی، وەك موشەعشیعییەکان، سەرلەنوێ بەیعەتیان کردەوەو پەیمانی وەفادارییان تازەکردەوەو کەوتنە تەکیان، پاشتر لەهینددا هەندێ گۆڕانیان بەسەرداهات، دووهەم جار نوقتەوییەکان کەزۆرێك لەپیاوانی دەرباری تەیمووریيەکانی

هیند لەسەردەمێکی تایبەتدا، لەو زاناو بیرمەندە نوقتەوییانە بوون و ببوون بەپەناگەیەك بۆ ئەو نوقتەوییانەی دواتر هەڵدەهاتن و سەرکوت دەکران.

بەیرام خانی قەرەنقولوی کوڕەزای جیهان شا یەکێك بو لەو عەلەوییە توندڕەوانە، کەپیاوی دەرباری هومایۆنشاو ئەکبەر شای تەیموری لەهیند بوو و یەکێك بوو لەشاعیرە هەڵکەوتووەکان. لەدیوانە شیعرەکەیدا یەك قەسیدەی هەیە سەروتاکەی ئەم تاکە شیعرەیە کەدەڵێ:

شهی که بگذرد ازنه سپهر افسراو — اگر غلام علی نیست، خاك برسراو

واتە

شاهێك کەسوپاکەی نۆ وڵات بخاتە پشتی سەریەوە — ئەگەر غوڵامی عەلی نەبێ خاك بەسەری ئەو

هەر لەم قەسیدەیەدا دەڵێ:

محبت شەمردان مجوی ازپدری — کەدست غیره گرفته است پای مادراو

واتە

بەتەمای خۆشەویستی شای مەردان مەبە لەباوکێك — کەدەستی بێگانە قاچی دایکی گرتبێت.

{ تاریخ پانصد ساله خوەرستان،ص٢٥٤}

بەم شێوەیە لەم ڕێگایەدا، لەبنارەکانی زاگرۆسی کوردستان و ئازەربایجان و میزوپۆتامیا و سەرزەمینی عوسمانییەوە، ڕێڕەوی برەودان و دوور خستنەوەی عەلەوییە توندڕەوەکان پەلی بۆ تاران و خۆراسان و ئەفغانستان و هیندوستان کێشا.

## تێکۆشانی عەلەوییە توندڕەوەکانی
## ئەهلی حەق لەسەردەمی شائیسماعیلی دووهەمدا.

لەئەنجامدا شاتەهماسب لەساڵی ٩٨٤ی کۆچیدا، بەهۆی نەخۆشی وەسوەسەو دوودڵی و بەهۆی ئەو زەهرەوە کەلەگەڵ قسڵدا تێکەڵ کرابوو و لەحەمامدا درا لەپێستی، گیانی خۆی لەدەستدا پاش پەنجاو ئەوەندە ساڵ فەرمانڕەوایی، ترس و بێ سەروبەریی کۆمەڵگەی نەخۆشی دەستی راڕایی خۆی بەرەو رووی شا ئیسماعیلی کوڕی بووەوە. لەسەردەمی فەرمانڕەوایی شا ئیسماعیلی دووهەمدا کەساڵێك و کەمێك زیاتری نەکێشا، چەند بزووتنەوەو راپەڕینی عەلەوییە توندڕەوەکان، لەماوەی سەرهەڵدان و رووخانی ئەودا روویان دا.

ئەوەی کەلەچوارچێوەی قەڵەمڕەوی جوگرافیایی کوردستاندا رووی‌دا، لەباسی کاروباری رابردووی باوباپیرانی فەرمانڕەواکانی ئەردەڵاندا کەبەشێکی سەربەخۆمان بۆی داناوە، لەدوای ئەم بەشەدا، بەڵام ئەوەی کە لە بنارەکانی زاگرۆسدا لە سەرهەڵدان و ئاوابوونی شا ئیسماعیلدا رووی‌دا وەهابووە: وەك مامۆستا دکتۆر عەبدولحوسێن زەرین کوب نووسیویەتی: بەڵام فەرمانڕەوایی ئەو (محەممەد میرزای کوڕی شا تەهماسب ساڵی ٩٨٤ی کۆچی) و رەفتارەکانی تیرەی ئیستاجلو (کەئەویان گەیاندبووە سەر تەختی پاشایەتی} یەکسەر لەناو دەوڵەتدا، رووبەرووی کاردانەوەی ناحەزان بووەوەو بەهەوڵ و فێڵ و تەڵەکەی خاتوو (پەریخان) کچی زیرەك و پیلانگێڕی شا، ئیسماعیل میرزای بەندکراو لەزیندان رزگاری بوو، لەگەڵ گەیشتنی بۆ قەزوین پاشایەتی خۆی راگەیاند، بۆ ئەوەی کەهیچ جۆرو

کۆسپێکیش نەمێنێ لەچوونە سەر تەختی ئەودا، حەیدەر میرزاش لەهەمان شوێندا کوژراو پاشایەتی سەفەوییەکان گەیشتە ئیسماعیل میرزا، کەسێهەمین و لای هەندێکیش چوارەمین پاشای زنجیرەی سەفەوییەکانەو ناوی شا ئیسماعیلی دووەمی لێنرا.

ماوەی نزیکەی بیست ساڵ (٩٦٤ تا ٩٨٤ی کۆچی) زیندانیو بەندبوونی شا ئیسماعیلی دووەم لەقەڵای خامۆش و کشوماتدا، لەسەر لوتکەی شاخی سەبەلانی نێوان تەورێزو ئەردەبیلدا، ئەم شازادە ئازاو بێخەمەی کردبوو بەکەسێکی سەرکێش و یاخیو نیازخراپ و بێ بەزەییو تۆڵەسێنەرەوە، کەلەهەموو شتێکی دەربارو تەنانەت ڕێبازی ئایینیو کەس وکارو خزمی خۆی بێزارو بەگومان بوو. ئەو هەر چووە سەرتەخت بەرامبەر لەڕێبازی ئایینی باوباپیرانی خۆی هەڵگەڕایەوەو هەرچی خزمی خۆی لەمامو ئامۆزازو برازاو براکانی هەبوو، زۆر بێڕەحمانە هەموویانی لەناوبردو کردنیە هۆی ئاسوودەییو دەروونی خۆی.

فەرمانڕەوایی ئەو کورت بوو، بەڵام خوێناویو پڕ بوو لەئاژاوەو نائارامیو توندوتیژیو بەشێکی زۆر لەکاتەکانی خۆی لەچایخانەو بە تلیاك کێشان و رابواردن بەسەردەبرد، بێبەزەیی و بەرانبەر بەکارو باری دەوڵەت بەزۆری، دوورەپەرێز یا کەمتەرخەم بوو. شەوەکانیشی لەگەڵ دەروێشی کوڕی حەلوایی کەخۆشی دەویست بەسەردەبرد، بەرۆژیش یا سەرخۆش بوو یا دەخەوت، یا خەریکی دەرکردنی بڕیارو فەرمان و جێبەجێکردنی حوکمی زاڵمانەو شێتانەو بێ لێکدانەوە بوو. ئازاری بیست ساڵ زیندانی، شێتی کردبوو و تووشی جۆرێك لەماخۆلیا بووبوو.

پاش ئەوەی هەموو ئەوانەی لەناوبرد کەبەتەمای لەسەر تەخت دانیشتن بوون لە بنەماڵەی سەفەوی کەبراو ئامۆزای بوون پاش ئەوانیش ئەوانەی لەناوبرد کەدەیانپاراستن لەقزڵباشەکان محەمەد میرزای فەرمانڕەوای فارس و کوڕەکانی عەباس میرزا (شا عەباسی یەکەم)و حەمزە میرزا کەلەم کوشتارە رزگاریان بوو، بەهۆی ئەوەوە بوو کەدووربوون لەپایتەخت بڕیاری کوشتنی ئەوانەشی، کاتێ بەتەواوی دا کەخۆی لەوکاتەداو پێش ئەوەی فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێ، کتوپڕو لەباروددۆخێکی گوماناویدا لەناوچوو و مردنەکەی ئەوانی لەمردن رزگارکرد.

شا ئیسماعیل لەبەرئەوەی کەبەمنداڵی لەلایەن مامۆستایەکی سوننییەوە پەورەردەکرابوو، دڵی بۆمەزهەبی شیعە لێینەدەداو ئەو رێبازەی بەهۆی دووبەرەکی نانەوەو شەڕی ناوخۆیی دادەنا لەناو موسڵمانانداو تاوانباری دەکرد. پیاوانی دەربارو کەسە نزیکەکانی خۆیشی سەر بەرێبازی سوننە بوون و هانیان دەدا بۆ وازهێنان لەشیعەگەری و نەهێشتنی دەسەڵاتی قزڵباشەکان و لەبەرئەوەی هەندێ لەلایەنگرانی گومانیان لەوەدا هەبوو کەببنە نیشانی پیلانە خوێناوییەکانی و لەناوببرێن، بەدەست تێکەڵکردن لەگەڵ پەریخانی خوشکی کەدەستێکی کاریگەری هەبوو لەهاتنە سەر تەختی ئەودا، کەوتنە سەر خەیاڵی لابردنی، بەڵام راهاتنی لە رادەبەدەری لەسەر تلیاک خواردن و شتی تر، پێش ئەوەی ناحەزان پیلانی خۆیان جێبەجێبکەن، بووە هۆی ئەوەی کۆتایی بەدەسەڵاتی بێنێت، لەبەرەبەیانی شەوێکدا کەبەسەرخۆشی و بێئاگایی بردبوویە سەر لەماڵەکەیدا مردبوو..(رەمەزانی ۹۸۵) {روزگاران، ص۲٦۰-۲٦۱}

بۆ باسکردن و روونکردنەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئاینی سەردەمی فەرمانڕەوایی شا ئیسماعیلی دووهەم کەبووە هۆی پێکهاتن و دروست بوونی رێکخراوەکانی عەلەوییە توندڕەوەکان لەکوردستان، هاوکات لەگەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی ئەودا، هێشتا چەند مانگێك بەسەر پاشایەتی ئەودا تێنەپەڕیبوو، لەناو خەڵکدا وا بڵاوبووبوویەوە کەئەگەر شا بەگوێرەی رەفتارو گوفتارەکانی لەدانیشتنە تایبەتییەکاندا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ، ناتوانێ خۆی بەپەیڕەوێکی راستگۆی رێبازی شیعەگەری دابنێ. هۆی پەیدابوونی ئەم جۆرە بیرکردنەوەش لەناو خەڵکیدا ئەوەبوو کە (سەبارەت بەو جیاوازییەی هەبوو لەنێوان رێبازە ئاینییەکانی ئیسلامدا، دەستی ئەکرد بەقسەکردن و مشت ومڕو لەگەڵ زانا شیعەکاندا). لەگەڵ ئەوەشدا ئاخوندە شیعەکان رووبەڕوو وەڵامیان نەئەدایەوە، بەڵام لەپەناوە لەگەڵ یەکتردا قسەیان دەکرد لەو بارەیەوە. میرزا مەخدومی شەریفی کەلەرۆژگاری شا تەهماسبدا بەوە ناسرابوو کەلەلایەنگرانی رێبازی سوننە بوو، بەبێ هیچ سنوورێك قسەکانی شای پەسەند ئەکردو لایەنگری ئەکرد. بەم شێوەیە رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر لەجاران شا لەخۆی نزیکی ئەکردەوەو لەئەنجامدا گەیشتە بەرزترین پلەی ئاینی.

پاش کەمێك شائیسماعیل، بەئاشکرا دەستی‌کرد بەلایەنگری‌کردنی رێبازی ئەهلی سوننەو دەیویست خەڵك وازبێنن لەجنێودان بەسێ خەلیفەی پێش عەلی‌و ئەکەوتە مشت ومڕ لەگەڵ ئاخوندە شیعەکانداو بەشی زۆریشیان چاو پۆشییان لێ ئەکردو خۆیان دوور ئەخستەوە لەقسەکردن لەگەڵیدا.

... کاتێك کەلەیەکێك لەکۆبوونەوەکانی دەربـاردا، بولغار خەلیفە (گەورەی خەلیفە سەفەوییەکان) لەگەڵ (میر مەخدوم شەریفی) رووبەرووی

یەکتری بوونەوەو بەتوندی بەگژ یەکدا چوونەوەو بولغار خەلیفە بەهیچ شێوەیەك ئامادە نەبوو لەبۆچوونەکانی پاشەکشە بکاو رووی کردە ئەو سوفییانەی کەلەوێ ئامادەبوون، گوتی: خەلیفەیەك کەلەگەڵ شێخەکەی خۆیدا درۆ بکات، شایەنی ئەوەیە سزابدرێ) هەموو سۆفییەکان هێرشیان کردە سەریو ئەوەندەیان لێدا وایان دەزانی مردووەو بردیانە دەرەوە، بەڵام ئەو پاش ماوەیەك هاتەوە سەرخۆیو پاش چەند مانگێك چاك بووەوەو کەوتەوە جموجۆڵ. شا پۆستەکەی ئەوی سپارد بە(دەدە خەلیفەکانی ئیستا جلو)و لەهەمان کاتدا قسەی ناشیرینو نارەوای ئاراستەی پیاوە ئایینییە شیعەکان کرد.

شا بەبێ ئەوەی هیچ گوێ بدا بەپێناخۆش بوونو سەرپێچی کردنی خەڵك، دابونەریتی سووکایەتیکردنو جنێودان بەسێ خەلیفەکەی لەشەقامو گۆڕەپانەکاندا قەدەغەکرد. هەندێ لەشیعە کەللەڕەقو توندڕەوەکان، وەك زانا میر سەیید حوسەینو میر سەیید عەلی واعیزو کەسانی تری لە دەربار دەرکردو دەستی گرت بەسەر کتێبەکانیداو ماڵەکانیانی وێران کرد. لەلایەکیترەوە تاقمێك لەمەلاکان کەبەلایەنگری لەرێبازی ئەهلی سووننە ناسرابوون، وەك میرزا مەخدومی شەریفی، مەولانا میرزاجان شیرازی، میر مەخدومی لالە، لەلایەن شا بایەخیان پێدەدراو کەوتبوونە خۆشییەوە.

بۆ ئەوی لەناو خەڵکدا لایەنگران پەیدا بکرێ، بڕێکی زۆر پارە دابەشکرا بەسەر ئەوکەسانەدا کەبەدرێژایی ژیانیان جنێویان نەدابوو بەو دە کەسە لەهاورێیانی پێغەمبەر کەموژدەی بەهەشتیان پێدراوە.

میرزا مەخدومی شەریفی لێپرسراوی دۆزینەوەی ئەو جۆرە کەسانە بوو، گەلێك لەچاوچنۆكو پارەپەرستەکان، لەناکاو بۆیان دەرکەوت کەلەبنەڕەتدا

سوننەبوون، زۆر کەسیش لەوانەی کەبێ دەرەتان و نەدارابوون خۆیان ناونووس کردو دەیانگوت کەهیچ کاتێك سەروساختەیان نەبووە لەگەڵ رێبازی شیعەگەرییدا، لەبەرئەوەی بەشێکی زۆر لەخەڵکی قەزوین لەسەردەمە رابردووەکاندا، سوننی بوون و لایەنگری رێبازی ئیمامی شافیعی بوون، واش دانرا کەهەندێك لەوانە تا ئێستا لەپایتەختدا ژیان بەسەر دەبەن. میرزا مەخدوم دەستی کرد بەلێکۆڵینەوە لەداوای خەڵکەکەو پاشان دوو سەد تمەن (٤٠٠٠٠ دوکات)ی دابەشکرد بەسەریاندا.

بۆئەوەی ئەوانەی لایەنگری رێبازی شیعەگەری بوون بەتەواوی بێزار بن، تەنیا دوونموونە دەخەینە بەرچاو.

رۆژێك میرزا مەخدومی شەریفی شکاتی کرد لای شائیسماعیل و گوتی ناحەزانی ئەهلی سوننەت لەدواییین وتاری ئەو لەمزگەوتدا گاڵتەیان پێکردووە. شا ئیسماعیل یەکسەر دە کەس لەچەخماخچییەکانی هەڵبژاردو پێی راگەیاندن کەلەمەوپاش هەرکەس جنێو بدا بەسێ خەلیفەکە بەجۆرێکی شایستە سزا بدرێت. لەشەوی جومعەی داهاتوودا، پاش وتار خوێندنەوەی میرزا مەخدومی شەریفی دەروێشێك کەناوی (قەنبەری تەبەررایی) بوو دەستی کرد بەقسەکردن و گوتی:

علی و آل علی را زجان و دل صلوات

که دشمنان علی را مدام لعنت باد

واتە:

سەڵەوات لەسەر عەلی و بنەماڵەکەی و نەفرەتیش لەدوژمنەکانی. میرزا مەخدوم تاوانباری کرد بەوەی کەئاژاوە دەنێتەوە، بوو بەمشت و مڕ، چەخماخچییەکان بەدار لەچەند لاوە سەری دەروێشەکەیان شکاند. تائێستا ئەگەر کەسانێك بووبن تەواو بڕوایان بەوەنەبوو کەشابووە بەسوننی، پاش

ئەوەی کەجەندرمەی قەزوین ناوی هەر دوانزە ئیمامەکەیان لەمزگەوتەکاندا سڕییەوە، ئیتر گومانیان لەوەدا نەما.

مەسەلەکەش بەم جۆرە بوو: لەکۆڕێکی دەربار‌دا کابرایەك گوتی کەشیعر نووسین لەسەر دیواری مزگەوت و رابواردن و گاڵتەکردن لەناو مزگەوتدا کارێکی ناڕەوایە، جگە لەوە دیوارەکانی مزگەوت رەشکراوەتەوەو لەشیعری عاشقان و ئەوینداران کەخەڵك نووسیویانەتەوە، پاش ئەمە (میر زەینولعابدینی کاشی) بەرپرسی جەندرمە لەگەڵ ئەوەدا کەخۆی شیعەبوو، هەموو کاتێك بەگوێرەی دڵی شا قسەی دەکرد، لەلای شاوە راسپێردرا کەبچێت بۆ مزگەوتەکان، چی شیعرو نووسین هەیە لەسەر دیواری مزگەوتەکان بیکوژێنێتەوە. ئەم کارە ئەنجام درا، بەڵام بەرپرسی جەندرمە بۆ زیاتر خۆ بردنە پێشەوە لەشا، ئەو نووسین و شیعرانەشی کوژاندەوە کەلەستایشی دوانزە ئیمامەکەدا نووسرابوون، تەنانەت ناوی هەموو ئیمامەکانیشی بەتەواوی سڕییەوە.

هەرکە ئەم کارە ئاشکرابوو، ناوونا‌تۆرەی خەڵك زیادی کرد، گەلێك لەقزڵباشەکان دڵیان لەشا رەنجا، کاتێك شیعەکان تووشی گرتن و ئەشکەنجە بوونەوە لەلایەن شا ئیسماعیلەوە، ئەوان سەرپێچییان کرد لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی، گەلێك لە مەلا ناودارو دیارەکان کەلەسەردەمی شاتەهماسبدا، بەهۆی توندرەوییانەوە بەرامبەر بەرێبازی شیعەگەری، پلەو پایەی باشیان هەبوو لەچاو کەسانی‌تردا (لەوانە عەلائولمولکی مەرعەشی کەپێشتر لایەنگری حەیدەر میرزابوو)و ئێستا نەیان دەویست دەسبەرداری بیروباوەڕی خۆیان ببن، لەیاوەریی شا دوورخرانەوەو تەنیا بەبانگهێشتی خودی شا دەیانتوانی بچنەلای. هەندێك بیروباوەڕی خۆیان دەشاردەوەو

هەندێکی‌تر کەلایان وابوو شا ئیسماعیل بەهۆی سیاسییەوە، لەپێناوی ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیی نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی ئەو ڕێگایەی گرتووەتە بەرو نەیاندەیوست لەناو خەڵکدا ئاژاوە پەیدا ببێ، بێدەنگییان هەڵبژارد. بەڵام بێدەنگ بوون لەم بارودۆخانەدا شتێك بەشتێك ناکات و بڵاوبوونەوەی هەواڵی کوژرانی هەندێ دەروێش و سووکایەتیکردن بەهەیوان و گۆڕەپانی مزگەوتەکان، وەك چۆن تۆفان دەریا دێنێتە جووڵە، بەوشێوەیە هەست و سۆزی خەڵکە باوەڕدارەکانی هێنایە جۆش و خرۆش.

لەژێر کاریگەریی ئەم بارودۆخە هەڕەشە ئامێزو مەترسیدارەدا، گەلێك لەمیرو پیاوە ناودارەکان لەباخی سەعادەت ئابادی، نزیکی کۆشکی شا کۆبوونەوەو دەستیان کرد بەگفتوگۆ. ئەوان نەیاندەزانی ئەگەر رابەرو پێشەوای میللەت بەئاشکرا نیازی ئەوەی هەبێت بیروباوەڕی باوباپیرانی خۆی واز لێبێنێت، ئەوان بەگوێرەی ئەو ڕێورەسمەی نێوان شێخ و سۆفی یا دەروێش و مورید دەبێ چی بکەن. هەندێکیان پێشنیاریان کرد کەلەم بارەیەوە لەخودی شا ئیسماعیلی دووەم پرسیار بکەن، بەڵام گەلێك لەریش سپییەکانیان دژی ئەم پێشنیارە وەستانەوە، چونکە هەڵوێستێکی وا لەگەڵ نەریتی قزلباشەکاندا ڕێك ناکەوێت و مانای سەرپێچی ئەگەیەنێ لەگەڵ فەرمانڕەوادا. سەبارەت بە یاوەران و دەستوپێوەندانی شا، دەبێ بێدەنگ بن و گوێڕایەڵی فەرمانی شا بن نەك دەست بکەن بەکەللە رەقی و رووبەرووی ببنەوە.

لەئەنجامدا سەرکردەی (تەکلو)ەکان، (ئای دۆغدی خەلیفە) سۆفی و جێ متمانەی شائیسماعیلی دووهەم بڕیاری‌دا کەلەگەڵ (ئەمیرخان)ی ڕێبەری تورکمانەکان بچنە لای شا و چارەیەك بۆ ئەم نیگەرانیو دڵەڕاوکێیەی

خەڵك، لەخودی شا داوا بکەن. چەند کەسێك لەئامادەبووان، لەوانە خەلیفە ئەنساری قەراداغلو کەپێشتر بەرپرسی بەندیخانەکانی شا ئیسماعیلی دووەم بوو، کاتێك کەگوێیان لەم پێشنیارە بوو، بەخشکەیی خۆیان کشاندەوەو بەپەلە گەیشتنە لای شاو پێیان گوت: کەتەکلۆو تورکمانەکان نیازی ئەوەیان هەیە کەلەسەر تەخت لای ببەن، چونکە ئەو لایداوە لەئایینو دەیانەوێ لەبری ئەو حەسەن میرزای کوڕە گەورەی محەمەد خودا بەندەی جێنشین، کەلەتاران دادەنیشێ لەسەر تەخت دابنێن. شەرەفخانی بەتلیسی لەکتێبەکەی خۆیدا بەناوی شەرەفنامە، بێزاری دەربڕیوە، لەوەی کەئەویش تۆمەتی بەشداربوون لەو پیلانە خەیاڵییەی بەسەردا سەپێنراوەو هەر بەو هۆیەشەوە، لەدەربار دەرکراوە.

(پاش پێچانەوەی ئەو ڕووداوانەی کەپەیوەندییان نییە بەبابەتەکەی ئێمەوە) ئای دۆغدی خەلیفە دەسگیرکراو لەسندوقێکدا زیندانی کرا، بەرپرسی جەندرمەی دیوەخانی شا عەلیخان بەگی تورکمان بەبێ ئەوەی تۆمەتەکەی بسەلمێنن یەکسەر خرایە زیندانەوەو موسەیب خانی تەکلوی فەرمانڕەوای قەزوین راسپێردرا تاحەسەن میرزا {پاشای پێشنیارکراوی نەیارەکان} بکوژێت.

بەڵام بەدگومانی شا ئیسماعیل بەرانبەر بەتیرەکانی تەکلۆو تورکمان هەر بەمە کۆتایی نەهاتو ئەمەش بووە هۆی ئەوەی تیرەی ئیستاجلو ببنە خاوەن دەسەڵاتو توانایەکی زیاتر. شا ئیسماعیل بۆی دەرکەوت کەخەڵك تا چ رادەیەك گیانێکی سەرپێچیکردنو هەڕەشەی مەترسیداری لەخۆگرتووەو بۆ ئەوەی کارێك بکا تا خەڵکەکە هێور بکاتەوە، فەرمانیدا میرزا مەخدومی شەریفی بهێننە بەردەمی، پاش ئامادەبوونی شا ئیسماعیل

بەبەرچاوی خەڵکەکەوە دەستی کرد بەلۆمەو سەرزەنشت کردنی و بڕیاری دا وەلی سوڵتانی فەرمانڕەوای شیراز مەخدوم بەرێتەماڵی خۆی و چاودێریی بکا. {زندگانی شاه اسماعیل دوم، والتر هینتس. وەرگێڕانی کەیکاوس جیهانداری، ل١١٥-١٢٢}

هەرچەندە ناحەزان لەهەوڵی ئەوەدابوون لەناوی بەرن، بەڵام زیادەرەوی خۆی لەبەرکارهێنانی تلیاک و شەرابدا، ئاواتی دوژمنەکانی هێنایەدی. زۆرکەس لایان وایە کەشازادە خاتوو پەریخان لەگەڵ میرەکانی تردا دەستی تێکەڵ کردبوو، بۆ لەناوبردنی شا ئیسماعیل، ئەمەش بەهۆی ئەو ناکۆکییەی کەهەبوو لەنێوانیانداو هەم لەبەرئەوەی کەشا ئیسماعیل هەندێ کاری ئەنجام ئەداو بەتەمابوو ئەنجامی بدا کەلابەلا کردنی رێبازی سوننەگەری پێوە دیاربوو. {هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل١٤٣}، بەڵام رۆژی شەممە رێکەوتی سیانزەی مانگی رەمەزانی ٩٨٥ی کۆچی بەرانبەر ٢٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٥٧٧، شا ئیسماعیل لەسەر قەرەوێڵەکەی (حەسەن بەگی حەڵواچی ئۆغلی) کورە بێریشەکەی خۆی گیانی لەدەست دا.{هەمان سەرچاوە.ل١٤٠}

میرزا مەخدومی شەریفی (کەماوەیەك پێشتر بەهۆی بەد گومانیی قزڵباشەکان و بەهۆی گۆڕانی دۆخەکە بەفەرمانی شا ئیسماعیل لەژێر چاودێریدا بوو) ئازادیان کرد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کارە ئەنجامدرا کە ئەو بەهۆی لایەنگری کردنیەوە، لەرێبازی سوننەگەری گەلێك گیروگرفتی بەرپاکردبوو. میرزا مەخدوم کەدەیزانی لەوە زیاتر مانەوەی لەئێراندا زیانی هەیەو بۆ ئەو ئاسان نییە، بەرەو بەغدا کەوتەڕێ، تا لەوێوە بچێ بۆ زیارەتی مەککە. سوڵتانی عوسمانی گرتییە خۆی و ئەویش چەند ساڵێك لەمەککەدا، بوو بەقازی شەرعی رێبازی ئیمامی حەنەفی، تا لەئەنجامدا هەر لەشاری مەککە کۆچی دوایی کرد.{هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل١٤٩}

# شێواندنی مێژووی سەرهەڵدانی عەلەوییە توندڕەوەکان، پاش مردنی شا ئیسماعیلی دووهەم (٩٨٥ی کۆچی)

**ا- خۆراسان و ئەفغانستان**

**ب - دینەوەرو هەمەدان**

**ج - چوار مەحاڵی بەختیاریو خوزستان**

پاش مردنی شا ئیسماعیلی دووهەم لەساڵی ٩٨٥ی کۆچیدا. بەهۆی هەڵوێستی بەرامبەر بەئایدۆلۆژیاو بیروباوەڕی خەڵك، بەتایبەت عەلەوییە توندڕەوەکان کەچەند سەدە، لەهەوڵی ئەوەدابوون بگەنە ئامانجەکانیان، هەرچەند لەسەردەمی سەفەوییەکانیشدا پاوانخوازیو گۆڕانی بیروبۆچوونو خەیاڵی شاکانی سەفەوی، پاش ماوەیەك ئەوانی ناکام کردو نەیهێشت بەمەبەست بگەن، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو سەرکوتکردنو دوورخستنەوەو پەرتو بڵاوەپێکردنەیان، راهاتبوون لەگەڵ بارودۆخەکەدا، بەڵام لەسەردەمی شا ئیسماعیلی دووهەمدا، بەیەکجاری هەموو ئەو شتانەی کەبەدەستیان هێنابوو، کەوتە بەر هەڕەشەو مەترسی لەناوچوونو ئەگەری لەناوبردنەوە. لەبەرئەوە ناوبەناو دەستیان دەکرد بەشۆڕشو راپەرینێکی خوێناوی، لەدژی فەرمانڕەوای سەردەمو رووبەڕووی ئەو رەوشەی شا ئیسماعیل دەبوونەوە کەبەرانبەر بەبیروباوەڕی عەلەوییەکان ئەنجامی دەدا.

یەکەمین راپەرینی عەلەوییەکان هاوکات بوو، لەگەڵ چوونە سەرتەختی شا ئیسماعیلی دووهەم (٩٨٤ی کۆچی) لەقەڵای پڵنگان کە مەڵبەندی سەرەکیی گۆرانە عەلەوییەکان بوو، لەبناری شاخەکانی زاگرۆسی نزیك

هەورامان کە لەبەشی دواتر باس دەکرێ. بەڵام پاش مردنی شا ئیسماعیلی دووەم (٩٨٥)، چەند راپەرینێکی یەك لەدوای یەکی عەلەوییەکان دەستی پێکرد.

گومان لەوەدانییە کەپەیدابوون و سەرهەڵدانی چەند کەسێکی خانەدانی وەك زوننور قەلەندەرو (سەید رەزا) لەبنەماڵەی زوننور (خان ئاتەشی کوری شا محەمەد بەگ) کەپێشتر باسمان کرد، هاوکات بووە لەگەڵ ئەو رۆژگارەدا. پەیدابوونی بنەماڵەی خان ئاتەش لەکوردستان و ئازەربایجان و لوڕستان، هاوکات بووە لەگەڵ ئەو شەڕو شۆڕو بەگژیەکداچوونەی لەگەڵ سەرکردەی خێڵی بلباس و فەرمانڕەواکانی ئەردەڵاندا هەیبوو و لەشوێنی خۆیدا دەست ئەکەین بەباسکردنیان، بەڵام لێرەدا قسە دەربارەی چەند کەس لەپیاوە گەورە ناودارو خاوەن بیروباوەڕە ئایینیەکان دەکەین کەبزووتنەوەی چەکداری وسەربازی و فیکریی ئەوان لەسەردەمی سەفەوییەکاندا، تووشی شێواندن و گۆڕین بووەو جۆرەها تۆمەتی باوی ئەو سەردەمەیان دراوەتە پاڵ، لەلایەن مێژوونووسەکانەوەو لەسەر رۆشنایی لۆژیکی لێکۆڵینەوەی ئیستا لەنووسین و گێڕانەوەکانی ئەهلی حەق خۆیانەوە، سوودێکی ئەوتۆ وەرناگیرێت.

خاوەن و سەرکردەکانی ئەم بزووتنەوانە، لەدەقی کتێبە مێژوویەکاندا تا کۆتایی سەردەمی قاجارییەکان، بە(قەلەندەر) ناوبراون و تەنانەت لەهەندێ شوێنیشدا ناوی راستییان نەنووسیوەو گەلێك تۆمەتیان خستوونەتە پاڵیان، هەندێ شتی لاوەکییان تێکەڵ بەبابەتەکان کردووە کە مەسەلەکەیان قورستر کردووە، بەڵام ئەوەی کەناوەرۆکی بابەتەکەی خستووەتەروو و بووەتە بەڵگە، لەسەر حەقیقەتی بزووتنەوەی شۆڕشگێرانەی عەلەوییەکان،

ئەوەیە کەلەڕەوتی گەشەکردن و تۆمارکردن و بەهێزبوون و شێوەی پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی ئەم راپەڕینانەوە، دەردەکەوێ کە شێوازی تێکۆشان و سەرهەڵدان و بیروباوەڕی لایەنگرەکانیەوە دەردەکەوێت، بەگوێرەی ئەم خاڵانەی لەخوارەوە باسیان دەکەین و پەیوەندیی راپەڕینەکان بەبنکەو شوێن نیشتەجێبوونی عەلەوییەکانەوەبەئەگەرێکی زۆر نزیک لەراستی ئەو راپەرینانە، پەیوەندییان بەعەلەوییە توندڕەوەکانەوە بووە.

١. لەیەکچوونێکی نزیك بەتەواوی راپەڕینەکان لەهەموو لایەکەوە، لەگەڵ هەڵوێست و حاڵی پیاوە گەورەکانی ئەهلی حەق، وەك لەسەرگوزەشتەو گێڕانەوەکانی پەیوەندیدار بەوانەوە باسکراوە.

٢. چونیەکی باری جوگرافیایی شوێنی راپەرینەکان، لەگەڵ شوێنی نیشتەجێبوون و ناوچەی دەسەڵاتی (ئەهلی حەق)ەکاندا.

٣. باوەڕکردن و گوێڕایەڵیی خەڵك بۆ سەرکردەکانی راپەڕین، بەشێوەیەك کەلەماوەیەکی کەمدا، کاریگەرییەکی راستەوخۆی کردووەتە سەر دەسەڵاتدارانی دەوڵەت و ناچاری کردوون کەرووبەروویان ببنەوە.

٤. لەیەکچوونی ناوەکان.

٥. پێکهاتەی راپەڕینەکان لەباری کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕەوە، کەسەرکردایەتی ئەو راپەرینانە کەسانێکی (قەلەندەر)و خاوەن پلەو پایەکی خوایی گرتوویانەتە ئەستۆو هێزە سەربازییەکانیان لەوانە پێك ئەهێنا کەلایەنگری خاوەن بڕوا بوون.

٦. خۆڕاگریی لایەنگرە گیان بەخشەکان، بەشێوەیەك کەبەبێ‌بوونی باوەڕێکی تەواو بەراستی و راستگۆیی سەرکردەکان، ئەم جۆرە گیان بەخشین و فیداکارییە دەستەبەر نابێت.

سەرەتا دێینە سەر باسی یەکەمین راپەڕین پاش مردنی شائیسماعیلی دووهەم، کەلەناوچەی نیشتەجێبوونی عەلەوییەکانی خۆراسانی گەورە لەدەوروبەری قەندەهار، روویداوە ئەمەش کە لەکتێبی (نقاوة الاثار في ذكر الاخبار)ی نەتەنزییەوە وەرمانگرتووە.

## راپەڕین لەخۆراسانو ئەفغانستان (قەندەهار)

پاش ئەوەی کەشائیسماعیل کۆچی دوایی کردو شاە سوڵتان محەممەد لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، هەندێ کەسی (..) یەکێکی (..) یان پەیداکردوەو ئالای دەسەلاتیان هەڵکردو دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی ئەفسانەیەكو گەیاندیانە بەرگوێی هەموو کەسێك لەهەرشوێنێکدا، ئەویش بریتیبوو لەوەی کەشا ئیسماعیل نەمردووەو لەبەر سوودی گشتی کەسێکی هاوشێوەی خۆی لەجێی خۆی خەواندووە خۆی گوم کردووە (!!!)و بەم نزیکانە لەولاتی رۆم یا هیندستان خۆی دەردەخاتەوەو خەڵکێکی زۆر لەخەڵکی رەشۆکە هیچ نەزانەکە باوەڕیان بەم ئەفسانەیە هێنابوو و لەهەر لایێکەوە یەکێك راست دەبوویەوە، کەسانێکی زۆریان لێ کۆدەبوویەوەو دەبوونە هۆی ئاژاوەو شێواندنی باری دڵی خەڵکی هەموو شوێنو ناوچەیەك، کاربەدەستانی ئەو ناوچانەش کەوتبوونە هەوڵی دوورخستنەوەی ئاژاوەی ئەو تاقمانە.

بۆ روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە، دەڵێین یەکەمجار لەویلایەتی سەبزەوارو زەمینی داوەر کەلەناوچە گەرمەکانی ویلایەتی قەندەهارو دەوروبەریەتی، کابرایەك لەجلوبەرگی قەلەندەریدا، خۆی بۆ خەڵکەکەی ئەوێ دەرخستو لافی ئەوەی لێدەدا کەئەو شائیسماعیلەو ئارەزووی ئەوەی

هەیە بچێتە هیندستان و بەچاوی خۆی ئەو وڵاتە ببینێ و دیارە بەجلوبەرگی پاشایەتییەوە ئەو ئاواتە نایەتەدی. بەم هۆیەوە لەم جلوبەرگی دەروێشیەدا، دەمەوێ بەم ئاواتە بگەم.

ئەم ئەفسانەیە لەمێشکی هەندێ کەسی ئەو ناوچەیەدا جێگیربوو بوو. کۆمەڵێك لە(هەزارە)و (نکودەری)یەکان، بەخەیاڵی فەرمانڕەوایی و گەورەییەوە کۆبوونەوە لێی، دەستیان کرد بەکاری ناشایستەو نارەوا. یەکێك لەکاربەدەستەکانی ئەو ناوچەیە بەیارمەتی و کۆمەکی شازادەی ناودار (بەهرام میرزا) کەفەرمانڕەوای قەندەهارو ئەو ناوچەیە بوو، لەشکرکێشی کردە سەری، پاش کەمێك قەلەندەر کوژراو کەللەسەرەکەیان لێکردەوەو ناردیان بۆ دەرباری شا.{نقاوة الاثار في ذكر الاخبار / محمود بن هدايت الله،ص١١٣-١١٤}

وەك ئاگاداری خێڵەکانی هەزارەو نکودەری لەئەفغانستان و خۆراسانی گەورەدا بەناوبانگ بوون لەپەیڕەویکردنی ڕێبازی عەلەویدا. ڕابەرایەتی قەلەندەرو خەیاڵی گەشت بۆ هیندو ڕۆم و بیروباوەڕی خەڵك بەرامبەر بەو، هەمووی نیشانەی چۆنیەتی و ناوەڕۆکی ئەو ڕاپەڕینەیە. عەلەوییە توندرەوەکانی ئەفغانستان ئێستا زیاتر لەباکووری ئەو وڵاتەدا دەژین، لەژێر سەرکردایەتی سەیید مەنسووری نادریدا.

ڕاپەڕینی دووهەمی عەلەوییەکان ئەوەی ناوچەی چوار مەحاڵی بەختیاری و خوزستانە کەئەسفەهان و فارسیش (شیراز) دەگرێتەوە بە لەبەرچاوگرتنی ڕابردووی عەلەوییە توندرەوەکان لەو ناوچانەدا. ئەم بزووتنەوەیە لەمێژووی سەفەوییەکاندا، بەلێکچوونێکی تەواوەوە لەگەڵ ڕاپەڕینی پێشووی قەندەهار، بەسەرهەڵدان و دەرکەوتنی شا ئیسماعیلی (ساختە) ناوبانگی دەرکردووە. چاوگێڕانێك بەپێکهاتەو دروستبوونی ئەم

ڕاپەڕینەو ئەو ناوچەیەی تێیدا بڵاوبوونەتەوەو ڕابەرییەتیەکەی، بۆ ئەو کەسەی ئاگاداری‌و زانیارییەکی کەمیشی هەبێت لەگەڵ بزووتنەوەو شێوازی عەلەوییەکاندا، بەتەواوی ڕوونی ئەکاتەوە کەئەم بزووتنەوەیە پەیوەندیی بەعەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەقەوە هەیەو هۆی هاندان‌و ئارەزووی خەڵك‌و هەواداران بۆ پەیوەندی بەڕاپەڕیوەکانەوە، مەسەلەی شا ئیسماعیلی دووهەم نەبووە، چونکە بەلەبەرچاوگرتنی ئەو زانیارییانەی لەبەردەستدایە، دەربارەی ڕەوشت‌و هەڵسوکەوتی شا ئیسماعیل لەگەڵ خەڵکداو بۆچوونی عەلەوییەکان‌و خەڵکی‌تر لەئامانج‌و کردەوەکانی ئەو، بەگوێرەی ئەوەی مێژوونووسە سەفەوییەکان باسیان کردووە، بەهیچ شێوەیەك ڕێی تێ‌ناچێ کەسێك بەبێ ئەوەی دەسەڵات‌و پشتیوان‌و پلەو پایەیەکی هەبێ، هەر لەگەڵ خۆدەرخستنیدا، خۆی بکا بە شا ئیسماعیل‌و، لەهەموو لایەکەوە خەڵك ڕووی تێبکەن‌و یارمەتی بدەن‌و تا گیانیان تیابێ بیپارێزن. بەڵام مەبەستی مێژوونووسەکانی سەفەوی، ئەوەی کەئاشکرایەو لەوە زیاتر نییە، ئەوەیە کەدەیانەوێ سەرنجی خەڵك ڕاکێشن بۆلای سەفەوییەکان‌و بیروباوەڕی خەڵك بەرامبەر خوێنرێژترین کەس لەوانە، بەپێچەوانەو هەڵگەڕاوی‌و ئاوەژوو کراوی بخەنە پێش چاوی خەڵك، لەحاڵێکدا کەئەو نیشانەو بەڵگانەی لەبەردەستدان، وەك پەیوەندیی ئەم بزووتنەوەیە لەگەڵ سەرکردەکانی‌تری عەلەوییە توندڕەوەکاندا، ناوەڕۆکی ئەم ڕاپەڕینەمان بۆ دەردەخات، چونکە (ئەحمەدی کیسرەوی) دەربارەی پەیوەندیی سەرکردەی ڕاپەڕینەکە، لەگەڵ موشەعشیعییەکانی خوزستاندا دەڵێ (لەئەنجامی ئەم سەرکەوتنانەدا، ناوبانگی قەلەندەر ئەگاتە هەموو شوێنێك‌و خەڵك هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەو دەدەن‌و ئەویش

لە(دێهدەشت کوهکیلویە) کەلەژێر چنگی ئەفشارەکان دەریهێنابوو، پشت ئەستوور لێی دانیشتبوو و سەرقاڵی فەرمانڕەوایی بوو. بەقسەی ئەسکەندەر بەگی مێژوونووس : لەنێوان ئەوو (شاقەلەندەر) لەگەڵ سەید سەجادو خەڵکی شوشتەرو دزفولدا (موشەعشیعییەکانی خوزستان) جۆرە ڕێکەوتنێك هەبووە، ئەویش لەوەوە هاتووە، کاتێك دەبینێ لوڕەکان لالوتن لێی، دێتە خوزستانو لەشوشتەرو دزفولدا نیشتەجێ دەبێو داوای یارمەتی لەسەید سەجاد دەکات، بەڵام لەم وسەروبەندەدا، ڕووداوێکی تر دێتە پێشەوە کەوای لێدەکا پێویستی بەوو بەکەسانیتر نەمێنێ، ئەوەش بەم جۆرەیە: کاتێك کەناوبانگو سەرهەڵدانی ئەوو کوژارنی ڕۆستەم و ئەفشارەکان بەدەستی لوڕ دەگاتە دەرباری سەفەوی، خەلیل خان خێرا بەرەو کوەکیلویە دەکەوێتە ڕێ، تاخۆی چارەسەری کێشەکە بکات، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ بەدەستی لوڕەکان کوژرا، لێرەوە جارێکیتر کاروباری (شا قەلەندەر) برەوی پەیداکردەوە. لوڕەکان بەلایەنگیری کردن لەو، دەستیان کرد بەجموجوڵو ئەویش لەیارمەتی سەید سەجاد بێنیازبوو، هاتەوە دێهدەشتو بەدڵنیاییەوە لێی دانیشت. {تاریخ ٥٠٠ سالە خوزستان ص٥٤} {عالم آرای عباسی،ج١،ص٢٧٣} ئێستاش چۆنیەتی بزووتنەوەو ڕاپەرینەکەی لەقسەی مێژوونووسو خاوەنی (نقاوة الاثار)ەوە دەگێڕینەوە.

## راپەرینی شا قەلەندەری لوڕ لەچوار مەحاڵو خوزستانو

... لەساڵی ٩٨٦ی کۆچیدا، لەسنووری ناوچەی (کوەکیلویە) دەروێشێك پەیدابوو، وەك بەزمی دەروێشەکەی پێشتر دەیگوت (من شائیسماعیلم)و چەند ئاراستەی ئەو خەڵکەی کردو هەندێك لەوانە باوەڕێکی تەواویان پەیداکرد کەراست دەکاو جەماوەرێکی زۆر لەلوڕو خلج و سەحرانشینەکان دوای کەوتن و ڕێگای گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری ئەویان گرتەبەرو لەرووی باوەڕەوە ملیان دایە بەر بەجێگەیاندنی ئەو ئەرك و فەرمانەی پێیان دەسپێردرا، لەگوندێکی ئەو ناوەچەیە کەپێیان دەگوت (ئارەند)کە کەوتووەتە نێوان شاخێکەوە لەشاخە بەرزەکانی ئەلبرزەوە.

ئەو گوندە دوو ڕێگای هەیە کەسوار بەزەحمەت دەتوانێ بەو ڕێگایەدا گوزەر بکا، لەهەر کام لەو دووڕێیەدا، ئەگەر سێ تیرهاوێژو تفەنگچی دانیشن، باڵندەش ناتوانێ بەوێدا تێپەڕببێت. ئەو قەلەندەرە لەو شوێنەدا کۆچ و باری خست و ئالای سەربەخۆیی و سەرکەوتووی خۆی هەڵکردبوو، پێنج شەش جار کاربەدەستانی ئەو سنوورە، بەسوپایەکی بێشومارەوە کەوتبوونە شەڕ لەگەڵیداو لەبەرئەوەی شوێنەکەی زۆر سەخت بوو، دەستیان پێنەگەیشتبوو، کاتێك مەسەلەکە بەم شێوەیە کەوتە بەرگوێی، شا فەرمانی دەرکرد کەئەمارەتی پەناە ئەسلان سوڵتان لەگەڵ (ئەرشلو)کان و دامودەزگای عەلی بەگی سۆق ڕۆملۆ لەئەسفەهان و خەلیل خانی ئەفشار، لەگەڵ سوپای کوەکیلویە بەرێککەوتن لەگەڵ یەکدا لەشکر بەرن بۆ ئەو ناوچەیەو قەلەندەر لەو ناوە دەربکەن. بەڵام لەبەرئەوەی بەشی زۆری خەڵکەکە لایەنگری قەلەندەر بوون، لوڕەکان لەشاخەکەدا بڵاوەیان لێکردو

خەلیل خانیش کەلەگەڵ لەشکرەکەی خۆیدا سەرکەوتنە سەر شاخەکە، هەرکامیان لەپشتی بەردێکەوە سەریان دەربهێنایە، لوڕەکان بەتیروتفەنگ لێیان ئەدان و لەو شاخەدا لەماوەیەکی کەمدا کوشتارێکی زۆر کرا:

شد از بس که افتاد ازآن کشته ها　　در آن کوه از کشته‌ها، پشته‌ها

هر آنکس کەبرکرد (از) آن کوه سر　　بزخم خدنگی فتاد از کمـــــر

لەکۆتاییدا وێنەی سەرکەوتن لەئاوێنەی بەختی قەلەندەردا دەرکەوت. خەلیل خان لەگەڵ سەرکردەکانی سوپاکەیدا کوژران. ئەسلان سوڵتان و عەلی بەگی سۆفی شکان و ژیانی خۆیان وەك رزگارکردو لەخواری کێوەکەدا جڵەوی وڵاخەکانیان وەرگێڕا بەرەو ئەسفەهان و خۆیان لەو بەڵا کوشندەیە رزگارکرد.

قەلەندەر بەسوپاو لەشکرەکەی خۆی، ئۆردوەکەی خەلیل خانی تالآن کرد، هەموو کەل وپەل و تەپڵ و ئاڵاو وڵاخ و شتومەکی خان هەبوو کەوتە دەستی، هەروا کەلوپەلێکی زۆریش کەوتە دەست خلج و لوڕەکان، پاش ئەوە قەلەندەر هێزو توانایەکی تەواوی پەیداکردو ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکردو تەپڵی شاهانە لێدراو، خەڵکی ناوی شایان لێناو لەناویاندا بەشا قەلەندەر ناوی دەرکرد، بەڵام خەڵکی ئەو وڵاتە بەلایانەوە وابوو کەئەو شائیسماعیلەو ناوی شائیسماعیلی پیاوکوژیان لێنا (!!؟؟). دوای ئەم سەرکەوتنە، رۆژ بەرۆژ بەسەر پەیژەی سەرکەوتندا بەرز دەبوویەوەو ئەوپەری سەرکەوتنی بەدەستهێناو گەلێك لەخەڵکی عیراق و فارس و تورك و تاجیك، لەدوورونزیك و خاوەن شمشێرو قەڵەمەکان و خاوەن رەوە ئەسپ و دەسوپێوەنددار بوون بەخاوەنی پلەو پایەی گونجاو، ئەویش لەو شوێنەوە هاتە دەدەشت کەپایتەختی ئەو ویلایەتە بوو، لەوێ لەسەر تەختی پاشایەتی پاڵی دایەوەو فەرمانەکانی خۆی رەوانەی هەموو لایەکی ئەو

ناوچەیە کردو مۆری فەرمانەکانیشی ناوی ئەبولموزەفەر شا ئیسماعیلی قاتلی لێ هەڵکەندرابوو. جارێکیتر روستەم بەگو مەحمود بەگی کوڕانی خەلیل خان بەلەشکرێکی زۆرەوە، هێرشیان کردە سەری، لەئەنجامدا روستەم بەگ کوژراو مەحمود بەگ بەهەموو توانایێکی خۆیەوە لەگێژاوی مردن خۆی رزگارکرد، بەڵام لەخەفەتو پەژارەدا تووشی نەخۆشییەکی گران بوو، نەیتوانی خۆی لێ دەرباز بکاو هەر بەزرێی بەرو خودەی سەریەوە گیانی لەدەستداو شا قەلەندەریش هەر لەناوچەی فارسەوە تا سنووری شوشتەرو دیزفول، هەمووی خستە ژێر دەستی خۆیەوەو دەرگای سەروەریو مسکین پەروەری خستە سەر پشتو بەتەواوی دەسەڵاتو سەربەخۆییەوە پاڵی دایەوە، لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی و دەستی کرد بەگەرمکردنی کۆڕی رابواردنو ئامادەکردنی هۆی شادمانیو کامەرانیو بەگوێرەی ئارەزووی خۆی کاتی بەسەر ئەبردو تاماوەیەکی زۆر کەس نەبووە رێگر لەبەردەمیدایە، ئەویش بەو ناوچەیەی ژێردەستی رازی بوو و نزیکەی شەش حەوت ساڵ، بە کامەرانیو ئاسوودەیی بردیە سەر.

لەئەنجامدا، شازادەی دلێر سوڵتان حەمزە میرزا، ئەسکەندەر بەگی ئەفشاری لەتەختی دەسەڵات نزیك کردەوە کە لەخزمە نزیکەکانی خەلیل خان بووو لاوێکی لێهاتوو سەردارێکی کارامە بوو لە بەسەرکردنەوەیەکی شایاندا، پلەو پایەی بەرزکردەوەو نازناوی خانی پێبەخشیو فەرمانی فەرمانڕەواییو سەڵتەنەتی کوەکیلویەو گەورەیی ئالوسەکانو دانیشتوانیتری ئەو ناوچەیە لەئەفشارەکانو ئەوانیتر بەناوی ئەوەوە دەرکردو فەرمانی بۆ دەرکرد کەئەرکی بەرەنگاربوونەوەو لەگەڵ شا قەلەندەر بکەوێتە ئەستۆی ئەو. لەگەڵ ئەوەشدا فەرمان دەرکرا بۆ کاربەدەستو

فـــەرمانڕەوایانی ناوچـــەی فـــارس‌و دەوروبـــەری کەیارمـــەتی‌و کۆمـــەك بەئەسکەندەرخان بکـەن. ئەسـکەندەرخان بەئامادەییەکی تـەواوەوە لەگـەڵ سوپاکەیدا، ئاڵای رووبەڕووبوونەوەی بەرزکردەوەو بەرەو شـەڕکردن لەگەڵ شا قەلـەندەردا کەوتـەڕێ، پاش گەیشتنی سوپای خۆڕاگر بـۆ ناوچـەی دە دەشـت‌و ئـەو سنووره، شـا قەلـەندەر لەگەڵ سوپا لـەژمارە نەهاتووەکـەیدا، بەرەو پـیریی چوو و شمشـێر بەدەسـتەوە کەوتنـە یـەك‌و خـاکوخۆڵی ئـەو دەشتەیان لەخوێندا کرد بەقوڕ:

| | |
|---|---|
| جهان شد زخون همچو دیاری آب | بروکاسهٔ سـر بەشـکل حـــباب |
| دلیران جـــــنگی در آن بحر خون | همه گشته چون عکس خود سرنگون |
| زپس کشــــته افتاد بر یکدیگر | بر آورد کـــوهی از آن بحـــر ســـر |

ئەو ناوە لەخوێندا وەك دەریای لێهات‌و کەللەسەر لەسەر خوێن وەك بڵقی سەر ئاوی لێهات‌و پاڵەوانانی شەڕ لەو دەریـای خوێنـەدا هـەموو وەك وێنـەی نـاو ئـاو سەرەوخواربوونەوە، ئەوەندە لاشە کەوتبوو بەسەریەکدا کێوێکی لێ پەیدابووبوو.

لەکۆتاییدا شنەبای سەرکەوتن هەڵیکرد، بەسەر ئاڵای خانی ئەسـکەندەر رەوشـتداو شکسـتی روویکـردە سـوپاکەی شــاقەلەندەرو ناچـاری کـرد هـەڵبێت‌و شیرازەی کۆمەڵەکەشی پچڕاو هـەر کام لەوانە لەکەناری مـەرگ‌و نەماندا، پاڵیـان دایـەوەو قەلـەندەر خۆی‌و هـەردوو کوڕەکـەی لەگـەڵ کەسـە نزیکە ناودارەکانیدا، دەستگیرکران‌و هەرچی ماڵ‌و حـاڵ‌و دارایـی‌و خێزانی بـوو، کەوتـە دەسـت سـوپای سـەرکەوتووی. ئەسـکەندەرخان، قەلـەندەری لەگەڵ ئەسیرو دیلەکاندا کۆت‌و بەندکردو ناردنی بۆ دەرباری شاو بەگوێرەی فەرمانی ئـەو، سـەریان لەلاشـەیان جیاکرایـەوەو هەڵواسـران، تاببنـە پـەندو عیبرەت‌و خەرمانی ژیانیان درا بەدەم باوە (نقاوة الاثارص١١٧- ١٢٠)

ئەوەی کەلەنووسینەکەی خاوەنی (نقاوە الاثار)ەوە دەست دەکەوێ، ئەوەیە کەپاش سەرکەوتن و سەربەخۆیی، رابەری راپەڕینەکە بەشاقەلەندەر ناوبانگ پەیدا دەکاو ئاشکرایە کەناوی (شائیسماعیلی پیاوکوژ) کەلێی نراوە بەهۆی دوژمنەکانیەوە بووەو، هیچ عەقلێکی تەواو ئەوە قبوڵ ناکات، سەرکردەی راپەڕینێك هەرچەند بێئاگاو نەزان و کاڵفام بێت کە هیچ کاتێك شاقەلەندەر وانەبووە، کەدەسەڵات دەگرێتە دەست، فەرمانەکانی خۆی بەنازناوی پیاوکوژەوە مۆربکا؟!! هەر خودی ئەم تۆمەتە ناڕەوایانە، ئاشکرای دەکا کەشتێکی راست نییە.

بەپێی ئەوەی کەرابوورد، بەئەگەرێکی زۆر نزیك لەراستەوە، شاقەلەندەر لەکەسایەتییە عەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەق بووە، بەڵام شۆڕشگێڕی ناوچەی دینەوەرو هەمدان، کەئێستا دێینەسەری، راپۆرتی زوننور قەلەندەرە:

## راپەڕین‌و سەرهەڵدان لەدینەوەرو هەمەدان

(... پاش ماوەیەك لەناوچەکانی هەمەدان‌و ئەوناوە (*) یەکێکی‌تر پەیدا بوو، هەمان ئەو قسانە دەکات کە من شائیسماعیلم‌و لەرۆمەوە هاتووم بۆ ئەوە رۆیشتبووم کەبارودۆخی تایبەت‌و ئەوەی پەیوەندیی هەبێ بەو ولاتەوە، لێی شارەزابم‌و رێگەی داگیرکردنی ئەو ولاتە دابنێم! هەندێ لەخەڵکی ناوچەکە، باوەڕیان کرد بەم قسانەو بەباوەڕی تەواوەوە ملکەچی بوون‌و کەوتنە دوای‌و لەماوەی یەك دوو مانگدا، خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوەو، هێزێکی تەواوی پەیداکرد، بەشی زۆری میرو کاربەدەستەکانی ئەوسنوورە کەوتنە دوو دڵییەوە، هەندێکیان لەبەر بەرژەوەندی‌و هەندێکیش لەرووی خۆشەویستییەوە، رێگای دواکەوتنی ئەویان هەڵبژارد. کاتێ ئەم هەواڵە بەر گوێی (سولاق حسێن تەکلو) کەوت، کەفەرمانڕەوای ناوچەی چەمچەماڵ‌و ئەو دەوروبەرە بوو، بەقووڵی بیری لێکردەوەو لەدڵی خۆیدا کەوتە لێکدانەوەی بارودۆخەکە. یەکێك لەوانەی کەنزیك بوون لێیەوەو شائیسماعیلشی بەچاکی دەناسی نارد بۆ لێکۆڵینەوە لەم مەسەلەیە. ئەو کەسەش لەشێوەی موریدو پەیڕەوێکدا خۆی لەشائیسماعیل نزیك کردەوەو بەوردی سەرنجێکی تەواوی بارودۆخەکەیداو لێی کۆڵییەوەو لەئەنجامدا بۆی دەرکەوت کەئەوە شائیسماعیل نییە{...}؟!

ئەو کەسەی ئەم ئەرکەی پێ سپێردرابوو گەڕایەوە، سولاق حسێنی لەراستیی مەسەلەکە ئاگادارکردەوە، سولاق کەوتە دەریای تێفکرین‌و بیرکردنەوەو زانی کە بە لەشکرکێشی‌و شەڕ ناتوانێ بگاتە مەبەستی خۆی، بۆیە ناچار بوو بەگوێرەی بارودۆخەکە دەستی بەکارکردن کرد. لەسەرەتادا

گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆی دەربڕی و یەکێك لەباوەڕپێکراوەکانی خۆی بەدیاری و سەوقاتێکی شایستەوە، لەگەڵ نامەیەکدا کەناوەڕۆکەکەی باسی غولامی و دڵسۆزی و لەخزمەتبووندای تێدابوو، بۆی ناردو خۆیشی لەگەڵ سوپاو لەشکرێکی پۆشتەو پەرداخدا، بەدوایدا ڕۆیشت. لەبەرئەوەی لەوکاتەدا، بەشی زۆری ئۆردووی گەورە لەسەر سنووری قەرەباغ و ئەو ناوە بوو، دەبوا سولاق حسێن پەنا بەرێتە بەر فرِوفێڵێکی وەها.

بەکورتی پەیڕەویی سولاق حسێن بۆ ئەو کەسەی خۆی ناونابوو شا ئیسماعیل کاریگەریی هەبوو لە سەری و بڕیاریدا خۆی بەسوڵتان دابنێ و سەربەخۆیی خۆی ڕابگەیەنێ، تەپڵی سەرکەوتنی لێداو سولاق حسێن پاشان چووە لای و پاش بەجێهێنانی ڕێ و ڕەسمی ئاسایی، داوایکرد کەبکرێ بەگەورەی ئێشککگرەکانی تایبەتی خۆی، داواکەی پەسەندکراو ئەویش دارێکی خستە بن دەستی و لەبەرامبەریا ڕاوەستاو بەشێوەیەکی تەواو ڕێورەسمی بەجێهێنا کەکەس لەتوانایدا نەبوو و بەجۆرێك هەوڵی ڕێزلێگرتنیدا کەهەموو ئامادەبووان و تەنانەت خۆیشی باوەری کردبوو کەبەڕاستی شائیسماعیلە، بەهۆی ئەوەشەوە کەسولاق حسێن دوای کەوتبوو، هەموو کاربەدەستان و گەورەپیاوانی ناوچەکە ملکەچی بوون و ئەوەندە سوپای کۆکردەوە کەئەگەر بیویستایە قەزوین داگیربکات، بەئاسانی بۆی دەکرا. ئەم دەنگوباسی بەهێزبوونەی بەهەموو لایەکدا بڵاوبوویەوەو گەیشتە بەرگوێی پاشا خۆیشی و لەبەرئەوەی شاو سەرداروو گەورەپیاوانی دەوڵەتی هەمیشە ڕاوەستاوو بەردەوام دڵنیابوون لەئارامی ناوچەی قەرەباغ کەژاوەی شا ڕووی کردەوە بەرەو پایتەخت.

لەوکاتەدا کەسولاق حسێن لەگەڵ شائیسماعیلدابوو، پەیوەندیی کرد بەچەند کەسێکەوە کەزۆر لێوەی نزیك بوون و هەریەکەیانی بەجۆرێك

(دڵکرمێ) کرد، بەرامبەر بەشائیسماعیل و هێنانیە سەر بیروڕای خۆیو باسی ئەوەشی بۆکردن کەنیازی هەیە بیگرێ. هەر لەوکاتەدا کەکەژاوەی دەربار گەیشتە نزیك قەزوین، سولاق حسێن بەهەلی زانی بەرێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کەپەیوەندیی پێوەکردبوون، شائیسماعیلیان گرت و کۆتیان کردە دەست و گەردەنیو لەگەڵ چەند کەسێکی نزیك و باوەڕپێکراودا رەوانەی دەربارىیان کردو کەخۆیشی گەیشتە نزیك پایتەخت، لەسەر فەرمانی شا خەڵاتێك دیاریکرا بۆی کە بریتیبوو لە عەبایەك دیوی ناوەوەی لە قامیش و نەیجەو حەسیربوو ناواخنەکەشی باروت بوو، پاشان بەمۆسیقاو گۆرانیو ئاوازی گونجاوو سروود وتنەوە، چوونە پێشەوەو سواریان کردو ئەمان پێشی کەوتن و بەهات و هاوارو بەرێز لێگرتن گەیاندیانە قەزوین و کردیان بەدارداو ئینجا سووتاندیان، چی خەڵاتی بەنرخ و شتی نایابی هەبوو هەموو نێردرا بۆ سولاق حسێن و سەردەمی سەربەزی بەرەو ئاوابوون رۆیشت:

| | |
|---|---|
| جهان سربسر فتنه است | بر اوضاع او نیست هیچ اعتماد |
| بهر گوشه زین دار ناپایدار | یکی گشته سر(کرده) روزگار |
| سر افراخته ازپی سروری | بود در سرش آرزوی سری... |
| شود دیگری را همین آرزو | کەخود رابزودی رساند براو |

واتە:

جیهان سەرانسەر ئاشوب و گەندەڵییەو پشت بەو نابەسترێت

لەهەر کونج و کەنارێکدا رۆژگار کەسێکی کردووە بە سەرکردە

هەموو تینووی سەروەرین و لەکەللەیاندا ئارەزووی سەردەکەن

خەڵکی تریش هەمان ئارەزوو دەکەن کەخێرا خۆیان بگەیەنن بەو

(نقاوة الاثار، ص١١٤-١١٧)

بەدوای یەکدا هاتنە پەیوەندی بە(فضل)ی حوروفیو مەحمودی پەسیخانییەوە هەیە، نەك فەزڵ سوڵتان مەحمود.

دووهەم: وەك لەسەرەوە باسکرا، سوڵتان مەحموود بەهیچ هاوکێشەیەك ناتوانێ پەیوەندیی هەبێ بەراپەڕینی عەلەوییەکانەوە.

سێهەم: پەیوەندیی مەحمود پەسیخانیگەیلانیو دەروێشەکانی بەخاکی هیندوستانەوە، لەرۆژی رووناك ئاشکراترە. روونکردنەوەی ئەم خاڵەش، یەکێکیترە لەو بابەتە مێژووییانەی عەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەق کە ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی بەڵگەدار بکەوێتە بەردەست، پەی بەراستی مەسەلەکە دەبەین.

# ڕاپەڕینی نوقتەوییەکان،
# لەسەردەمی شاعەباسی سەفەویدا
# ٩٩٦ ـ ١٠٣٨ی کۆچی

لە نووسراوەکاندا، شاعەباسی سەفەوی (٩٩٦ - ١٠٣٨ی کۆچی) لە ئاستێکی کەمتر لەبابایادگار ئەژمار دەکەن و زۆربەیان بنەماڵەی عەجەم بەدەروێشی خاکی و سادەی ئەو دەزانن، لەبواری دەسەڵاتی رووکەش و دەروون و خەبات و ململانێکانی ئەودا، داستانگەلێ دەگێڕنەوە، کەلێرەدا دەرفەتی باسکردن و روونکردنەوەو تاوتوێکردنیان نییە.

لەباسکردنی راپەرینی نوقتەوییەکان لەسەردەمی شاعەباسی سەفەویدا، نووسەری (نقاوة الاثار) بەدووروودرێژی باس لەسەرەتاکانی ئەم جۆرە بزاوت و راپەرینە کۆمەڵایەتییانە دەکات و هەر لەپێشەکی باسەکەیدا، ئەوە روونده‌کاتەوە کەلەسەردەمی سەفەوییەکانیشدا، هەروەکو ئەوەی لەسەرەتای بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەی پێکراوە، سەرچاوەی ئایینی عەلەوییەکان، بەر لەئیسلام دەگێڕێتەوە بۆ ئایینی خوورەم و مەزدەکییەکان و .. پەیوەندیی بەراپەرینی لێکچووەکانی ترەوە جێگەی سەرسووڕمان و بایەخ پێدانە، هەروەکو دەنووسێت:

(... هەر لەسەرەتای دروستبوونی مرۆڤ و تاکۆتایی، لەنێوان شەیتان و فەرزەندانی ئادەم و لایەنگران و نەوەکانی، دوژمنایەتی و رکابەرایەتی بەرپاو جێگیرەو ئاسەواری ئەم ئاکارە، تا رۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت، بەپێی (لاغوینهم اجمعین) شەیتان لەگەڵ هەوادارانی، لەهەر شوێن و کاتێکدا، سەرقاڵی گومڕاکردنی تاقمێك لەخەڵکی رەشۆك دەبن و بازاری خراپەکاری و گەندەڵکاری و ئاشووب گەرم دەکەن و خەڵکی لەرێگەی راست و ئایین بەرەو

کـەندەلانی گومڕایـی دەبـەن، هـەروەکو لەسـەدەکانی رابـردووداو لەهـەموو سـەردەمەکاندا، یـەکێکیان لەهـەندێ ناوچـەدا، خـەڵکی فریـودەدات، دەرگاکانی ( ) بەرووی خەڵکدا ئاوەڵا دەکات و لەرێگەی جادوو ئەفسانەوە، سـەرقاڵی کـاری بێـهودەیان دەکـات. هـەروەکو لەسـەدەکانی رابـردوودا، لەدەڤەری چین، مانی نیگارکێش، کەلەهونەری نیگارکێشان و وێنەسازیدا، لەو ناوچەیەدا دەستێکی بالای هەبوو، ئەم سیفەتەی گەیاندبووە ئاستێك کەشارەزایانی ئەم هونەرەی تووشی سەرسامی و ناتوانایی کردبوو، ئەو وردەکاری و ئەو هونەرانەی کرد بە فەرجووی خۆی و داوای پێغەمبەرایەتی کردو، یەکێك لەکارە موعجیزەکانی ئەوەبوو کەلەسەر زەوییەکی راستدا، بەپەنجە بازنەیەکی دەکێشاو کە تیرەکەی (١٠) گەز بوو و لـەکاتی ئەسپ سواریدا، رمی نەیزەکەی لەچەقی بازنەکە دەچەقاندو ئەستێلێکی پڕ لەئاوی بەرجەستە دەکرد، ئەگەر کەسێ دەستی تێنەخستایە، نـەیدەزانی کـەئاو نییەو گەلێجار گۆزە دەشکا، چونکـەی خەڵکەکـە بـەنیازی ئـاو هـەڵگوزین گۆزەکـەیان دەخستە ناویـەوەو دواتـر وێنـەی سـەگێکی تۆپیـوی لەسـەر رووکەشـی ئاوەکـە دەکێشـا، کەهـەندێ بەمەبەستی ئـاو هـەڵگۆزین نزیـك دەبوونـەوەو کەئـەو وێنەیـەیان دەبینـی، سـڵیان دەکـردەوەو دەگەڕانـەوەو دەیـانگوت سەگێك لـەناو ئاوەکـەدا تۆپیوەو دواتـر خـەڵکانێکی زۆری لـە(..) بـەرەو ئاییـنی خـۆی راکێشـاو ژمارەیـان لـەزۆربووندابوو، بەهـەندێ لەوانـەی لێیـەوە نزیك بوون دەگوت کەڕوو لەئاسمانەکان دەکـات و دوای یـەك سـاڵ دەگەڕێتـەوە، لەدامەنـەی فلانـە شاخدا داوام بکـەن، تـاوەکو کتێبەکـەتان بـۆ بهێنم و تاقمێکی لەو چیایەدا پەیداکردو هێزو توانای یەکساڵەی وردە وردە پەلکێشـی ئـەو شـوێنەکردو ئـەوێی بەجێهێشـت و لـەم یەکسـاڵەدا، وێنـەی

بوونەرانی ئاسمانیو زەوی، لەجۆری مرۆڤو ئاژەلانی، لەسەر تۆمارێك دەکێشا، دوای ساڵێك لەناو ئەو تاقمە دەهاتە دەرەوەو خۆی بەخەڵکی ناساندو ئەو تۆمارەی دەخستە بەردەم خەڵکیو دەیگوت، خواوەندی گەورە لەبری ئەوە، کتێبی بەمن داو روخساری بوونەرانی نیشانم داو راستیو چۆنیەتی هەموو ئەوانەی لەو تۆمارە دابوون،و زانیاری تەواوی پێبەخشیمو بەم جۆرە، زۆربەی وڵاتی تورکستان، کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ئەوەوەو لەو دەڤەرەدا کاروباری روو لەباشی بوو، رۆژ بەرۆژ هێزو دەسەڵاتی فراوانتر دەبوو، تا ئەوەی سەرجەم پیاوماقوڵو دانیشتوانی ئەو دەڤەرەی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

دواتر، رووی لەناوچەکانی ئێران کردو لەو رۆژگارەدا، پاشای سەر بەخێر فەیروزی کوڕی بەهرامی ئەشکانی کەلەزنجیرەی سێهەمی پاشاکانی عەجەم بوو، بەشەهریاری ناوچەکانی عەجەمو هەندێك پێیان وایە، دەرچوونی مانی لەسەردەمی پاشای خۆشەویست شاپور (ذوالاكتاف)دابوو. دوای ئەوەی مانی لەسەرجەم ناوچەکانی ئێراندا ناوی دەرکردو گەلێ لەدانیشتوانی ئەو ناوچانە پەیوەست بوون بەئاییینەکەی کەبووە هۆی گەندەڵبوونی کاروباری وڵات، شەهریار فەیروز، داوای ئامادەکردنی کردو هەموو زانایانو پیاوە ئایینەکانی کۆکردەوەو کۆبوونەوەی پێکردنو بڕیاریدا کەئەوانە لەگەڵ مانیدا بکەونە گفتوگۆو پاش مشتومڕێکی زۆرو بەڵگە هێنانەوەی هەردوولا، پیاوە ئایینییەکانی عەجەم توانیان مانی بۆڕ بدەنو بیخەنە کەنەلانی بێدەنگییەوە، پاش ئەوەی مانی پەکی کەوتو نەیتوانی وەڵامی زاناکان بداتەوە، شا فەرەیدوون ئیشارەتی کرد بەئەشکەنجەو ئازارو کوشتیانو کەوڵیان کردو پێستەکەیان

پڕ کرد لەکاو بەهەموو لایەکی ولاتدا گەڕاندیان و لەئەنجامیشدا لاشەکەیان بەئاگر سووتاند. هەروەها لەسەردەمی ساسانییەکاندا کەچینی چوارەمن لەسوڵتانەکانی عەجەم، لەبارەگای قوبادی باوکی نەوشیروانی دادپەروەردا، کابرایەکی مەزدەك ناو پەیدابوو، خەڵکێکی زۆری گومڕاکردو تاماوەیەکی زۆر خەڵك نەیدەزانی ئەگەر یەکێك مرد میراتەکەی بۆکێ ئەبێ و لەو رۆژگارەدا خاوەن موڵك چییەو ..)، پاش باسکردنێکی دوورودرێژ دەربارەی مەزدەك و چۆنیەتی سەرهەڵدانی بزووتنەوە سیاسی ئایینییەکەی و گەڕاندنەوەی بۆ سەردەمی سەلجوقییەکان و حەسەن سەباحی ئیسماعیلی. پاشتر دێتە سەر باسی داستانی نوقتەوییەکان و چۆنیەتی سەرهەڵدان و ئاشکرابوونی ئەوان، لەسەردەمی شا تەهماسپی سەفەوی و دواتر لەسەردەمی شاعەباسی سەفەوییدا، بەم شێوەیە (نووسەرەوەی رووداوەکانی رۆژگارو هۆنەرەوەی کارەساتەکانی مانگ و ساڵەکان رووی لاپەڕەکانی زەمانەیان بەم داستانە، بەم شێوەیە رەشکردووەتەوە کەلەرۆژگاری ئاخر خێری دنیاودین پەروەری شای دین پەنا شا تەهماسپ، هەندێ لەنوقتەوییەکان لەدەوروبەری ساوە، قەزوین، ناوچەی کاشان و ئەسفەهان و کوپایەو نائین پەیدابوو بەهەوڵ و کۆششێکی تەواوەوە، دەستی کردە بلاوکردنەوەی پڕوپاگەندەو هەواڵی ئەمانە کەوتە بەر گوێی شا، ئەویش فەرمانی دەرکرد هەندێ کەسی ریزی پێشەوەی ئەو گروپەی گرت، وەك مەحەممەدی قازی بیدگوڵی، مەولانا قاسمی کوپاڵی و چەند کەسێکی‌تر، پاش لێپرسینەوە زنجیرکران و دوای ماوەیەك چاوی هەندێکیانی هەڵکۆڵی و هەندێکیشیانی بەشێوەیەکی توندو تیژ کوشتن و جیهانی لەپیسی ئەمانە پاك کردەوەو پاشماوەکانیان لەکونجی گۆشەگیریدا

مانـەوەو سـەریان شـۆڕکردو کەسـێك لـەم تاقمـە بەدرەوشـتە سـەری بـەرز نەکردوە. تا سەردەمی پیرۆزی شا عەباس کابرایەکی خەسرەو ناو لەقەزوین لەبـەرگی دەروێشـیدا، کونجێکـی بۆخـۆی دیـاری کـردو دەسـتی کـرد بـەدرۆو دەلەسە بڵاوکردنەوەو لەماوەیەکی کەمدا، ناوبانگی دەرکردو خەڵکێکی زۆر لەدوور نزیك لەتورك و تاجیك دەستیان کرد بەهاتوچۆکردن بۆ تەکیەکەی، ئەویش لەگـەڵ هـەر تـاقمێکدا، بەشـێوەیەك کـەگونجاو بێـت کۆدەبوویـەوەو قسـەی بۆ دەکردن، خۆیشـی جلوبـەرگێکی دەروێشـیانەی لەبـەردەکرد، ئیـتر بـەو بۆنەیـەوە بـەدەروێش خەسـرەو ناوبـانگی دەرکـرد، لەگـەڵ هـەر کـەس کەدائەنیشـت بـەزمانێك قسـەی دەکـردو دەکەوتـە باسـی دەروێشـی و گۆشەگیری، لەسەرەتادا نەیدەوێرا باسی شتێك بکا کەپێچەوانەی شەرع بێ، تـا ئـەو کاتـەی کەپـەیڕەوانێکی زۆری لێ کۆبـووەوە، ئـەنجا دەسـتی کـرد بەفریودانی خەڵکی نەفام و باسـکردنی هـەندێ شـتی وا کەلەبازنـەی شـەرع و ڕەوشـت چووبوونـە دەرەوە. ڕۆژ دوای ڕۆژ ناوبـانگی زیـاتر بڵاودەبـۆوە، مەسـەلەی زۆربوونـی موریـدو پـەیڕەوانی بەدرەفتاری ئـەو بـەرگوێی هـەموو کەسـێك کـەوتبوو، ئەمـەش بـەهۆی چـەند کەسـانێکەوە گەیشـتەوە بەشـا، بەرێکـەوت ڕۆژێك شـا ڕێـی کەوتـە ئـەو نـاوەوەو خەسـرەو پێـی زانـی، لـەماڵ هاتـە دەرەوەو بەدوعاو ستایشـکردنێك کەشایسـتەی پلـەو پایـەی شـا بێـت، چوو بەپیرییەوەو بەزمانە لووسەکەی خۆی تکای لێکرد کەگەورەی بکاو لای ئەو دابەزێ، شایش بەهۆی ڕەوشتی پاکی خۆیەوە، داواکەی پەسەند کردو دابەزی و میهرەبانی و سۆزی شـاهانەی لەگـەڵدا نوانـدو بـەرگی سـەربەرزی کردە بەر پلەو پایەی.

پاش ئەوە ناو بەناو بۆ وردبوونەوە لەحاڵی ئەو، دەهاتە تەکیەکەی‌و هەموو جارێك پارەو کەلوپەلێکی باشی بەخەڵات بۆ دەهێناو بەم هۆیەوە بەشێکی زۆر لەکاربەدەستان‌و گەورە پیاوانی دەوڵەت روویان تێکردو ئەویش بەزمانی رەوان‌و قسەی لووس هەموویانی کەمەن کێش کردو کردنی بەموریدو پەیڕەوانی خۆی‌و ئەوانیش خێرو سەدەقەو دیاری گرانبەهایان بۆ دەبردو لەرۆژگارێکی کەمدا، خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوە، زۆری دەروێش‌و پەیڕەوانی‌و کۆمەڵی لەدین وەرگەڕاوەکان گەیشتنە رادەیەك کەزۆربەی کات، نزیکەی دوو سەد کەس لەتەکیەکەی‌و دەوروبەری ئەودا ئامادەبوون‌و چەند کەسێك لەوانە بەهۆی ئەوەوە گەیشتنە پلەو پایەی بەرز، لەنێویاندا (یوسفی) ناوێك کەلەپیشەکەیدا کەبریتی بوو لەدورینی هەگبەی تیر، مامۆستایەکی بێوێنە بوو. شا بەبۆنەی سەرپەرشتی‌کردنی ئەم پیشەیەوەو زۆر میهرەبانی دەنواند لەگەڵیداو هەرکاتێك هەگبەیەکی بۆ تەواو دەکردو بۆی دەبردەوە، شا جۆرەها سۆزو میهرەبانی بەکاردەهێنا بەرامبەری‌و هەندێ جاریش داوای ئەکرد دەچووە لای‌و لەگەڵیدا واقسەی دەکرد کەهاوبیریەتی‌و قسەی لێ‌دەرئەهێنا، ئەویش بیروبۆچوونەکانی خۆی بەتەواوی دەخستە بەردەم شاو لای وابوو کەشای هێناوەتە سەر بیروباوەڕی خۆی‌و کردوویەتی بەیەکێ لەپەیڕەوانی، لەبەرئەوە بەبێ سڵکردنەوە چی لەدڵیا بوو لێی نەدەشاردەوە، بەم هۆیەوە شا ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتێکی ئەو تاقمە بوو و چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەوانی لەلا روون بوویەوەو جڵەوی ئەسپی بیرکردنەوەی بەرەو شیو تاوداو بڕیاری تەواوی دا بەلەبن‌و مێخ هەڵکەندن‌و بڕینەوەی درەختی ئەو تاقمە لەم سەروبەندەدا.. لوڕستان هاتە پێشەوەو دوو سێ رۆژی‌تر بەئەنجام گەیاندنی بڕیارەکە

دواکەوت لەکاتێکدا کە لەڕێگادا بوو و لەبەرئەوەی پێویستی وادەخواست چووە تەکیەو وەك جاران داوای دوعای خێرو هیمەتو بەرەکەتی لێکرد. لەبەرئەوەی ئەو (پێشەوا)یە لەگەڵ یوسفیدا بەرێکەوت چییان لەدڵدابوو بوو بەشایان گوتبوو، بەخەیاڵی چەوتی خۆیان وایان دەزانی کەشا هاوبیریانە لەمەسەلەکەدا، بەپشت بەستن بەو بۆچوونە، بەشای راگەیاند کەئەگەر بڕیاری داوە بچێ بۆ لوڕستانو پەشیمان بوونەوە لەو بڕیارە لەبەرژەوەندیی کاروباری وڵاتدا نییە، ئەوا بەڵکو هەوڵ بدا دوو سێ رۆژ، پێش هاتنی مانگی مەحەرەمی ساڵی ١٠٠٢ بگەڕێتەوە بۆ بارەگای سەڵتەنەت لەقەزوین، چونکە بەهاتنی ئەو ساڵە یەکێك لەکەسایەتیە پایەدارە ئایینیەکان ئەگاتە پلەو پایەی پاشایەتی، واتە یەکێك لەدەروێشەکانی ئێمە دەبێ بەخاوەنی دەسەڵاتو جڵەوی ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات ئەکەوێتە دەستی خاوەن توانای ئەو، وا مانگی مەحەرەمیشمان لێ نزیك دەبێتەوە، و لەبەرئەوەی کەسێکی فریشتە رەوشتی وەك شا ئامادەیی زیاتر تێدایە، لەوانەی کەخۆیان حازرکردووە بۆ ئەم کارە، لەگەڵ ئەوەشدا کەرشتەی کاروباری سەڵتەنەت، لەدەستی بەتوانای شادایەو چاکتر وایە نەکەوێتە دەست کەسانیتر، ئەڵبەتە دەبێ بەپەلەیەکی تەواو خۆی بگەیەنێتە ئەو دەورەو هەلەکە بقۆزێتەوە. شاعیر گوتوویەتی:

کنی کارها را چون دور وقت خویش — مهیاکن اسباب آنرا زپیش

که دروقت خود چون کنی کار را — کنی سهل آن کار دشوار را

پس آسان توان کرد دروقت کار — نکردی، پشیمانی آرد به بار

واتە:

ئەگەر دەتەوێ کارێك لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدەیت، دەبێ پێشتر هۆکانی ئامادە بکەیت،

چونکە کار ئەگەر لەکاتی خۆیدا ئەنجام درا،کاری گران و زەحمەت ئاسان دەبێ. ئەگەر ئەوە نەکەیت ئەوە لەئەنجامدا پەشیمان دەبیتەوە.

شای ئەسکەندەر رەوشت، لەبیستنی ئەم قسە پڕوپوچ و ترشوخوێ کراوانە تەواو بێزاربوو، بەڵام لەسەر بنەمای ئایەتی قورئان کەدەڵێ سەبر بکەو سەبرکردنەکەشت بەپشت بەستن بەخواوە بێت، دانی بەخۆدا گرت و سەبرو ئارام گرتنی کرد بەشێوەی رەفتارکردن لەگەڵ ئەوانەداو بەگوفتارێکی نەرم، پۆزشی بۆ هێنانەوەو هەڵساو بەرەو (ئەلەنگ خەرقان) کەوتەڕێ. بەڵام خەیاڵ و ئەندێشەی ئەوانەی هەر لەسەردابوو، تەنانەت هاتە سەر ئەوەی کەپێش سەفەرەکەی لوڕستان، دەست بکات بەتێکدانی ساختمانی خەیاڵاتی ئەو دەروێشەو بەهێزی شمشێری ئاگراوی، ناوی ئەوانە لەلاپەڕەی ڕۆژگاردا بسڕێتەوە، بەڵام لەبەر هەندێ هۆ، ئەم کارەی دواخست بۆکاتێکی‌ترو رووی کردە جێبەجێکردنی شتی گرنگتر دەربارەی (شاە ویردی) لوڕ کەمەسەلەی گرنگی ئەوکاتەی سەڵتەنەت بوو، بەڵام خودی دەروێش، خۆی بوو بەهۆی ئازاری خۆی و بەسزا گەیشتنی برادەرەکانی، چونکە پاش ئەوەی کەژاوەی شا گەیشتە (ئەلەنگ خەرقان)، پیاوێك لەلایەن دەروێشەوە هات و داواکارییەکی هێنابوو ناوەڕۆکەکەی بریتی‌بوو لەوەی کەدەروێش داوای لەشا کردبوو کەلەچوون و گەڕانەوەدا، دەبێ خێرابێ و پەلە بکاو ئەوپەڕی هەوڵ و کۆشش بەکاربێنێ و رووداني مەسەلەکەی کەباسکرا هەروا بەئاسان سەیر نەکاو ئەگەر بۆ شەڕکردن لەگەڵ شاە ویردی پێویستی بەسوپا هەیە، ئەوا خێرا یەکێك بنێرێت تا چەند پێویست بێ لەسوپای پڕچەك بنێردرێتە خزمەتیان.

شا ئیتر بەگەیشتنی ئەم نامەیە، هیچ توانای سەبرکردنی نەماو بەگوێرەی ئەو پەندەی کەدەڵێت: کەسێك بەدوای مەبەستدا بگەڕێ کاری بۆ ئاسان دەبێ، نەهێشتن‌و لەناوبردنی ئەو تاقمە لەگۆڕەپانی ئایین‌و دەوڵەتدا، بەشتێکی پێویست داناو ئیتر دواخستنی ئەم کارەی بەسوودمەند نەدەزانی‌و لەبەر ئەوەی دەروێش خەسرەو داوای ئەوەی کردبوو کەلەشکر بنێرێ، ئەگەرێکی دووری ئەوە هەبوو، لەحاڵەتی دواکەوتندا، ئاشووبێك بەرپابێ، پاشان بەگوێرەی قسەی پێشینان کەوتوویانە ئەوەی کەدەیەوێ کارێك ئەنجام بدا، دەبێ لەپێشەوە هەموو شتێکی بۆ ئامادە بکرێ، خێرا سەرۆکی جارچییەکانی بانگ کردو پێی راگەیاند کەئەو تاقمە نەفرەت لێکراوە، بخاتە ژێر چاودێرییەوەو بڕیاری دا کەسەد کەس سوارەو پیادە ئامادە بکات، بەبێ ئەوەی کەس بزانێ ماڵەکەی دەروێش بکەنە شوێنی بەڵاو نەگبەتی بۆیان‌و زۆر بەوردی‌و بەئاگادارییەوە، ماڵەکە بخەنە ژێر چاودێرییەوەو سەر ئەڵقەی ئەو گروپە خراپەکارە بپارێزێ، دووپاتیشی کردەوە کەنەوەکو کەمتەرخەمی بکەیت‌و هێرشی خەڵك‌و موریدەکانی رێگای ئەوەت لێ بگرێ کەنەتوانی بیخەیتە بەردەستی خۆت‌و پشێویەکی گەورەی لێ بکەوێتەوە، دەبێ یاوەرو نزیکانی دەروێشی کەشیش‌و یوسفی تەرکەش دۆزو کوچکی بهلەدوز کەسەرکردەکانی ئەو گروپە ئاشووبگێڕە بەجوانی بکرێ، چونکە ئیشم هەیە لەگەڵیانداو بەڵکو لەگەڵ کەسانێکی وریاو بەئاگا بیاننێرێ بۆم. هەر ئەو شەوە جارچی باشی، لەگەڵ ئەو تاقمەدا کەدەستنیشان کرابوون بەغار کردن کەوتنەڕێ‌و وارێکەوت پێش ئەوەی بەتەواوی رۆژ ببێتەوە، گەیشتنە شوێنی مەبەست‌و تەکیەکەیان ئابلوقەداو ئەوەندە راوەستان تا دنیا رووناك بوویەوەو دەرگای تەکیە خرایە

سەرپشت، هێشتا کەسی لێ نەهاتبووەدەر، جارچی وەك بەلای ناگەهان و ئەژدیهای ئاگر بەدەم، چووە ژوورەوە سلاوی کردو دەروێشیش هەر لەجێگەکەی خۆیەوە وەلامی دایەوە، پاش ئەوە جارچی بوخچەیەکی لەبەردەمیا داناو گوتی، پاشا خەلاتی ناردووە بۆتان، ئەویش بانگی تاقمەکەی خۆی کرد کە لەشوێنێکی ژوورەکەدا خەریکی قسەکردن بوون، هەموویان هاتن. دواتر پیاوەکەی شا عەبایەکی لەبوخچەیەك دەرهێناو چووە پشتیەوە، بۆ ئەوەی بیخاتە سەرشانی، دەروێشیش هەلسایە سەرپێ بۆ ئەوەی عەباکە بدرێ بەسەر شانیا، لەم کاتەدا پیاوەکەی شا مشتەکۆلەیەکی وای کێشا بەملیا بەدەمدا کەوت و بەر لەوەی راست بێتەوە، یەکسەر دەستی بەست و ئەوانی‌تر بەجارێ هاواریان لێ بەرزبوویەوەو رێگەیان گرت لەبەستنەوەی ئەو، چەند کەسێکی تر لەپیاوەکانی شا هاتنە ژوورەوەو دەستیان کرد بەلێدانی تاقمی سەر بەدەروێش، ئەوانیش دەستیان کردەوە هەندێ بەچەقۆو تیغ و هەندێ بەدار، شەڕەکە گەرم بوو، چەند کەسێك لەتاقمی دەروێش کوژران و هەندێ برینداربوون و پاشتر بەسترانەوە. جارچی باشی ئەم تاقمەی لەگەل دەروێش خەسرەودا برد بۆ مالی خۆی و ئەنجا روویکردە مالی یوسفی، ئەویشی لەوێ چنگ کەوت و گوتی، تا ئەم هەوالە بلاوبوویەوە هەموو قەزوین کەوتە ژێر دەستیان.

دوای ئەوەی دەستگیرا بەسەر هەموو کەلوپەلەکانیدا لەگەل یوسفیدا بەچاودێری کۆمەلێکی باوەڕپێکراو رەوانەی خزمەتی شا کران، سێیەمیان کەکوچکی ناو بوو، بەهۆی زەهر خواردنەوە هەر لەرێگەدا بەرەو ئەو دنیا تێی تەقاند. دەروێش کەگەیشتە خزمەتی شا، وەك جاران دەستی کرد

بەقسەکردن و بناغەی پرسیارو وەڵامی دامەزراند لەگەڵیاو دەرویشیش هەروەك جاران وەڵامی شای ئەدایەوەو هیچ شتێکی بەخەیاڵدا نەدەهات.

بەرێکەوت لەو رۆژگارەدا، ئەستێرەیەکی کلکدار لەنێوان رۆژهەلات و باکووردا دەرکەوتبوو، شا لێی پرسی کەئەوە مانای چییە؟ ئەو کابرا لەدنیاو قیامەت زەرەرمەندە لەوەلامدا گوتی: روودانی ئەم حاڵەتە مانای ئەوەیە کەلەم رۆژانەدا، گۆڕانێك لەبناغەی سەڵتەنەتدا روو دەداو پادشا گۆڕانێکی تیا دەبێ و وادیارە کەیەکێك لەدەروێشەکانی ئێمە لەپلەی بەرزی پاشایەتی مەعنەوییەوە، ئەگاتە پلەی پاشایەتی رووکەش و پێی سەرفرازو سوودمەند دەبێ و بەم زووانە لەپشتی پەردەوە دەرئەکەوێ. شا فەرمووی لەتاقمی ئێوەدا، کەسێکی لەتۆ باشتر نییە کەشایانی ئەم پلەیە بێ، من وای بەباش ئەزانم کە تۆ بکەین بەپاشا، تاکاریگەریی دەرکەوتنی ئەم ئەستێرەیە یەکبگرێتەوە لەگەڵ رووداوەکەدا، پاش ئەوە پاشا فەرمانی دا عەباو تاج و پشتێنی رازاوە بەبەردی گرانبەهاو، هەرچی جلوبەرگی پێویستی پاشایەتی بێ هێنایان و کلاوی پاشایانەیان کردە سەری، لەسەر تەخت و کورسی سەڵتەنەت دایان ناو، خەڵکەکەش وەك هەر پاشایەك رێورەسمی رێزلێگرتنی جێبەجێ کرد. بەم بۆنەیەوە، حەکیم روکنودەو لەمەسعودی کوڕی حەکیم نیزامودینی ئەحمەدی کاشی کە ئامادەی کۆڕەکە بوو، ئەم شیعرەی داڕشت:

| | |
|---|---|
| شها توئی که در اسلام تیغ خونخوارت | هزار ملحدچون یوسفی مسلمان کرد |
| فتاد در دلم از یوسفی و سلطنتش | دوبیت قطعه مثالی که شرح نتوان کرد |
| جهانیان همه رفتند، پیش او بسجود | دمی که حکم تواش پادشاه ایران کرد |
| نکرد سجده آدام به حکم حق شیطان | ولی بەحکم تو آدم سجود شیطان کرد |

واتە:

ئەو باسەی کەلەسەرەوە رابرود لەگەڵ دەنگوباسی حەزرەتی زوننور قەلەندەر ئەگەر بەراوردبکرێت، وەك لەم شیعرانەی خوارەوەدا هاتووە لەیەکچوونێکی تەواوی تێدایە لەشیعرەکاندا دەڵێ:

چو ذوالنّور گرید آنوقت شاه بەیاران بشد آن زمان قبله گاه

همی ایل لُر تابع او شدند — مرید همان یار نیکو شدند

مجرّد بُدی در جهان شه ذوالنّور — بەدین حقیقت نمودی ظهور

دگر سید رضا شد ورا جانشین — به آنخاندان گشت او قطب دین

به آیین حق عهد تجدید شد — که ذوالنّور آن قطب توحید شد

زمانی ذوالنّور بود در جمع حق — کەناگاه یک مهتری زان ورق

ابا چند سواره به قهر شدید — بیامد که ذوالنّور سازد شهید

بفرمود ذوالنّور با مردمان — بباشید در جمع دل شادمان

نجنبید ازجا نباشید تنگ — خدا هست با ما به توفیق و هنگ

چو سردار آید در این انجمن — ببینید آنوقت کرامات من

چو وارد بشد آن رئیس از غرور — بغرید گفتا کەای شه ذوالنّور

چنانی تو مغرور از کبر و زور — نداری زمن باك اندر حضور

کنون خواهم از تو دراین جشن و سور — اگر تو غلامی به ذات غفور

بباید که معجز نمایی به من — که ببینم عیان اندرین انجمن...

چو آن مرد مهتر ز ذالنور شاه — کرامات و اعجاز دیدی بگاه

هماندم به پیش آمده سجده کرد — به دین حقیقت دگر سر سپرد

همه ایل و قومش به صدق تمام — شدند حق پرست جمله در آن ایام

دگر شاه ذوالنور در آنزمان — حقیقت رواکرد اندر جهان

پس آنکه چو خورشید گشتی نهان — بشد سید رضا جانشینش به خان

کاتێك زوننور بوو بەپاشا، بوو بەقیبلەی هەوادارانی خۆی هەموو خێڵی لوڕ دوای کەوتن و بوون بەپەیرەوانی ئەو پیاوچاکە کاتێك کەشا زوننور لەدنیا دوورکەوتەوە کەسەید رەزا لەجێی ئەو دانیشت و بوو بەجەمسەری

ئاییینی ئەو بنەماڵەیە، پەیمان تازە کرایەوە زوننور بوو بەجەمسەری یەکتاپەرستی. ڕۆژێك کە زوننور لەناو کۆمەڵێکدا ئەبێ لەناکاو یەکێکی لێ پەیدا ئەبێو بەگرژیو تووڕەیییەکی زۆرەوە لەزوننور دێتە پێشەوە بەتەمای شەهیدکردنی. زوننور بەخەڵکەکەی دەوروبەر دەڵێ: هەموو دڵنیابنو لەجێی خۆتان نەجووڵێنو کەس دڵتەنگ نەبێ، خوا یارمەتیدەری ئێمەیە. کاتی ئەو گەورەپیاوە دێتە ناو کۆڕەکەی ئێمەوەو ئەوسا کەرامەتو گەورەیی منتان بۆ دەردەکەوێ. کەکابرا بەلەخۆبایی بوونو بەگەورە زانینی خۆیەوە هاتە ناو کۆڕەکە، نەڕاندی بەشا زوننوری گوت: تۆ کەئەوەندە مەغرورو لەخۆباییتو هیچ باکت لەمن نییە کەمن هاتوومەتە ئێرەو گوێم نادەیتێ، ئێستا دەمەوێ ئەگەر راست دەکەی تۆ بەندەی خوایت رووداوێکی لەعادەت بەدەرم بۆ دەربخە لەم کۆڕەدا بەچاوی خۆم بیبینم. کاتێك شا زوننور هەندێ شتی پیشاندا، لێی هاتە پێشەوەو کڕنووشی بۆ بردو باوەڕی هێنا بەئایینەکەو هەموو کەسوکارو خێڵەکەیش بەراستی بوون بەحەق پەرست لەو سەردەمەدا. ئیتر شا زوننور لەو سەردەمەدا حەقیقەتی بڵاوکردەوەو لەجیهانداو پاش ئەوەی وەك خۆرئاوابوو، سەیید رەزا لەشوێنی دانیشت.

(شاهنامه حقیقت، حاج نعمت الله جیحوم آبادی،ص۲۹۹)

ئەگەر ئەو بابەتە زیادو تۆمەتو شتە هەڵبەستراوەکان لابەرینو ئەو شێواندنو دەسکاری کردنانە کەمێژوونووسان بەناچاری کردوویانە، دەرحەق بەو راپۆرتە مێژووییانەو بەوردیو هۆشیارییەوە ناوەرۆکی بابەتەکان بخرێنەڕوو، دەردەکەوێ کەبەشی زۆری گەورەکانی ئەهلی حەق کەلەنووسینەکانی بەردەستدا، هیچ باسێکی ژیانو بەرهەمەکانیان نەکراوە،

پلەو پایەو کەسایەتیو چۆنیەتی ڕاپەڕینو سەرهەڵدانو بزووتنەوەی ئەوانە لەو ڕەوتە مێژووییەدا ڕوونو ئاشکرایە.

لەگەڵ سەرکوتکردنی ئەو ڕاپەڕینانە، لەسەردەمی سوڵتان محەممەدی خودا بەندە (٩٨٥- ٩٨٦ی کۆچی) باوکی شاعەباسی یەکەم، بزووتنەوەی عەلەوییە توندڕەوەکان کەلەناو قەڵا کوێستانییەکانو لوتکەکانی زاگرۆسو ناوچەی سەرسنووری خۆراسانو ئەفغانستانو ئازەربایجانو کوردستاندا، وەك سەدەکانی پێشووتر بوو بوو بەئاگری ژێر خۆڵەمێشو، لەسەردەمی شاعەباسی یەکەمدا (٩٩٦ . ١٠٣٨ی ك) لەشێوەی (نوقتەوی)یەکاندا، دەرکەوتن کە گروپێك بوون لەحروفییەکان جیابووبوونەوە.

(نوقتەوی)یەکان لایەنگرو پەیڕەوانی مەحمود پەسیخانی گەیلانی بوون کەلەسەردەمی شاتەهماسبیشدا جموجوڵو چالاکیی فراوانیان هەبوو، بەڵام لەبەر بارودۆخی کۆمەڵایەتی چاوپۆشییان لێکرابوو. مەحمود بەجیابوونەوە لەلایەنگرانی (فەزڵی حروفی ئەستەرئابادی) کەخۆی لەسەرەتادا یەکێك بوو لەپەیڕەوانی ئەو، گروپی (نوقتەوی) دروست کرد کەهەمان بیروباوەڕی ئایینی عەلەوییە توندڕەوەکانی (ئەهلی حەق = حروفیە)یان پەیڕەو ئەکرد، لەگەڵ هەندێ کەمکردنو زیادکردنی چەند بابەتێکدا، هەر لەبەر ئەمە لەریزی حروفییەکان دەرکراو لەساڵی ٨٣١ی کۆچیدا لەدنیا دەرچوو. بزووتنەوەی مەحمود کاریگەرییەکی سوودمەندی هەبوو، دەربارەی سەرگوزەشتەی ئەو، هیچ زانیارییەك لەسەرچاوە مێژووییەکاندا لەبەردەستدا نییە. هەرچەند لەبەرهەمە شیعرییەکانی ئەهلی حەقدا، پاش ناوبردنی شاە جەلالودین لەبنەماڵەی خاکسار، لەچەند شوێندا ناوی مەحمود براوەو لەبەر ئەو پەیوەندییەی کەهەیە لەنێوان بنەماڵەی خاکسارو

نوقتەوییەکاندا، بەتایبەت لەهیندستاندا، دوور نییە کەمەبەست لەومەحمود ناوە، مەحمودی نوقتەوی گەیلانی بێت (خاکسارییەکان ئەو بەمەحمود پاتلیو تەریقەتەکەشی بەتەریقەتی سەلمانی فارسی ناودەبەن)؟! ڕەنگە تەنیا لەیەك شوێندا، مەبەست لەو بێت، بەڵام لەزنجیرە بەرودوواکەی خاکسارییەکاندا، ناوی مەحمود چەند بارەبووەتەوە.

بابەتێکیتر، مەسەلەی سوڵتان مەحمودی غەزنەویو ئەیازە. لەشیعرو حیکایەتەکانی ئەهلی حەقو لەقسە بۆسەروبەرەکانی گەورەکانی یارسان = ئەهلی حەقدا، ناوی مەحمود غەزنەویو بەتایبەت شاری (غەزنەین) هاتووەو سەردەمی ئەو بەسەردەمی دەرکەوتن ناوبراوە، بەڵام سوڵتان مەحموودی غەزنەوی، بەهیچ بەڵگەیەکی مێژوویی، ئایینی، سیاسی، لۆژیکی، فیکری ناتوانرێ، بەیەکێك لەگەورەکانی عەلەوییەکانی ئەهلی حەق دابنرێ، هەرچەند لەبەرهەمی شیعری (فریشتەکانو دون هەفتەوانە) ناوی ئەویش هاتووە، هەرچەندە هەڵبژاردنی مەحمودی غەزنەوی لەنێو گەورەپیاوانی ئەهلی حەقدا، وەکو باوەڕێکی جێگیری لێهاتووە، بەڵام ڕەنگە لەبەرئەوەی هیچ زانیارییەك دەربارەی مەحمود پەسیخانی گەیلانی لەبەردەستدا نەبووە، ئەوانەی کەدەنگوباسو ڕووداوە مێژووییەکانیان گێڕاوەتەو، وەك هەموو ئەو هەڵەو شێواندنانەی تر، لەگەڵ سوڵتان مەحمودی غەزنەویدا، لێیان بووبێ بەیەكو تێکەڵیان کردبن، چونکە ڕێکخستنی ئەو حیکایەتانەو گێڕانەوەیان هاوشێوەیە لەگەڵ دەنگوباسی مەحمود پەسیخانی گەیلانیدا، نەك سوڵتان مەحمودی غەزنەوی یەکەم، کەسەردەمی مەحمودیان پاش سەردەمی شا فەزڵ داناوە، ئەم نزیکیو یەك

ئەی شا ئەوە تیغی خوێنخۆری تۆیە لە ئیسلامدا، هەزاران خوانەناسی وەکو یوسفی کرد بە موسڵمان، دەربارەی یوسف و دەسەڵاتەکەی، دوو دێرشیعری بێ وێنە هات بەخەیاڵمدا کە راڤە ناکرێت. هەموو ئەوانەی لەجیهاندابوون کڕنووشیان بۆ برد، لەو ماوەیەدا کەبەفەرمانی تۆ کرا بەشا، بەپێی مافی ئەهریمەن کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد، بەڵام بەفەرمانی تۆ ئادەم کرنووشی بۆ ئەهریمەن برد.

تەنانەت خودی شا، وەك سەرۆکی پاسەوان بەدارێکی نەخشێنراو بەبەردی گرانبەها بەرامبەری راوەستاو گەورە پیاوانی دەوڵەت هەرکەس لەشوێنی تایبەتی خۆیدا راوەستا، هەموو وەزیرو پیاوە گەورەکان بەگوێرەی پلەو پایەی خۆیان، رێورەسمی پیرۆزبایی کردنیان بەجێهێناو چاوەڕوانی حوکم و فەرمانی ئەویان دەکرد، دەروێش سێ رۆژ بەم شێوەیە فەرمانڕەوایی کردو خەڵکەکەش، هەر وەك شا رەفتاریان لەگەڵ ئەکرد. لەم ماوەی سێ رۆژەدا، هیچ فەرمانێکی دەرنەکرد، ئەوە نەبێ کەدەیگوت چی کوڕی جوان هەیە هەموویان بێننە لام و هەرکام لەوانە کارێکی پێ دەسپاردو یاری و گاڵتەی لەگەڵدا دەکردن (!!؟) بۆ رۆژی چوارەم، شا فەرمووی پێویستە پلەو پایەی بەرزتر بکرێتەوە، فەرمانی دەرکرد دارێکیان بۆ داچەقاندو ئیشارەتی کرد، بردیان هەڵیانواسی و تیربارانیان کردو لاشەکەی هەر بەدارەوە مایەوەو کەژاوەی شا بەرەو لوڕستان کەوتەڕێ، هەر لەو رۆژەدا کەدەروێش خەسرەو بەو دەردە فەرمانێك دەرکرا بۆ کاربەدەستانی کاشان و ئەسفەهان تێیدا هاتبوو کەهەرکەسێکیان دەستکەوت لەپەیڕەوانی ئەوانە زنجیر بکرێ و رایگرن لای خۆیان. لەکاشان زۆر بەوردی گەڕان بەدوای ئەوانەدا، چەند کەسێکیان بەردەست کەوت کەناوداربوون و گەورەو خەلیفەی ئەوانە پیاوێك بوو بەناوی میر ئەحمەد گرتیان و کۆت و زنجیریان کردو خستیانە بەندیخانەوە، لەئەسفەهانیشدا مەلا عنایەت ناوێك گیرا بەڵام

پاشان ئازادکرا، کاتێك کەژاوەی شا لەلورستان گەڕایەوە ڕۆژێك لەبارەگای سەڵتەنەت کۆڕێك بەسترا هەموو زانایان کۆبوونەوە تیایداو پاشان دەروێش خەسرەویان ئامادەکردو هەندێ لەعولەماکان چەند پرسیارێکیان لێکردو ئەویش هەندێ وەڵامی ناتەواوی دایەوەو شا هاواری کرد بیبەنە دەرەوە پاشان ریشە درێژەکەیان تاڵ تاڵ هەڵکێشاو بەرەو پشت سواری کەریان کردو بەناو کۆڵان و بازاڕدا گەڕاندیان و ژن و پیاوو منداڵ هەموو لەماڵ هاتنە دەرەوە بۆ سەیرکردن و بەدارو بەرد لێیان ئەداو خاك و خۆڵیان ئەکرد بەسەرو ریشیا بۆ ڕۆژی دووهەم گوریسیان بەست بەقاچییەوەو سواری حوشتریان کردو جارێکی تر بەناو شار گەڕاندیان، ئیتر لەهەموو لایەکەوە خەڵکی بەردو داریان تێئەگرت و پاشان بردیانە بەردەم سێدارەو پیاوەکان هێرشیان کردە سەری و بەجۆرێك بەردەبارانیان کرد کەلەژێر بەرددا ون بوو و گیانی دەرچوو پاش ئەوە لاشەکەیان هەڵواسی بەسێدارەدا بوو بەپەندو عیبرەت بۆ هەموو کەسێك، شا ئەمری کرد هەفتەیەك بەدارەکەوە بمێنێتەوە تاکافرەکانی‌تر ئاگاداری پەیدابکەن بەسەر پلەو پایەی بەرزی ئەودا:

ز شرع نبی آنکه گردد بری     طریقی نورزد بجز کافری
کسی کود بود منکر دین حق     عذاب ابد را شود مستحق
دو روزی اگر بگذراند مدار     در آخر شود خوارو بی اعتبار
کند گرم بازار الحاد او     {تنی} چند سوی وی آرند رو
بهر چند گە، در یکی روزگار     کند کید شیطان {یکی} را سوار
کند کار او را به نوعی قوی     کە آخر کند دعوی خسروی
ز رفعت بجایی برد پایەاش     کە بر خاك مشکل فتد سایەاش
بە ناگە ازین پایە ارجمند     کەگشت است شیطان از آن سربلند
کند سرنگون دست شرعش چنان     کە گردانجش عبرت دیگران
{کسی} را کە شیطان برین بام برد     همان بە تەبردو ناکام مرد

لەم سەروبەندەدا، شا کەوتە خەیاڵی سەفەری ئەسفەهان و کەوتەڕێ لەوەختی گەڕانەوەیدا، کاتێ گەیشتە شاری موسڵمانان (کاشان) بیری

کردەوە کەئەو نوقتەویانەی لەوێ گیربوون بیان بینێ، بەگوێرەی فەرمانی شا میر ئەحمەدی گەورەی ئەوانەیان هێنایە بەردەم شا، لەگەڵ تاقمێك لەکۆمەڵەکەی. شا بەتووڕەیی و هەڕەشەکردنەوە دوو کەلیمە قسەی لەگەڵ ئەو کۆنە کافرەدا کرد، گوتی بەڵکو تەوبە بکات و خۆی لەخوانەناسی پاك بکاتەوە، ئەویش گوتی ئێمە هیچ لەمردن ناترسین، چونکە دڵنیاین لەوە کەکەمێك پاش مردن، بەشێوەیەکی چاکتر دێینەوەو لەهەر هاتنە دنیاو مردنێکدا، زیاتر گەورە ئەبین، من تائێستا چەند جار هاتوومەتە دنیاو ڕۆیشتووم، بۆنموونە سێسەدو بیست ساڵ پێش ئەمڕۆ، لەشێوەی جوانێکی ڕێك و پێك هاتوومەتە دنیاو خەتیشم زۆر خۆش بوو، بەجۆرێك خەت و نووسینی منیان، وەك شتێکی پیرۆز دەست بەدەست پێ ئەکرد، بەرێکەوت لەم ڕۆژانەدا، خەتێکی خۆمم بینی و ناسیمەوە، کاتێ لەم قسەکردنەدابوو شا شمشێرێکی دا لەدەم و پلی و بەجۆرێك کاسەی سەری لێکردەوەو پێش ئەوەی بکەوێ شمشێرێکیتری لێدا، کردی بەدوو پارچەوە. ئەنجا ڕووی کردە ئەوانیتر لەناویانا گەنجێك هەبوو، مەلا باقر ناو زۆر هێمن و لەسەرخۆبوو. قسە خۆش بوو لەخۆشنووسیدا وەك میر موعەز وابوو، شیعرەکانی لەوپەڕی جوانی و عەشق و خۆشەویستییەکی تەواو لەهۆنراوەکانیدا دیاربوو. شا ڕووی تێکردو لێی پرسی، چی وای لەتۆ کرد کەداوێنی خۆت لەپیس و پۆخڵی و بەدناوی ئەم تۆمەتەوە بگلێنی و سەری بێ غیرەتیت لەیەخەی ئەم بێشەرمییەوە دەرهێناوەو ئەنجامی خراپی ئەمەت نەدەزانی.. مەلا باقر ناوچەوانی ملکەچی خستە سەر زەوی و گوتی: تا جیهان ماوە سێبەری سۆزو میهرەبانی پادشا بەسەر کۆیلەکانیەوە بەردەوام بێ، بچووکی خۆت بەئارەزووی خۆم نەکەوتوومەتە

ناو ئەو کێشەیەوە، بەحەزی خۆم تووشی ئەم کارە نەبووم.. لەلایەکیترەوە شارەزای رەفتاری ناشیرینی ئەمانە نەبووم، چونکە بەئاشکرا هیچی وایان نەدەگوت کەپێچەوانەی شەرع بێت، ئیتر فەرمان بەدەستی شایە. شا تەوبەی پێکردو سپاردی بەفەرهاد خان تا بیکاتە نووسەری تایبەت.

(نقاوة الاثار،ص ٥١٠-٥٢٧)

بەگوێرەی ئەوەی لەدەقی گێڕانەوەکانی ئەهلی حەقدا هاتووە، پەیدابوونی کەسێکی لەوەچەی سەفەوییەکان وەرگیرایەوە، ئیتر لەو بنەماڵەیە کەس دەرنەکەوت. ئەودەستەی کە شا عەباس وەشاندی لەنوقتەوییەکان، بوو بەهۆی کۆچکردنی تەواوی ئەوانە، بۆ خاکی هیندو لەوێ تازەبوونەوەی پەیوەستی لەگەڵ خاکساری و سەرهەڵدانی بنەماڵەی عەجەم لەئەنجامی ئەم دەرکردن و راوەدونان و راگواستنەوە پەیدابوو. ئەگەر کەمێك وردبینەوە لەئایینی (پەردیوەری)، کەگەلێك ئەندێشەو بۆچوونی ئایینەکانی هندستانی پێش ئیسلامی تێدابوو، لەسەردەمی پاش ئیسلامدا، جارێکیتر لەهیندەوە گەڕایەوە بۆ خۆراسان و لەوێشەوە بناری شاخەکانی زاگرۆس، لەئازەربایجانیشەوە تا نزیکی ئەروەند روود گەیشت و لەپەردیوەر گەیشتە لووتکەو رۆم و ئەنادۆڵیشی گرتەوە، پاشتر هەر بەرێگەی خۆیدا گەڕایەوە بۆ هیندو، سەرلەنوێ بەیارمەتی ئێرانییە کۆچکردووەکان بەچەند ناوو دیمەن و روخسارێکی جیاجیاوە، سەری هەڵدایەوەو ئەم کەلەپوورە ئایینییە بۆ سالأنێکی دوورودرێژ، لەبنکەی عەلەوییەکانی زاگرۆسدا پارێزگاری لێکرا.

## راپەڕینی دەروێش ڕەزای عەلەوی، لەسەردەمی شاه سەفیدا ١٠٣٨ ـ ١٠٥٢کۆچی

پاش ڕووداوەکانی سەردەمی شا عەباسی یەکەم (٩٩٦ – ١٠٣٨ك) دەربارەی بەردەوامبوونی راپەرینی عەلەوییە توندڕەوەکان، سەرهەڵدانی دەروێش ڕەزای عەلەوی پەیدابوو، لەکاتی چوونە سەر تەختی شا سەفیدا، کەباسی ئەو راپەڕینە لەگەڵ پێشەکییەکدا، لەلایەن محەمەد مەعسوم کوڕی خواجەگی ئەسفەهانییەوە لەکتێبتی (خلاصة السیر)دا. هاتووە، ئەم راپەڕینە بەپشتیوانی سەرکردەکانی زەنگنەی کورد بووە کە رەگیان لە ئایینی عەلەوی توندڕەودا هەبوو، شوێنی راپەڕینەکەش قەزوین بوو کە زێدی راپەڕینە یەك لەدوای یەکەکانی عەلەوییەکان بوو، وەك پێشتر باسکرا. بەم بۆنەیەوە قەزوین لەدیدگای عەلەوییە توندڕەوەکانەوە، پێگەو پلەو پایەیەکی تایبەتی هەیە، وەك خان ئەڵماس بەزمانی هەورامی فەرموویەتی:

هر جەهندستان تاو فرنگی　　آراستە مبو چند توپ جنگی
یوم محشر بونە چالە قزوین　　چند هزار عالە مگیلو وزین

واتە: هەر لە هیند تا فەرەنسا بەتۆپی سەر ئارایشت دەکرێت و لەقەزویندا دەبێتە ڕۆژی مەحشەر هەزاران کەس لەزین دەکەونە خوارەوە.

یاوەك تەیموری یەکەم دواتر فەرموویەتی:

ئێران لەو دەما ئەمن و ئەمان بوو　　جمهوریی موتڵەق و جەختی عەیان بوو
لەو دەما وەپا جەنگی دین مەبۆ　　ئین جەنگ دینە لەقەزوین مەبۆ

لەبەرهەمی نووسراوی عەلەوییە توندڕەوەکاندا، چەند جار ناوی دەروێش ڕەزا بەشارەزا هاتووە. لەچەند شیعرێکدا وەکو:

... ز پس هم به محمود مهمان شدم — بەجام رضا پس غایان شدم

(لەشاهنامەی حەقیقەت، لاپەڕە ٢٨١)

... ز هندُســـــتان در زمـان رضـا — بدم جانی حقانی در آن سرا

هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٢٨٥)

ز هندُستان گشت ظـاهر چـوخور — بدی شاه رضا نام در آن بشر

... چوبگذشت آن دوره هم شه رضا — بجای دگر گشت ظاهر چوماه

(هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٧٣)

جێی سەرنج ڕاکێشانە کەسەید ڕەزا لەدایکیەوە ئەگاتەوە سەر زوننور قەلەندەرو، یەکێك بووە لەیارانی ئەوو لەلایەنە مێژووییەکەیەوە ئەم مەسەلەیە ڕوونتر دێتەپێش چاوو نزیکترە.

پێویستە سەرەتا بۆ سەلماندنی پەیوەندیی مێژوویی عەلەوییە توندڕەوەکانو تیرەی زەنگنە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی (ئاکوپوف) بخەینە ڕوو لەو بارەیەوە کەدەڵێ (.. زەنگنەکان خۆیان لایان وایە کە بە بنەچەو پشت ئەوان دەگەڕێنەوە سەر عەرەبەکانی خێڵی بەنی ئەسەدی حیجاز.(ئاکۆپۆف ئارلیف، مطالبی.. ج٢،ص١٤١) ئەم گەڕاندنەوەی بنەچەیە بەم شێوەیە شایانی لێوردبوونەوەیە لەو ڕووەوە کە (علی الله)یەکان (ئەهلی حەق)یش خۆیان ئەگێڕنەوە بۆ سەر خێڵی بەنی ئەسەدی عەرەبی حیجاز. لەم خاڵەوە ئاماژەیەك دەبینین بۆ هاوبەشی پەیدابوونی کوردەکانی زەنگنەو گۆرانەکاندا، جگە لەمەش ئەو بەشەی کەلەفارسدا ماونەتەوە لەوانە، تاماوەیەك لەوەو پێش خۆیان بە(کورونی) دادەنا کەدیارە هەر گۆڕانەکەیە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.(cl. Rich. I.P,271)

ئەنجامی بەدەستهاتوو دەربارەی پەیوەندیی نێوان گۆرانو زەنگنە، هەموو تیرەو لقەکان ئەگرێتەوە، وەك (ئا. ئادلف) باسی دەکا، زەنگنەکانی تورکیا، یا وردتر بڵێین زەنگنەکانی ئەمڕۆی ئێران، دابەش بوون بەسەر

پێنج بەشدا: یەکەم ئەو زەنگولەییانەی کەلەناوچەی کفری دەژین، تاڵەبانیو سیامەنسورییەکان کە لەناوچەی کەرکوکدان، چنگییەکان کە لەنزیکی ئەوانو لە لوڕستانیشدا دەژینو، کیتوانییەکان کەلەناوچەی ساری تەپەدا دەژین. کەواتە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کەبەشی گرنگی زەنگنە لەئێرانو بەشێکیان لەسوریاو، بەزمانی ئەو شوێنانەی نیشتەجێن تیایدا قسە دەکەن. فلادیمیر مینورسکی لەلێکدانەوەی ئەم مەسەلەیەدا وابەپێویست دەزانێ، ورد بڵێ کەوادەرئەکەوێ دەبێ ئەوە بگەڕێنینەوە، بۆ ئەوەی کەئەوان بەدوو زمان قسەیان کردووە، چونکە زەنگنە بەبێ هیچ چەندو چوونێك کوردن). {مطالبی پیرامون بررسیهای خاوری،ج٢،ص١٤١-١٤٢}، دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە زۆربەی ئەم کوردانە سەر بەمەزهەبی عەلیوڵلاییی= ئەهلی حەقن {کردان، گوران، ئاکۆپۆف، سیروس، ایزدی،ص٨٤}.

ئێستا باسی سەرەتاو ئەنجامی سەرهەڵدانی دەروێش ڕەزا بەیارمەتی سەرکردەکانی زەنگنە دەگێڕینەوە کەنووسەری کتێبی (خلاصة السیر) باسی کردووە: باسی ئەو ڕووداوەی کەلەقەزویندا بەرپا بوو، بەهۆی سەرهەڵدانی دەورێش ڕەزاوەو لەناوبردنی ئەو. لەبەر ئەوەی کەبارەگای پاشایەتی لەئەسفەهان ببوو بەشوێنێکی شکۆدار، دەروێشە بەدڵو ڕەوشت دەوڵەمەندەکانو مسکێنو دانیشتوانی ئەو شوێنە، لەسایەی دادپەروەری گشتگیر بەئارامی دەژیانو هێمنی باڵی کێشابوو بەسەر هەموو لایەکداو، پەرێشانی تەنیا لە زوڵفی بتەکاندا دەردەکەوت لەو ڕۆژگارەدا کەبالای چەماوەی گەردوونی پڕ لەساختەچییەتی، لەباری قورسی ئاژاوەی ڕۆژانە ڕاست بووبوویەوە، لەڕۆژی سێ شەممەی نوێ مانگی قوربانی ساڵی ١٠٤٠ی کۆچیدا، داواکارییەك سەبارەت بەدەورێش ڕەزا، لەلایەن شاهوێردی بەگی تورکمان کەلەو ساڵەدا کرابوو بەبەرپرسی پۆلیسی

قەزوین بەرزکرایەوە، بۆ بارەگای بەرزی شاو تیایدا ئەوەی کەروویدابوو بەخزمەتی پاشای گەیاندبوو و تیایدا هاتبوو:

کاتێك ئەم بەندە بێ دەسەڵاتە، لەهەندێ کەسەوە کەبەقسەی خۆیان و کەسانێکیتر لەو کۆمەڵە باوەڕپێکراون، کەوتمە لێکۆڵینەوە لەسەر حاڵ و رابردووی دەروێش رەزا، ئەم زانیارەم دەسکەوت و ئێستا ئەینووسم بۆ بەرێزتان، ئەم دەروێشە بۆ ناوبانگ دەرکردن، خۆی بەئەفشاریەکانەوە بەستووەتەوە کەیەکێکە لەوان (ئەفشارییەکان لەهەمەدان و ئەسەد ئابادو دینەوەر نیشتەجێن) لەسەرەتای ناو دەرکردنیدا، لەخزمەتی قەرە حەسەن ئیستا جلو بیگلەر بەگیدا کاری دەکرد، لەقەڵەمڕەوی عەلی شوکر (همدان ـ ئەسرد ئاباد ـ کرماشان و..) .. لەیەکێك لەسەفەرەکاندا بۆ ئازەربایجان لەکاتی پەڕینەوە لەرووباری ئاراس، ئەوەندەی نامێنێ بخنکێ، بەڵام لەبەرئەوەی ماوەی مابوو لەژیاندا، پاش سێ رۆژ لەو دەریا پڕ شەپۆلەدا دەکەوێتە کەناری ئاوەکەو رزگاری ئەبێ، پاشان بەهاوڕێیەتی چەند دەروێشێك کەبەلایانەوە جوان نەبوو ناوی خۆیان ئاشکرا بکەن، دەست دەکا بەگەڕان و بەڕێکەوت بەرەو وڵاتی رۆم و میسرو مەراکیش بەڕێدەکەون کەدوورترین وڵاتی خۆرئاوایە پاش ئەوەی دەست دەکا بەگۆشەگیری و خەڵوەت لەسەر یاسای ئیباچییەکان، هەندێ زانستی غەریب و نامۆ فێردەبێ و هەندێ لەوانە کەگەیشتبوونە لای، بەتایبەت میرزا محەمەد تەقی وەزیری مازیندەران و سەر سنوور شتی سەیریان لێ دەگێڕایەوە، بەجۆرێك عەقڵی مرۆڤ قەبوڵی نەدەکرد، دەیانگوت کاتێك چووینە مەنزڵ و خەڵوەتگاکەی، جوانیی ماڵەکەی و کەلوپەلی ناو ماڵەکە، بەجۆرێك دەهاتە

پێش چاو کەلەتوانای هیچ کەسێکی پایەبەرزدا نەبوو و رەفتاری نامۆی لێوە دەردەکەوت.

بەکورتی، دەروێشی ناوبراو پاش ئەوەی کەلەگەڕان دڵتەنگ بووە، گەڕاوەتەوە بۆ قەزوین و لەگوندی کافر ئاوای ناوچەی قاقزان بنەوبارگەی خۆی دەخات و دەست دەکا بەڕاکێشانی خەڵك بەلای خۆیداو لەگەڵ قەرەخان بەگی قوشچی کەلەقوشچییە تایبەتەکانی شا بوو. لاف و گەزافی خزمایەتی لێدەداو بەهۆی خواستنی خوشکی شیریی قەرەخانەوە نانی کەوتە رۆنەوە.

... لەماوەیەکی کەمدا، کۆمەڵێك لەتورکە ساویلکەکان کەبەهۆی ئەفسانەو جادووگەرییەوە، ملیان بۆ گوێڕایەڵیی ئەو درێژکردبووو، لای خۆی پێیان دەگوت (مەهدی سەردەم)، ئەویش لەبەر لێشاوی خەڵك لەخۆی دەرچوو، کەوتە خەیاڵ کردنەوە لەمێشکی خۆیداو لەگەڵ دەوروبەرەکەید کەوتە راوێژکردن بڕیاریان دا لەرۆژی دیاریکراودا دەست بەڕاپەڕین بکرێ و یەکەمجار قەزوین کەپایتەختی شابوو بخرێتە ژێردەستییەوە، کاتێك کەئەوە ئەنجام دەدەین هەموو خەڵك روومان تێدەکاو دەست ئەکەن بەدەست ماچکردن و لستنەوەی قاپییەکان و پەیڕەوانی خاوەن بڕوا گوێڕایەڵمان دەبن.

لەرۆژی شانزەی مانگی قوربانداد، بەچەك و کەلوپەلی تەواوە دەست بەکاردەبن هەندێ وەك قەراوڵ و پاسەوان، لەگەڵ ئاڵای بەیداخداو هەندێك لەگەڵ خۆیدا بەخوێندنی قورئان و سەڵەوات رووەدەکەنە شوێنی مەبەست. یەکەمجار یەکێك دەنێرن بۆ لای شاهویردی بەگی پۆلیس و داوای هاوکاریکردنی لێدەکەن و بڕیاریش دەدەن، ئەگەر بەخۆشی نەهات

لەگەڵیاندا، بەزۆر پەلکێشی بکەن. ئەو نێرراوە چونکە شارەزای هەموو شتەکان بوو، میرزا ئەبو تورابی کوڕی میرزا جەمال کەلە کەلانتەری شارەکەدا کاری دەکردو هەر لەزووەوەو لەباوك و باپیرانیەوە، سەر بەدەوڵەت بوون ئاگادارکردەوەو بەیەکەوە کەوتنە مشت ومڕ لەگەڵیانداو دەست و پێوەندی دار ( السلطنة) دەستیان لێکردنەوەو ئازایەتییەکی تەواویان نواندو لەبارەگای پیرۆزی شازادە حسێن (درووودی خوای لەسەر بێ) ئابلۆقەیان داو تەنگیان پێ هەڵچنین.

دەروێشی ناوبراو کەخۆی کردبوو بەمەهدی ئاخر زەمان، ئەنجامی رۆژگاری خۆی بەچاوبینیو کۆتی بینی لەقاچی خۆیدا، چاری نەما ئەوە نەبێ دان بەهەڵەو تاوانی خۆیدا بنێت و چارەیەکی نەبوو لەبێ چارەیی زیاتر، هەرچەندە دەمی ئەکردەوە، عوزر خوایی بهێنێتەوە دەمیان پڕ ئەکرد لەخۆڵ، لەکۆتاییدا پەنای بردە بەر حوجرەیەك کەلەو دەورووبەرەدابوو، خەڵکەکەش هێرشیان کردە سەریو ئاگریان نابەژوورەکەوەو خەرمانی ژیانیان بەباداو هەندێ لەپەیڕەوانی کەتواناى جیابوونەوەو راکردنیان نەبوو لەگەڵ ئەوەدا گیانیان سپاردو بوون بەهاورێی لەمردندا وەك دورمش خان بیگ کوڕی عەلی خانی زەنگنەی حاکمی پێشووو شاقولی بەگی زەنگنە کەلەزومرەی غولامە تایبەتەکانی شابوو، هەرواوالی سوڵتان شاهیسیون و هەندێکی تر کەئەگەر ناویان بڵاوبکرێتەوە، دەبێتە هۆی شەرمەزاریی کەسوکاریان. بەهەرحاڵ لەچاوترکانێکدا، ئەمانە تووشی شکست هاتن و هەندێکیان سەریان شۆڕکردو پێیان لەسنووری خۆیان زیاتر رانەکێشا. کاتێك هەواڵی ئەم سەرکەوتنە گەیشتە لای شا، زۆر خۆشحاڵ دەبێ پێی و شیعرێك دەخوێنێتەوە دەڵێ:

آسمان داند که از سروو　　　　خودکدامین سرسزای سروری است

ئاسمان خۆی دەزانێ کام سەر شایستەی سەرورییەو پاشان دەڵێ سوپاس بۆ خوا دەوڵەتی بەئاگای ئێمە لەمیهرەبانی خواوە لەبێهۆشی خەوی غەفڵەت پارێزراوە. لەکاتی قسەکردنەکەیدا، ناو بەناو سەری شوکرانەی دەخستە سەر زەوی و فرمێسك بەچاوانیا دەهاتە خوار لەبەر دڵ ناسکی. پاش ئەوەی دەنگوباسی شکستو لەناوچوونی دەروێش بڵاوبوویەوە، میرزا تەقی وەزیری مازیندەران وەك لەسەرەوە باسکرا کەپێشتر چووبووە لای دەروێش بەپاشا راگەیاند، کەچی کەل‌وپەلی تەکیەو ماڵی دەروێش هەیە هەمووی شایانی ئەوەیە دەستی‌بەسەرا بگیرێ، چونکە ئەوەی کەوتە بەرچاو هەموو قاپ‌و قاچاخەکانی زێڕو تەڵایەو فرۆشتنیان شتێکی پێویستە، هەرچەند شا باوەری بەم قسانە نەبوو و دەیزانی بناغەیان نییە، بەڵام بەپۆلیس‌و کاربەدەستانی قەزوینی راگەیاند کەبچن بەسەرو شوێنی مەسەلەکەوە، ئەمانیش لەسەر فەرمانی شا چوونە ماڵی دەروێش، بەڵام لەبری قاپی زێڕین، کاسەو کەوچکی دارو، لەبری فەرشی ئاوریشم هەندێ حەسیرو بەڕە شڕ زیاتر هیچیان چنگ نەکەوت‌و دەستیان لێ هەڵگرت.

زمانه چون بساطش در نوردید فلك بركارو باراو بخندید

واتە: چونکە رۆژگار باروبنەی پێچایەوە، فەلەك بەکاروباری پێکەنی

(خلاصه السیر...،ص۱۱۷-۱۲۲)

بەم شێوەیە هەندێ لە هەوڵ‌و تەقەلای عەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەق، لەگەڵ هێڵی بڵاوبوونەوەو ناوچەی دەسەڵات‌و پروپاگەندەیان‌و دوورخستنەوەیان بەبەڵگەوەو بەگوێرەی بەرهەم‌و پاشماوەیان لەسەردەمی سەفەوییەکانەوە تا ئەگاتە سەردەمی شا سەفی (۹۰۷ ۱۰۵۲) خرایەڕوو، ئێستا لێکۆڵینەوەی لقێکی‌تر دەست پێدەکەین، لەوانە کەهەر لەو سەردەمەدا بوون بەمەبەستی راستکردنەوەی سەرچاوەکان‌و ئەو شێواندنانەی کەکراوە لەو مێژووەدا.

# پەیوەندیی بنەڕەتیو ئایینی عەلەوییە توندڕەوەکان لەکوردستاندا، لەسەرەتاوە تا سەردەمی سەفەوییەکان

+ راستکردنەوەی شێواندنی مێژووی کوردستان

+ رەوتی گۆڕانی سیاسیو مەزهەبی لەناوچەی عەلەوییە توندڕەوەکاندا

زێدی سەرهەڵدانی ئایینو رێبازی عەلەوییەکانی ئەهلی حەق، وەك لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا لەگەڵ بەڵگەی تەواودا ئاماژەی پێکرا، شوێنی رازونیازو هێماکانە کەهەر خاڵێك لەو ئەگەر لەسەرخۆو بەوردی لێی بکۆڵینەوە، هەر لەکەناری ئەروەند روودەوە، تا بناری ئاراس هەزاران وشەو وتەی نەوتراوو نهێنی شاراوە، لەناخی خۆیدا هەڵگرتووە کەباس لەمێژوو و ئایینو دابو نەریتو ژیانی کۆمەڵگەی رابردووی ئێمە دەکاو دەیگێڕێتەوە.

لەم رێڕەوەدا بەتایبەتی لەکوردستاندا، چوار بنەچەی رەسەنی جاوان، گۆران، ئەردەڵان، زەنگنە کەهەموو خێڵە کوردەکان لەناوچە پانو بەرینو بڵاودا لەخۆ دەگرن، لەگەڵ پێشینەیەکی گرانبەها لەفەرهەنگو شارستانیەتی کۆنی ئەم خاکە، بزووتنەوەی عەلەوییە توندڕەوەکانی، لەداوێنی خۆیدا پەروەردە کردووە، پاش دابینکردنی تەواوی خاکی ئێرانو سەربەخۆیی سیاسی ناوچەکەو پابەندبوونی بەحکومەتی ناوەندیی ئێرانەوە لەوێنەی (میرەکانی ئەردەڵان)دا خۆی دەرخست. زەنگنەکان هەرچەندە بۆ ماوەی چەند سەدە، کاربەدەستانی سیاسی بوونەو شارەزاییەکی باشیان هەبووە لەکاروباری سەربازیو کارگێڕیدا، بەڵام بۆ پاراستنی دوورترین خاڵی سنووری ئێران، لەباکوورو باشوورو رۆژهەڵاتو

ڕۆژئاواوە پەرت و بڵاوبوونەوەو هەر بەم هۆیەشەوە دەسەڵاتێکی ناوەندی جێگیرو بەردەوامیان نەبووەو خەیاڵی نووسینەوەی مێژوویان نەهاتووە بەسەرداو دەستیان پێ کردووە.

قسەی ئێمە لێرەدا لەسەر رابردوو و ڕەوتی گەشەکردنی مێژووی ئەردەڵانە کەلەبەدواداچوون و پشکنینی ورددا بۆمان دەرئەکەوێ کەئەردەڵان لەگەڵ بزووتنەوەی عەلەوییە توندڕەوەکاندا، هاوڕێ و هاو ئامانج بوونەوەو بەهۆی ئەو پەیوەندییە بنەڕەتییەی کەهەیان بووە، لەگەڵ گۆڕانەکاندا لەسەرەتادا پەیوەندییەکیان هەبووە لەگەڵ ئەم بزووتنەوەیەدا.

ئەوانەی لەمێژووو رابردووی ئەم خاکەدا تێڕامانێکیان هەیە، ئاگاداری ئەوەن کەهەردوو بنەماڵەی سیاسی و مەزهەبی ئەردەڵان و مەردۆخ لەئێران، بەتایبەتی لەکوردستاندا، ڕەسەنایەتی و تواناو گەورەیی و پلەو پایەیەکی ئایینی تایبەتیان هەیەو چەند سەدەیەك وەك پەناگەیەکی سیاسی و ئایینی و مەزهەبی دانیشتووانی کوردستان جێگیربوونەو بەم هۆیەوە دەسەڵاتدارە ئەردەڵانییەکانی زنجیرەی بنەماڵەی ئەردەڵان، لەم چەند سەدەی دواییدا، فەرمانیان داوە بەدانان و نووسینی کتێبگەلێکی مێژوویی، بۆ باسی کاروبارو هەواڵ و بەسەرهاتی کاربەدەستەکانیان و ئەدیب و زاناکانیان هانداوە، بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەو چەند کتێبێکیان لەم بارەوە نووسیوە، لەنێو ئەو بەرهەمانەدا، کتێبی پڕ بایەخی (زبدة التواريخ)ی سەنەندەجی کەتائێستا بڵاونەکراوەتەوە، کتێبی دووهەم مێژووی مەستوورەی ئەردەڵانەو سێهەم کتێبی مێژووی ئەردەڵان و کتێبی چوارەم کتێبی مێژووی مەردۆخە کەتەواوترین و دواترین کتێبی ئەم کاروانە فەرهەنگییەیە، هەروەها زانایانی کورد بەکۆن و تازەوە پەراوێزو

ڕوونکردنەوەی زۆریان لەسەر ئەم بەرهەمانە نووسیوە، زۆربەیان سوودیان لە (تاریخ مردوخ) کردووە، لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا کەمو زۆر لەباسی کاربەدەستانی ئەردەلان و کاروبارو هەواڵی ئەوان قسە کراوە. بوونی کەلەپوورێکی فەرهەنگی وا کەلەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمانوڵڵای خانی ئەردەڵانەوە (١٢١٤- ١٢٤٠) دەستی پێکردووەو دەماودەم گێڕانەوەو دووبارە بوونەوەی بابەتەکان بووە هۆی ئەوەی لێکۆڵەرەوەکان هەوڵ و تەقەلای مێژوونووس و دانەرەکانی پێشتر بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانیان بەتەواو بزانن و لەهەوڵدان بۆ پوخت کردن و ڕەخنەو لێکدانەوە ڕابوەستن، وەك هەموو ئەو بابەتە سیاسی و ئایینییانەی کوردستان بەشێکی گومان لێنەکراو وەریگرن و بۆ خستنەڕووی ڕووخساری پڕ لەهەورازو نشێوی مێژووی کوردستان، هەر بەتەنیا پشت ببەستن بەو سەرچاوانەوە. بەبێ گوێدانە ئەوەی کەئەم گەنجینە زۆرە، لەسەر وێرانەی بەربلاوی سەدەها فەرهەنگ و داب ونەریت و ئایینی ڕەسەن کەتووشی دەسکارییەکی توندڕەوی و لایەنگری مێژوونووسە پێشووەکان بووە، دروستکراوەو لەسەر نابووتی بەڵگەنامەو نووسینە زۆرەکان فەراهەم هاتووە لەپشتی دیواری دەسکاری کردن و گۆڕینی ئەوانە کەدیارە بەبێ ڕاوێژکردنی دەسەڵاتداران و ئارەزووی مێژوونووسەکە خۆی نەهێنراوەتە بەرهەم و بەهەزاران نهێنی هەروا سەری نراوەتەوە. لەئەنجامی ئەم بابەتانەدا، دوو شتی گرنگی بەگەورە دانانی بنەماڵە لەسەر داوای دەسەڵاتدار لەلایەك و توندڕەوی ئایینی نووسەری بابەت لەلایەکیترەوە، کەناتوانێ ڕەخنە لەهیچکامیان بگریت، چونکە ئەم جۆرە کردارە تێکەڵی خوێنی هەموو بوونەوەرێك بووە بەتایبەتی مرۆڤ. بەڵام خاڵێك سەرنجی لێکۆڵەرەوەکانی ئێستاو ڕابردووی

راکێشاوە، ئەویش ئەوەیە کەبەلایدا رەتبوون و تائێستاش لەیەك دوو خاڵدا نەبێ هیچ ئامارژەیەکیان پێ نەکردووە، یەکەمیان ئامارژە پێکردنەکەی ئایەتوڵلای مەردۆخە کەبەوردییەکی تەواوەوە ئامارژەی بەڕاستی مەسەلەکە کردووەو داوای لەوانە کردووە کەبەدوای راستیدا دەگەڕێن رێنماییان بکات، دووهەمیان بەدواداچوونەکانی دکتۆر حیشمەتوڵلای تەبیبی لەسەر کتێبی (توحفەی ناصری)یە کەئەمە یەکەمجارە هەندێ بابەتی گومان لێکراویان خستۆتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

بۆ روونکردنەوەی ئەم بابەتە، سەرەتا دەست دەکەین بەباسکردنی رابردوو و تواناو بەرهەم و ناوچەی گۆرانەکان کە زێدی ئەردەڵانەکانە، لەسەردەمی پەرەسەندنی بزووتنەوەی عەلەوییە توندڕەوەکانەوە، واتە لەسەردەمی (ئالی بویە)وەو پاشان باسی رەگ و بنچی زمانەوانی گۆران و ئەردەڵان لەرابردوویەکی دوورەوە دەکەین، دەربارەی گۆران هاتووە کە(تیرەی کوردان (گۆرانی) کەلەدەقە کۆنە عەرەبییەکاندا بە(جورقان) ناویان بردووە،... ساڵی ٤١٧ی کۆچی، شەڕێکی سەخت لەنێوان ئەو تیرەیەو فەرمانڕەوای کاکویی رووی‌دا، هۆکەشی ئەوەبوو کە(علاء الدولە محمد بن رستم دسمنزیار کاکویی) لەساڵی ٤٣٣ی کۆچیدا، ئامۆزایەکی خۆی کەناوی (ابو جعفر بن فلان بن مرزبان کاکویی) بوو کردە فەرمانڕەوای ناوچەی (خورەم ئاباد) هاوڕێ لەگەڵ ئەودا کوردە گۆرانییەکانی بەسەرکردایەتی (ابو الفرج بابونی) بابون (بیوبانی) لقێکن لەگۆران پەیوەندبوون پێیەوە، شەڕو دەمەقاڵێ لەنێوان ئەو دوو کەسەدا پەیدابوو، واتە ئەبوجەعفەری کاکۆیی و ئەبو فەرەجی بابونی، (علاء الدولة) هەوڵی‌دا کەئەو ناکۆکییە نەهێڵێت، بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو ناکۆکی ئەو دوانە

پەرەی سەند، بەجۆرێکی وا کەئەبو جەعفەر بەدەستی خۆی، ئەبو فەرەجی کوشت، بەدوای ئەوەدا هەموو گۆرانییەکان ڕاپەڕینو دەستیان کرد بەتالان کردن.

(علاء الدولة) ناچار بوو لەشکرێکی ئامادە کردو لەگەڵ ئامۆزایەکی تری خۆیدا کەناوی ئەبو مەنسوورو برای ئەبو جەعفەر بوو، لەگەڵ فەرهادی کوڕی مەرداویجدا، ڕەوانەکرد بۆ ئەویٚو عەلی بن عەمرانی کردە فەرمانڕەوای ئەویٚ (٤١٨) پاشان گۆرانییەکان کەزانییان مەسەلەکە بەو جۆرەیە داوایان لەعەلی بن عمران کرد کەلەگەڵ (علاء الدولة)ڕێکیان بخاتەوە. ئەنجا تاقمێکیان چوونە لایو دەستیان کرد بەرێکەوتن، بەڵام ئەبو جەعفەری کاکۆکیو فەرهادی مەرداویج داوای تەسلیمکردنەوەی ئەو تاقمەیان کردو بەمەیش خۆیان دەستیان دایە کاری توندوتیژیی لەنێوان ئەوانو گۆرانەکاندا چەند شەڕێك ڕوویدا کەسەرکەوتن بۆ عەلی بن عەمرانو گۆرانەکان بوو. فەرهاد شکستی خواردو ئەبو مەنسوورو ئەبو جەعفەر، ئامۆزاکانی (علاء الدولة) گرفتاربوون ئەبو جەعفەر بەدەسیسەی ئەبو فەرەج بابونی کوردی گۆرانی کوژراو ئەبو مەنسور خرایە زیندانەوە، پاشان عەلی کوڕی عەمران کەزانی پەیوەندیی لەگەڵ (علاء الدولة) بەتەواوی تێکچووە، بەوردی لەگەڵیدا هەڵسوکەوتی دەکرد.(الکامل، ج٩،ص ٣٥١-٣٥٢)( فرمانروایان گمنام،ص١٥٣).

هەروا لە(باباتاهیر نامە)دا هاتووە: (..گۆرانییەکان لەدۆستو یارانی بەوەفای ئەمیر (بەدری کوڕی حسنەوەیە)ی برزکانی (٣٩٦-٤٠٥کۆچی) دادەنرێن کەبەرێکەوت ئەو بەدەستی یەکێك لەوان کوژرا. خێڵێکی تر (شازیگان) وادیارە لەناوچەی لوڕستاندا کۆچو کۆچبارییان کردووە.

ئەبوعیسا شادی کوڕی محەمەد کوردی ئەسەد ئابادی (کەساڵی ٤٠٠ی کۆچی کوژراوە)و یەکێك بووە لەمیرە وەفادارەکانی (بەدری حەسنەوەیە)، نازانین بەچ هۆیەکەوە لەسەر ئەو خێڵە دانراوە. بەڵام وادەردەکەوێ کەئیبن شادی ئەسەد ئابادی هەمەدانی دانەری کتێبی بەنرخ و گرانبەهای (مجمل التواریخ والقصص) لەبنەماڵەی ئەبو عیسای ناوبراو بووە.

ئەم تیرەو خێڵە کوردانە لەشاری هەمەدان و دەوروبەریدا، بنەیان هەبووەو هەموو کاتێك یارمەتی شاکانی دەیلەمیان داوەو تێکەڵ بوون لەگەڵیانداو پەیوەندیی جۆراوجۆریان هەبووە لەگەڵیدا، بۆنموونە لەساڵی (٣٨١)ی کۆچیدا، میر فەخرولدەولەی دەیلەمی لەهەمەدان، بەهۆی میر ئەبو عیسا شادی ئەسەد ئابادی کەناومان بردن، کچەکەی بەدری کوڕی حەسنەوەیەی بەرزەکانی خواست بۆ مەجدو دەولە ئەبو تالیبی رستمی کوڕی. هەروەها ئەبو عیسا شادی ئەو میرە ئەسەد ئابادییەیە کەئەمیر سەیید مورتەزا ئەبو هاشم زەید حەسەنی بەناوبانگ کچەزای ئەوبوو.

پەیوەندیی توندوتۆڵی بنەماڵەی عەلەوییەکانی هەمەدان لەگەڵ کوردە گۆرانەکاندا یاشایگان تاکۆتایی (سەرەتای سەدەی حەوتەم) بەردەوام بووە،(فرمانروایان گمنام، اذکیایی،ص١٣٥-١٥٣-١٨٧) کوردە گۆرانییەکان لەمێژووی سیاسی و فەرهەنگی خۆراوای ئێراندا، هاوبەشییەکی بەرچاوو بەلام نادیاریان هەبووە، ناکۆکی یا بەیەکدانی چوونی ئەوان تەنیا پەیوەندی بەلقی (بابونی) (بیویانی) گۆرانەکان بووە، لەگەڵ کاکەییەکانی شاخدا، وەك لەپێشەوە ئامارەمان پێدا. (الکامل فی التاریخ،ج٩،ص٣٥١-٣٥٢)لەساڵی ٤٠٥ی کۆچی ١٠١٤م بەدری کوڕی حەسنەویەی بەرزەکانی، لەهەوڵدانێکیدا بۆ دەستگرتن بەسەر ئەو ناوچەیەی کەلەژێر دەسەڵاتی حسێنی کوڕی مەسعود کوردی

(سیروانی)، بەهۆی هەندێ لەیاوەرەکانی خۆیەوە دەکوژرێت. بەقسەی (ابن الاثیر) حوسەینی کوڕی مەسعود کوردی، لاشەکەی بەدری حەسنەوەیهی رەوانەی نەجەف کرد، تا لەتەنیشت ئارامگەی ئیمام عەلییەوە بنێژرێ. (الکامل،ج٩،ص٢٤٨) ئەم حسێن مەسعودی کوردی گۆرانی ئەمیری (سیروان)ە، هەمان خۆشین مەسعودی ناسراوەو کەسێهەمین کەسە پاش خواو ئیمامی عەلی بەلای فیرقەی گۆرانی ئەهلی حەقەوە، کەباباتاهیری هەمەدانی یەکێکە لەچوار یارەکەی ئەو. (کەلەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەی پێکرا) (بابا طاهرنامە،ص١٣٩)

دەربارەی گۆران و بنەما زمانەوانییەکەی، لێکۆڵینەوەکەی رۆژهەڵاتناسی روسی (گ. ب ئاکوپف) (هاکوبیان) کەلەم دواییەدا وەرگێڕاوەتە سەرزمانی فارسی و بلاوکراوەتەوە لەلایەن سیروسی ئێراندۆستەوە، ئەخەینە بەرچاو، بەو مەبەستەی کەهەم لەهەوڵی بەربلاوی ئەو سوودمەندبین و هەم ئەو بەهەڵەداچوونانەی راست بکەینەوە. لەم کتێبەدا سەبارەت بەوشەی گۆران و بنەماکەیدا هاتووە:

(.. نووسینەکی بورهانی تەبریزی دەربارەی وشەی گۆران شایانی سەرنجدانە، ئەو دەنووسێ: گۆران ناوی ئاگر پەرستانێکن کەلەپەیڕەوانی زەردەشتین. (برهان قاطع، تهران١٣٣٦،ص١٠١١) لەم نووسینەدا دوو خاڵی زۆر گرنگ شایستەی ئەوەیە لێی بڕوانین. یەکەم رێگەی ئەوەمان پێ دەدا کەپیشەی گۆران بەمانای ئاگر بەکوردی (گور) بگەیەنینەوە بەیەك، چونکە هاوشێوەی نزیك بەو لەکوردیدا کەم نین. ئەزانین کەوشەی (شەمسیك) لەوشەی عەرەبی

(شەمس)ی بەمانا خۆرەوە هاتووەو، ئەزانین[1] کە شەرەفخانی بەدلیسی ناوی (رۆژەکی) لەوشەی رۆژەوە بەهەمان مانا هێناوە،(شرف نامە،چ١،موسکو١٩٧٦،ص٤٠٣) سەرەڕای ئەوەی دەرکەوت ناوی (سۆران) لەوشەی کوردیی (سوور)ەوە هاتووە بەمانای خۆر (وە دتیل، کتابخانە برای قرائت، چ١٨٤٩،٩٥،ص١٩٧) کەواتە ئێمە بنەمایەکمان هەیە بۆئەوەی کەوشەی گۆران لەگوڕی بەمانا ئاگرەوە هاتبێ و وەك وشەی ئاگر پەرست بیخەینەڕوو V.minorsky. Notes sur lasecte des Ahl-e Haqq- paris, 1921، لەم رووەوە روونکردنەوەیەکی وەها زیاتر گومانی لێدەکرێت کەیەکەمجار بەشی زۆری گۆرانەکان لەسەر رێبازی (علی الله)ین و شێخ عەبدولقادری گەیلانی[2] ئەم رێبازە ئایینییەی لەگەڵ مەزهەبی ئیسماعیلییەکان و تەنانەت (قەرمەتی)یەکانی بەیەك شت داناوەو لەم بارەیەوە نووسیویەتی کەتەنیا کوردە کۆچەرییەکان و پاشماوەی زەردەشتییەکان توانیویانە بچنەسەر ئەم ئایینە. V.lranow. The truth-worshpers of kurdistan,1953,p.18

ئەم قسەیە لەگەڵ ئەو هەموو دوژمنایەتییەی بەرامبەر بەپاشماوەی زەردەشتییەکان هەیەتی، خاڵێکی گرانبەهاو بەنرخی تیایە دەربارەی پەیوەندیو رێبازی (علی الله)یەکان بەبیروباوەڕی ئایینی کۆنی ئێرانەوە. (ف. کۆمەن) کەلەسەر کتێبەکەی ف. مینورسکی نووسیویەتی دەڵێ لەم رێبازە ئایینییەدا، ئایینی زۆر کۆنی موغەکان لەشوێندا

---

[1] هەروەکو دەزانین حەزرەتی ئیبراهیم لەسەر زەمینی بابلەوە بۆ نیمچە دوورگەی عەرەب کۆچی کردووەو، لەراستیدا بنەماڵەی قورەیش بەعەرەب بوون، نەعەرەبن و نەسامی، بەڵکو بەرەچەڵەك دەگەڕێنەوە بۆ سەرزەمینی بابل کەنزیکی بەغداو دەشتەکانی پاڵ زاگرۆس و، هەندێ سەرچاوە دەگێڕنەوە کەحەزرەتی ئیبراهیم و زەردەشت یەك کەسن؟!

[2] سەرچاوەی ئەم وتەیە لەشێخ عەبدولقادری گەیلانییەوە وەرنەگیراوە.

ماوەتەوە. Suria,1222,p.262-263 بەگوێرەی بۆچوونی پ. لیرخ ڕێبازی (علی الله)ی تەنیا کارێکی زیرەکانەیە بۆ داپۆشینی ئاگر پەرستییەکەیانە[1].

لەم سەروبەندەدا ئەگەر لەم بارەیەوە قسە نەکەین کەعەلی لەراستیدا لای ئەوان بەخودا دانەنراوە، بەڵکو بەیەکێك لەو حەوت نمایانگەرەی ئەو عەلی لەناو عەلی اللهی‌یەکاندا، وەك ئیڤانوف دەڵێ: بەهیچ شێوەیەك ناوی خەلیفەی چوارەم نەبووە، خودی بەبێ‌نیاز دانانی عەلی (V.ivanow.p.55) جۆرێکە لەبت پەرستی لەکۆنترین شێوەیدا[2].

ئەگەرچی مەبەست لەم نووسینە، سووکایەتی‌کردن بەعەلیوڵلاهییەکان نییە: H.southgate. Narrative of atour through Armenia:

[Kurdistan, Persia and Mesopotamia V.l, london,1840,P140-142]

لەرۆژگاری ژیانی عەلی کوڕی ئەبی تالبدا، یەکێك لەعەرەبەکان بەناوی عەبدوڵلای کوری سەعد (مەبەستی عەبدوڵلای کوڕی سەبایە) دەیگوت عەلی خوایە، حەزرەتی عەلی لەوەڵامی ئەم قسەیەدا فەرمووی تاعەبدوڵلاو پەیڕەوانی بگرن‌و بیانخەنە ناو ئاگرەوە. ئەمانە هەر کەخرانە ناو ئاگرەکەوە هاواریان لێ بەرزبوویەوەو گوتیان ئێستا، بەتەواوی بۆمان دەرکەوت کەعەلی خوایە. چونکە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی کەس ناتوانێ بەسووتاندن سزای کەس بدا تەنها خوا نەبێ. {E.B.Soane,P.385}[3]

---

[1] لەکاتتێکدا خودی زەردەشتییەکان، ئاگرپەرستی ڕەتدەکەنەوەو خۆیان بەئاگر پەرست نازانن (آتش درایران باستان. موبد اردشیر آذر کشسب) ئەمە کارە ناڕەواکانی رۆژهەڵاتنووسانە.

[2] مەبەست لە (اعلی) باڵاترە، واتە خوایە، ئیوانۆف ئەگەر وەها شتێکی گوتبێت، مەبەستی (تناسخ)ە بەپێی ئایینی عەلەوییە توندڕەوەکان واتە ئەهلی حەق، واتە لەخوار خوداوە دایاننـاوەو، نووسەری بابەتەکە (گ.ب. ئاکۆپۆڤ، هاکۆپیان) نەیتوانیوە بەباشی مەسەلەکە بپێکێت‌و بابەتەکەی شێواندووە.

[3] ئەگەر مەزهەبی ئەهلی حەق بەپێی هاکۆپیان لەئایینی هەرەکۆنی موغانەوە بێت، گێڕانەوەی ئەو ئایینە بۆ عەبدوڵلای کوڕی سەبا کەسایەتیی خەیاڵی یان جولەکە یان عەرەب چۆن لێکبدەینەوە، چونکە بەرز ڕاگرتنی فەرهەنگی ئێران یەکێکە لەئارمانەکانی ئەهەلی حەق‌و هەروەها دانانی ئەستەنگ لەبەردەم فەرهەنگ‌و داب‌و نەریتی عەرەب‌و دەسەڵاتی عەرەب‌و بێگانەدان ئیتر عەرەبێکی وابەستە بەفەرهەنگی بەر لەئیسلام ئەتوانێ دامەزرێنەری وەها=

لێرەدا خاڵێکمان بۆ روون دەبێتەوە، کەلەبەرچی یەکێك لەپیاوە پیرۆزەکانی رێبازی (علی اللهی) گوتویەتی: (عەلی منم)(V.ivahow,p.205) ناوی ئەم پیاوە پیرۆزە (خوان ئاتەش) بووە (مەبەستی خان ئاتەشە کەگەورەی بنەماڵەی ئاتەش بەگییەکانەو بەشاخورشیدی موشەعشەعی ناسراوە)، بۆیە وەك یەك سەیرکردنی علیوڵلا گەری، لەگەڵ گروپی ئەرمەنی (ئارەوردیکها) (کوڕانی خۆر) شتێکی سەرسووڕهێنەر نییە.(هەمان سەرچاوە،ص٣٧و٧٠) هەر لەم بارەیەوە گفتوگۆی ئەوان لەگەڵ (ئیبن فقیە)دا دەنگدانەوەیەکی تایبەتی هەیە کەپێیان گوتووە:

فقیها! ما خدا نیستیم، امّا از خداییم ریشه ماآتش استو از آتش زادەایم

واتە:

ئەی مەلا ئێمە خوانین، بەڵام لەخواین، ریشەی ئێمە ئاگرەو لەئاگر پەیدابووین.

(وەرگێر بۆ زمانی فارسی دووبارە لەرووسییەوە وەریگێراوە بۆ فارسی)[1]

ئەم خاڵانە رووناکییەکە بۆسەر چۆنیەتی کرانەوەی گۆران وەك (ئاگرپەرست)و وا لەئێمە دەکات بۆ دۆزینەوەی رەگو ریشەی بیروباوەڕی گۆرانە علیوڵلاهییەکان وەك هـ.راولینسن لەخەیاڵی ئەوەدابووە، لەشوێنە کۆنو دێرینەکاندا دەست بکەین بەگەڕان بەدوایاندا.(-H.Rawlinson JRGS.VIX,pt1.1839,P 36) جگە لەوەش بابەتی سەرەکی ئەفسانەکانی ئەوان

---

= مەزهەبێك بێت، کەسێ کەعەرەب بێتو پشت بە وتەکانی پێغەمبەری خودا ببەستێت، چۆن عەلی وەکو خودا ستایش دەکات؟!

(١) دەقی دێرەکە ئەمەیە، کە لەوەڵامی بابافەقێدا شا خۆشین گوتویەتی:

فقیه ماخدا نیستیم ولی با خدائیم اصلمان خوراست از خورزائیم
اول قلندر ما بودیم آخرهم مائیم بلی راه قلندران بەکس ننمائیم

کوڕی فەقیە هەڵەیە (تذکره اعلی،ص٤٤، چاپی بۆمبای) گەلێ هەڵەی تێدایە.

پەیوەندیی بەلوڕستان و بەتایبەتی باشووری کوردستان و بەتایبەتی زەهاوو دەوروبەری رووباری سیروان و چەند شوێنی‌ترە{V.Minorsky,The Guran.Bsoas V,XI.Pt.1.1943}. هەر لەم بارەیەوە گێڕانەوەی ئەم خاڵە گرنگە کەعەلیوللاهییەکان لەگەڵ بوونی بیروباوەڕی دێرین و کۆن بەگیروگەڕهاتووە، بەمانای گیر، لەکاتێکدا لەناوچەی زەهاو دەڵێن گوڕ بەمانای کلپەی ئاگر {نیکتیین، کردان، موسکو، ١٩٦٤، ص٣٤٥-٣٤٦} یادەکانی داوودیان لادە وەکو پەیکەری کۆن وایە لەسۆنگەی رێورەسمی ئایینی ئاگر پەرستەکانەوە{E.B.S Oane, p384}[1]

هەموو ئەمانە ئەو قسەیەی ( ک بودە) بۆ ئێمە روون دەکاتەوە کەلەناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمدا گوتویەتی: (کوردە گۆرانەکان بڕێکن لەو ژمارە کەمەی کەتارادەیەك زمانی کۆنی گاورانیان پاراستووە.{یاداشتهای سفر، ج١٢٣، ص١٨، ك.بودە} شتێکی سەیر نییە کەف. مینورسکی) لەبەر راستای ئەم بۆچوون و بیرکردنەوەیەدا(Bode. Travels.. V.1.p.180) بەپشت بەستن بەزمان و فەرهەنگی خەڵکی باشووری کوردستان دەڵێ: ئەم کوردانە خەڵکانێکی نیشتەجێی بەرەچەڵەکیئەو خاکەن و دوورنییە کەبەهۆی ئەوەوە کەلەبەشی خۆراوای خاکی مادەکاندا ژیاون، یەکێك بن لەمیراتگرانی راستەوخۆی ئەوان.(و.ف مینورسکی.کردان، پترزبورگ، ١٩١٥ص٣)

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئایا لەرۆژگاری زۆر کۆندا، ناوی گۆرانەکان باسکراوە یانا؟ لە گەڕان بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا، ناتوانین ناوی گائورانیە کەلەدەقە ئاشوورییەکاندا هاتووە (لەنێوان ئورارتۆو خاکی

---

[1] لەسەرووی ئەم تاقەوە، مەزاری داوود کەبود سواری خۆراسانییە، کەوەکو کارخانەی دروستکردنی ئامرازی شەڕ سوودی لێوەرگرتووە، بۆیە بەلای یارانی ئەهلی حەقەوە پەسەند بووەو، هیچ پەیوەندییەکی بەرێورەسمی ئاگر پەرستانەوە نییە.

هێمڕە) (ئەی. ئێم. دیاکنف) لەبەرچاو نەگرین، جگە لەوە هێمڕە، هەر ئەو کیمریەیە کەلەسەدەی هەشتەمی پێش عیسادا لەبەشێکی باشووری دەریاچەی ورمێدا بووە. بەڵام لێرەدا ڕووبەڕووی بارێکی‌تر دەبینەوە، کەخاکی گائورانیە لەدەقە ئوراراتۆییەکاندا بەبەشێك دانراوە کەدەبێ لەناوی ئەمڕۆی گارتی لە ئەرمەنستاندا بۆی بگەڕێین. پترۆڤسکی ئەم بەراورد کردنەی بەلاوە پەسەند نییەو دەڵێ کەلێرەدا دەبێ، هیمڕە کەلەسەرچاوە ئاشوورییەکاندا ناوی هاتووە کیمرەی کەناری ورمێ نییە، بەڵکو دەبێ لە(کاپادوکییە)دا چاوی بۆ بگێڕین. (ب.ب.پیترفسکی & پادشاهان وان، موسکو،١٩٥٩،ص٢٣٢-٢٣٣) بەڵام وادەرئەکەوێ ئەگەر وابێ گۆرانییەدا هیچ پەیوەندییەکی بەگۆرانەکانەوە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کام لەمانە دژی وابەستەیی گۆرانەکان و لەناویاندا عەلیوڵلاهییەکان بەرۆژگاری کۆنی باشووری کوردستانەوە نییە، پلەوپایەی بەرزو بەناوبانگی سوڵتان سەهاك یەکێکە لەبەڵگە لەژمارە نەهاتووەکان(و.ف.مینورسکی، جستارهایی پیرامون بررسی خاورزمین،ج٢،پیزبورگ،١٩١٥،ص٢٠١) لەسەر ئەو مەسەلەیەو ئەو هەولانەی کە و.ئیڤانۆڤ دەیدا بۆ ڕاستکردنەوەی ئەوەی کەناوی سهاك شێوەیەکی ناوی ئەرمەنییانەی ئیسحاقە واتا زاهاك(V.Ivanov,p.8-9)، بەڵگەیەك لەبەردەستدا نییە کە ئەوەندە دووربکەوینەوە بۆ پەیدابوونی ئەو ناوە، چونکە لەناو کوردەکاندا، ناوی زوحاك ناوێکی نامۆ نییە، قسە لەسەر ناوی زوحاك شایە کەلەداستانە کۆنەکانی ئاوێستاو لەشانامەی فیردەوسی گەورەدا، ئاگادارین لێی و چەند جار ئەم ناوەیان لەگەڵ ناوی دهیوك پاشای ماددا بەیەك ناو داناوە[1] (G. Rawlin Son. History of Herodotus. London.1880.p.95) بەلەبەرچاوگرتنی ئەم

---

(١) مەبەست ئاژی دەهاکە، گوندێکە لەدهۆکی باکووری عیراق و، یەکێکە لەمەڵبەندەکانی یەزیدییەکان.

خالانە نابێ ئەوە لەبیربکەین کەزیارەتگەی سولتان سەهاك لەیادگارە کۆنەکانی هاوتای داوودە کەبەهی ئاستیاگ شای دادەنێن.(E.Herzfeld Archeological.History of Iran. London,1935.p.30) جگە لەوەش پەیکەری کەسێکی ئاگرپەرستی مادی لەسەر هەڵکەنراوە.[1] (فهرست مختصری از آثار وابنیه تاریخی ایران، رساله۱، تهران،۱۳۰۲،ص۳٦) لێرەوە دەرئەکەوێ کەرێزلێنانەکەی زوحاك (شای ئەفسانەیی) کەزۆر کەس لەگەڵ کردانشای مادیدا کە (کەسایەتییەکی جێگومانی مێژوویيە) بەیەك ئەزانن. وەك میراتێك لەباوكو باپیرە کۆنەکان مابێتەوە.( safrastian,Kurds, and Kurdistan. london,1984).

دەبێ ئەوەش بڵێین کەئەمە تاکە یادگارێك نییە کەپەیوەندیی هەبێت بەناوی زوحاکەوە، یاقوتی مێژوونووس لەباسی شارەزووردا دەڵێ، شارەزوور کەیەکێکە لەبنکە مێژووییەکانی کوردستان، بەدەستی ئەم خوێن خۆرە دروستکراوە.(تاریخ شهرزور،ص۲۱۲-۲۲۲ سون) لەخۆڕاییش نییە کەناوی ئەم شارە، وەك شارێکی پڕ لەستەمو زۆر باسکراوە[2]. بەکورتی پەیوەندیی عەلیوڵلاهییەکانو و گۆرانەکان بەرۆژگاری کۆنی ئەم خاكو بوومەوە لەم خالانەداو شتێکی سەیر نییە کە و. ف. مینورسکی لەو بەرهەمەدا کەلێکۆڵینەوەیە لەسەر گۆران لەگەڵ ئەوەدا کەخۆی دەڵێ دەربارەی پەیدابوونی گۆرانەکان لەدەیلەمەکان[3] گوبرگ دەڵێت ئەمانە زیاتر لەدوو

---

[1] ئەم هەواڵە دوورە لەڕاستییەوە، مەزاری حەزرەتی سوڵتان ئیسحاقی عەلەوی بەرزنجی، لەپەردیوەری هەورامانی سەر بەپاوەی پارێزگای کرماشانە، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەشتەمی کۆچیو تائێستا چەند جار لەلایەن پەیرەوانییەوە چاکسازی کراوە، ئەو رۆژهەڵاتناسە روسییە بەڕێزە، مەزارەکەی سوڵتان ئیسحاقی لەگەڵ ئیسحاقی هەرسیندا تێکەڵ کردووەو لەگەڵ مەسەلەی دوکانی داوود کەهەندێ شوێنەوارناسان بەمەزاری ئاژدی دەهاکی دەزانن تێکەڵو پێکەڵی کردووە.

[2] زور ناوی کوڕی زوحاکە، نەك ئەوەی، زور ئامارە بوویێت بەستەمی زوحاك. (معجم البلدان،ج۳،ص۳٤۰)

[3] دیالمەکانیش باوەکو شیعەی زەیدی بوونە، بەلام لەعەلەوییە توندڕەوەکانن (تاریخ آل بویه، فقیهی)

هەزار ساڵە لەباشووری کوردستاندا دەژین.(و.نیکتین، کردان، موسکو،١٩٦٤،ص٢٠٠) بەم شێوەیە، پاش چاوخشاندنەوەیەك بەو زانیاریانەدا کەدەڵێن گۆرانەکان لەرۆژگارێکی زۆر کۆنەوە، لەم شوێنەی ئێستایاندا دەژین، دەست ئەکەین بەلێکدانەوەی مانای وشەی گۆران. لەسەرەتادا دەبێ ئەوە باس بکەین کەلەکتێبی شەرەفنامەدا، سێ جار ناوی گۆران هاتووە، بەمانای تیرەیەکی تایبەت: یەکجار لەو داستانەدا کەدەڵێ پیاوێك بەناوی شاهوردی ئیدیعای فەرمانڕەوای لوڕستانی دەکردو لەشەڕدا لەگەڵ شاعەباس، چەند کەسێکی لەتیرەی گۆران لەدەوری خۆی کۆکردبووەوە.(شرف نامە، چاپ قاهیرە، ص٣٨٢) دووهەم جار لەم باسەدا کەدەڵێ، بنەچەی بنەماڵەی فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان لەنێو تیرەی گۆراندا ژیاون(شرف نامە،ص١١٨). سێهەمجار لەو باسەدا کەپەیوەندیی بەفەرمانڕەوایانی برادۆستەوە هەیە کە لەتیرەی گۆران پەیدابوون.(شرف نامە،ص٣٨٢)

لەم نووسینانەوە بۆمان دەرئەکەوێ کەگۆران بەلای شەرەفخانەوە، ناوی تیرەو هۆزێکی تایبەتە. کەئەویش هەر ئەو تیرەیەیە کە ئاکۆپۆف لەکتێبی (کردان گوران ص٥٦-٦٠) ناویان دەبات.

پاش پێداچوونەوەو راستکردنەوەو روونکردنەوەی وشەی گۆران کەخرایە بەرچاو، لێکۆڵەرەوەی ناوبراو، سەبارەت بەوشەی ئەردەڵان لەسەری دەڕواو دەڵێ: (..لێرەوە دەست پێدەکەین، کەچونکە هیچ کلیلێکمان بەدەستەوە نییە، بۆ دەرخستنی مانای ناوی ئەردەڵان. ئێمە وای بۆدەچین کە لەوشەی کوردی (ئەرد = زەوی) وەرگیرابێ و ناوی نەتەوەیی ئالان. شیکردنەوەیەکی لەم جۆرە شایانی سەرنجدانە، چونکە لەخۆرئاوای ئەردەڵاندا، شوێنگەلێکی زۆر هەیە کەناوی ئالانی تێدانە، بۆ نموونە قەڵای

کەڵهوڕی ئالانی کەلەسەرەوە باسمان کرد، هەروەها ناوچەی ئالان و شاخی ئالان و هیتر(خلاصه تاریخ الکردو کردستان،ج١،ص٧)، ئەگەر بوونی وشەی ئالان وەکو ناو لەناو کوردا بخەینە سەر ئەو بەڵگانەی سەرەوە، ئەوکاتە بۆمان روون دەبێتەوە کەدۆزینەوەی یەکەی ئەردەڵانەکان و گروپە کوردییە دراوسێکانیان، خاوەنی رەگوریشەیەکی قووڵە کەلەسەدەکانی ناوەڕاستدا لەو کاتەدا کەهەموو ئەم خاکە لەگەورەترین ناوچەیەکی فیودالیدا لەکوردستان -میرنشینی ئەردەڵان-بوونە (شرف نامه،١،موسکو، ١٩٦٧،ص١٤٦-١٥٢). کەواتە پەیوەندیی نزیکی مێژوویی ئەردەڵانییەکان لەگەڵ دراوسێکانیاندا، بەتایبەتی هەورامییەکان شتێکی سەیر نییە.(Cl. Rich.1.p.202)

بەسەیرکردنی پەیوەندیی نەتەوەیی خەڵکی ئەردەڵان وەبیری دەهێنینەوە کەشەرەفخانی بەتلیسی، لەگەڵ ئەوەی ویلایەتی ئەردەڵان لەگۆرانەکان جیاکردۆتەوە، بەڵام بنەماڵەی فەرمانڕەوایانی ئەردەڵانی لەگەڵ گۆرانەکاندا تێکەڵ بەیەك داناوەو لەهەمان شوێندا باس لەوە دەکا کەبنەماڵەی ئەردەڵانییەکان بوونێکی کرمانجی کوردییان هەیە. لەم بارەوە بۆچوونی لێکۆڵەرەوەکانی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی، لەنێو ئەوانەدا (کیتر) وریچ شایانی تێڕامانە کەدەڵێن، لەکاتێکدا کەبنەماڵەی ئەردەلانییەکان کوردن، زۆربەی سەرانی ئەردەڵان گۆرانن، بەرێکەوتیش نییە کە(دیتر) یش باسی ئەوەی کردووە، سەرانی ئەم ویلایەتە لقێکن لەگۆرانەکان،{K. Ritter Erkunde, IX. S. 622} سون دەڵێ: ئێستا وادیارە لەم ناوچانەدا (لەنێوان هەورامان و کندول دا) خەڵکانێك نیشتەجێبوون و دەژین کەبەگۆران بەناوبانگن و بەزاراوەیەك قسە دەکەن کەلەسەرەوە گوتمان، ئەمەش ئەو شێوە ئاخاوتنەیە کەتائێستا لەناو خێڵە نیشتەجێبووەکانی

هەوراماندا قسەی پێدەکرێت. ئەم زمانە ئەمڕۆ تارادەیەك زمانی کلاسیکیی عەشیرەتی ئەردەڵانەو لەچامە پڕ بەهاکاندا بەکاردەهێنرێت، ئەم زمانەی (ئائورمی) بەهەورامی یا شارەزووری ناودەبرێت.(و.نیکیتین،کردان، موسکو،١٩٦٤،ص٢٦٢)

لەم قسەیەوە ئەوە بەرچاودەکەوێ کەگۆرانی هەر ئەو زمانە دێرینەی خێڵەکانی ئەردەڵانە. باس دەربارەی ناوچەیەکە ئەتوانرێت بڵێین: نیوەی خاکی باشووری کوردستانی لەخۆگرتووەو ئەم ناوچەیە لەسەدەی نۆزدەهەمی زایینی‌دا، جوانرۆو هەورامان‌و مەریوان‌و حەسەن ئابادو ئەسفەند ئابادو بانەشی گرتووەتەوە.{Cl.Rich 1.p.217} بەرێکەوتیش نییە کاتێ کەباس لەکوردستانی ئێران دەکرێ ئەردەڵان هەر لەبەرچاوە.(ف.چرنۆزۆبف، اردلان یا کردستان ایران، ستاد منطقه نظامی قفقاز،ش،٣٣،١٩١٣)

(..خستنە بەرچاوی ئەو بەشانەی (پڵنگانیان) تیایدا دەژین دژوارترە، چونکە ئەم ناوە نەگەیشتووەتە ئەم رۆژگارەی ئێمە. دەبێ ئەوەش بڵێین کەرووباری ئەڵوەند جۆگەیەکی لێ‌جیادەبێتەوە بەناوی (پەلکانە)، ئەگەر ئێمە ئەوە بەشوێنی ژیانی پڵنگانییەکان دابنێین، بۆمان روون دەبێتەوەو دەتوانین بڵێین، هەموو خاکی ئەوانە لەدەوروبەری ئەم رووبارەدایە. شەرەف خانی بەدەلیسی دەڵێت کەقەڵاکانی دێودژ، نۆدژ، دژیمان، گەواە دژ، مور، گلانەو نوشورو مراە من لەو قەڵاو ناوچانەن کە لەسەردەمی ئەوانە بوون، شوێنی ئەم هەموو قەڵایانە لەهێڵێك لەباکووری پشتکۆی لوڕستانەوە بەرەو قەڵاکانی دەرتەنگی، پاوە، رەوانسەر، و دواتر بەرەو قەڵای ئالانی لەناوچەیەکدا بەهەمان ناو لەباشووری کوردستانی ناوەندیدا کشاوە، بەئاسانی دەردەکەوێ.(؟!)

لەم باسانە روون ئەبێتەوە کە کەڵهوڕەکان لەدەشتەکانی خوارووی

کرماشانی ئەمڕۆداو، ئەگەر بەقسەکانی ریچ باوەڕ بکەین، تا هەورامانو سلێمانی دراوسێی دا ژیاون.(Cl.Rich Narrative..1.p.217-281)

سەبارەت بەپاڵنکان کەبنەڕەتی مەبەستەکەی ئێمەیە لەم نووسینەدا (هاکوپیان)یش کەوتووەتە هەڵەوە، چونکە قەڵای پڵنگان لەقەڵا ناودارو گەورەکانی کوردستانو ناوەندی گۆرانو ئەردەڵان بووە، ئێستاش هەر شوێنەوارەکانی ماوەو لەباکوورەوە شاخی شاهۆو لەباشوورەوە رووباری گاوروودو لەخۆرهەڵاتەوە هەورامانو لەخۆراواوە ناوچەی کامیاران سنوورەکەیەتی.

پاش ئەم روونکردنەوەیەو راستکردنەوەی هەڵەکان، دەستدەکەین بەباسی چۆنیەتی دەسەڵات گرتنە دەستی ئەردەڵانییەکان لەناو عەلەوییە توندڕەوەکانداو سەرکوتکردنو پاشەکشەکردنی عەلەوییەکان بەرەو دالاهۆ.

هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی چەند بزووتنەوەیەکی بەهێزی ئایینی، بەرامبەر بەبزووتنەوەی عەلەوییەکانی زاگرۆس، بەتایبەتی لەکوردستانی هاو سنوور لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، کەبزووتنەوەی عەلەوییەکانی پێ خۆش نەبوو و بەکۆسپیانی دادەنا لەرێی پەرەسەندنی دەسەڵاتی خۆیدا، بەرەو نیمچە کیشوەری هیند چەند بنەماڵەیەکی گەورەو خاوەنی رابردووی نەتەوەییو ئایینیو زانست، لەدوو رەهەندی فیکری- بیروباوەڕی ئایینیو سیاسی- سەربازییەوە لەناوچەکەدا دەسەڵاتیان کەوتە دەستو سەریان هەڵداو بەهەموو هێزێکی خۆیانەوە، دەستیان کرد بەسڕینەوەی ئاسەواری عەلەوییەکانو پەیڕەوانیانو کەوتنە دانانی مێژووی ناوچەکەو تۆمارکردنی دەرمارگیرانەی چەند رووداوێك بۆ لەناوبردنی کەلەپووری عەلەوییەکان لەم ناوچەیەدا. سەیر لەوەدایە هەردوو بزووتنەوەکە لەناوجەرگەی

عەلەوییەکانی زاگرۆس (کوردستان)دا پەیدابوون.

جگە لەبنەماڵەی عەلەوییە سەفەوییەکان کەلەسەرەوە باسکرا، دوو بنەماڵەی کۆن و رەسەنی‌تر زنجیرە بنەماڵەی سیاسی و ئایینی ئەردەلان و مەردوخەکانن، کە ئایەتوللا شێخ محەمەدی مەردوخ لەکتێبی مێژووی خۆیدا، بەزیرەکییەکی تەواوەوە لەدوو توێی دەربڕینی بیروبۆچوونی خۆیدا، راستی بابەتەکەی خستووەتەڕوو، بەلام لەباسکردنی ئاشکرای بابەتەکەدا لەبەر چەند هۆیەك، خۆی دوورەپەرێز گرتووە، لێرەدا پێویستە بۆ روونکردنەوەی رێڕەوی باری جوگرافی بزووتنەوەی عەلەوییەکانی زاگرۆس دەست بکەین بە بەدواداچوون و رەخنەگرتن لەم بابەتە.

ئایەتوڵلای مەردۆخ و ئەوانی‌تر وەك نووسەری کتێبی (توحفەی ناسری)، حەدیقەی ناسری، مێژووی ئەردەلان و هی‌تر.. دەربارەی وشە و سەرهەڵدانی ئەردەلان کەهەموو ئەو بۆچوونانە لەمێژووەکەی مەردۆخدا هاتووە دەنووسێ: (ئەردەلان کۆی (ئەردەڵ)و تیرەی فەرمانڕەوایانی کوردستان کەلەنەوەی قوبادی یەکەمن پێیان دەڵێن ئەردەلان، ئەردەلانییەکان دەڵێن قوبادیان بە(بابا ئەرەدەڵ)یش ناوبردووە. گێڕانەوەو باسکردنی مێژوونووسەکان لەسەر قوبادی یەکەم جۆراوجۆرە.

هەندێك نووسیویانە کە قوبادی ئەردەڵ کوڕەزای خەسرەو ناوێکی ئاشەوان بووە کە کاتێك یەزدگوردی شای ئێران کە لەساڵی ٣١ی کۆچیدا شکستی خواردو لەدەستی سوپای ئیسلام دەربەدەر ئەبێ و خۆی لە(مەرو) ئەشارێتەوە لەگەڵ ئەو ئاشەوانەدا ئەبن بەبرادەر، خەسرەو شەوێك یەزدگورد ئەکوژێت و چی پارەو گەوهەری ئەو شایە بوو هەمووی دەبات و بەو هۆیەوە سامانێکی زۆری لا کۆدەبێتەوەو، بەهرامی کوڕی دەخاتە

سەرکاری بازرگانیکردن. پاش مردنی خەسرەو بەهرامی کوڕیشی لەساڵی ٦٥ی کۆچیدا لەشەڕی موهەللەبی کوری ئەبی سەفرەی فەرمانڕەوای خۆراسان لەگەڵ (ئەزاریقە)کاندا ئەکوژرێ. کوڕی ئەمیش کەهەرناوی قوبادە لەساڵی ٨٦ی کۆچیدا، دەبێ بەخزمەتکاری تایبەتی (قوتەیبە)ی فەرمانڕەوای خۆراسان. لەکاتی پەیدابوون و سەرهەڵدانی ئەبو موسلیمی خۆراسانیدا لەمەرو، واتە سەردەمی (سەفاح ئەبولعەباس عەبدوللای عەباسی)، قوبادی ناوبراو لەساڵی ١٣٢ی کۆچیدا، لەگەڵ کەس وکارەکەی خۆیدا کۆچ ئەکەن بەرەو مووسڵ. پاش ماوەیەك لەوێ دەسەڵات پەیدا دەکاو دەبێ بەفەرمانڕەوای دیاربەکرو مووسڵ. لەئەنجامیشدا کوڕو کوڕەزاکانی ناوچەی شارەزوور دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەو دوای ئەوە دەست بەسەر ناوچەی شارباژێریشدا دەگرن و بەدوای ئەودا شاری عەمادییە. ئەمانە تا ساڵی ٥٦٤ی کۆچی لەناوچەی شارەزوور فەرمانڕەوایی دەکەن و قەڵای زەڵم یان بنیات ناوە بۆ شوێنی فەرمانڕەوایی خۆیان. لەدواجاریشدا (پڵنگان) کەشوێنی تیرەی کەڵهوڕو گۆران بوو کەوتە ژێر دەستی ئەردەڵانیەکان و لەوێشدا، قەڵایەکی قایمیان بۆ ناوەندی فەرمانڕەوایی خۆیان دروستکرد کە لەپاشماوەی ئەو قەڵایە تائێستا تاکە دەرگایەك کەلەپارچە بەردێکی تەخت و گەورە دروستکراوە ماوەتەوە. ئەردەڵانەکان ماوەی (٤٢) ساڵیش، لەدەوروبەری پڵنگان فەرمانڕەواییان کرد، تا سەرە گەیشتە سەر کلۆڵ بەگ.

هەندێکی تر لەمێژوونووسەکان، سەبارەت بەقوبادی سەر ئەڵقەی ئەو ئەردەڵانییانە، بەم شێوەیە نووسیویانە: لەساڵی ٨٩٥ی کۆچیدا، شا مەنسوری فەرمانڕەوای (دوشتیك) بەدەستی تورکمانەکان کوژرا، پاش خۆی

چوار کوڕی لێ بەجێما، گەورەکەیان کەناوی فەیروز بوو، پاش کوژرانی باوکی ناوی خۆی گۆڕی بەناوی (قوباد) ساسان پەنای برده بەر سورخابی کوری بەدری حەسنەوی کەلەو سەردەمەدا فەرمانڕەوای شارەزوورو دەینەوەر بوو، ماوەی چەند ساڵێك قوباد لەناو گۆرانەکاندا بەرێزەوە ژیا. پاش لەناوچوونی فەرمانڕەوایی حەسنەوی، قوباد لەساڵی ٦٣٠ی کۆچیدا، نزیك (گوڵ عەنبەر) خورماڵو هەڵەبجە، تاقمێکی لەخۆی کۆکردەوەو بەخەیاڵی هێرش کردن بۆسەر ئازربایجان، بەلام لەراستیدا بەخەیاڵی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی رووی کردە ئەو ناوچەیە. (موزەفەرەدین) فەرمانڕەوای هەولێر، ئاگای لەجموجوڵی ئەو بوو، سوپایەکی بۆ بەرێخستو لەنزیکی قەلای (نوی)، قوباد سوپای ئەربیل دەشکێنێو لەئەنجامی ئەم سەرکەوتنەدا، رۆژ دوای رۆژ خەڵك دەچنە پاڵیو لایەنگرانی زیاتر دەبن. لەدەوروبەری خۆرهەلاتی شارەزووریشدا، چەند قەلایەکی‌تر دەخاتە ژێردەستی خۆیەوەو تواناو هێزێکی تەواو پەیدا دەکا. لەئەنجامدا لەگەڵ تورکمانەکانی ئازەربایجاندا سازش دەکاو لەساڵی ٦٣٦ی کۆچیدا لەگەڵ میر شەرەفەدینی جەلالی فەرمانڕەوای هەولێر دەس بەشەڕ دەکاو تووشی شکست دەبێو ناچار جارێکی‌تر رائەکاتەوە بۆ ناو عەشیرەتی گۆران، تا ساڵی ٦٥٦ کە هۆلاکۆ خان هێرش ئەکاتە سەر عیراق، (یەشموت) میرزا کوڕی هۆلاکۆ کە لەکرماشانەوە بەرەو عیراق دەچوو، قوباد پەیوەندیی پێوە کردو بوو بەبەردەستی تایبەتی یەشموت میرزاو، لەبەرئەوەی کەکەسێکی بەتەمەنو کارزان بوو، یەشموت بە بابا ئەردەل بانگی دەکردو هەر بەم هۆیەوە، ئەم ناوەی بڕا بەسەرداو یەشموت فەرمانڕەوایی شارەزووری بەرەو رووی ئەو کردەوە. لەساڵی ٦٥٧دا کۆچی

دوایی کردو کلۆڵی کوڕە گەورەی بوو بەجێنشینی ئەو.(تاریخ مردوخ،ص۸۹-۹۱)

لەوەی کەلەسەرەوە رابووورد، ئەم خاڵانەی خوارەوەمان بۆ روون دەبێتەوە:

١. نازناوی (بابا) پلەی رۆحانیی ئەم بنەماڵە دەردەخاو ئەفسانەی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هۆلاکۆدا کە نووسیویانە لەبەرئەوەی کەتەنیا سەرچاوەیەو هیچ سەرچاوەیەکی تر ئاماژەی پێنەکردووە، لاوازەو ئەوەش کەدەڵێ: یەشموت ئەم ناوەی بڕیوە بەسەریا، لەبەرئەوەی کەیەشموت کابرایەکی مەغۆلییەو دوورە شتی وا بەکاربێنێ، بەراست نازانرێو دروستکراوی مێژوونووسەکانی دواییە.

٢. شوێنی نیشتەجێبوونی باپیرانی زنجیرەی ئەردەلان، شوێنی عەشیرەتی گۆران بووە کەبەدەماودەم بەئێمە گەیشتووە.

٣. مەودای نێوان مردنی سورخابی کوڕی بەدر لەساڵی ٥٠٠ی کۆچیدا -کەلەبەنی عەنازەکانە نەك حەسنەوی- تاهێرشی هۆلاکۆ بۆسەر بەغدا کەلەساڵی ٦٥٦ی کۆچیدا بووەو رۆیشتن بۆ بەغدا، ١٥٦ ساڵ جیاوازیی هەیەو ئەمەش جێگەی گومانە.

٤. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانەی سەرەوە، مەسەلەی خەسرەوی ئاشەوان و.. خۆی لەخۆیدا بێ بنەمایە.

٥. مەسەلەی داگیرکردنی قەڵای پڵنگان کەناوەندی خێڵی گۆرانەو پاشتر دێینە سەر باسکردنی، بەگوێرەی مێژووەکانی ئەردەلان، پەیوەندیی بەساڵەکانی کۆتایی هەزارەی یەکەمی کۆچییەوەیە.

٦. ئەوەی بەئاشکرا باسکراوە لەدەستنووسە کۆنەکانی کوردستاندا، بەتایبەتی مێژووی هەورامان، ئەوەیە کەبابا ئەردەڵ یەکێك بووە لەنەوەدو نۆ پیرەکانی هەورامان.

سوپای یاخیبووەکان کەژمارەیان ئەگەیشتە دوانزە هەزار کەس، لەدەربەندی چغانەوە تێپەڕینو لەدەوروبەریدا چادریان هەڵدا، سوپای کینەو رق لەدڵ لەگەڵ ئەوەدا کەبەژمارە کەمتر بوون لەسوپای سەرپێچی کەران، هێرشێکی شێرانەیان بردە سەریانو بەپێی ئایەتی (کم من فئة قلیلة غلبت فئة کثیرة باذن الله) هەردوولای لەیەك نزیکبوونەوەو بوو بەشەڕ لەنێوانیاندا.

| | |
|---|---|
| دمـاغ زمین از تف آفتاب | زسر سام سـوا در آمد به خواب |
| رسیدند لشکر به جای مصاف | دو پیکار بستند چون کو قاف |
| زپیکاری لشکر از هر دو جای | فروبست کو شنده را دست و پای |
| زتاب نفس در هـوا بست میغ | جهان سوخـت از آتش برق تیغ |
| زپولاد پوشان لشکر شکن | تـن کـوه لرزنده بر خـویشتن |
| زنیره نیستان شده روی خاك | زکـو پـالها کـوه گشته مغاك |

لەو نەبەردە پڕ لەئاشووبەدا بڵێسەو گڕی ئاگر گەیشتە ئاسمانو هەر لەدەمەو بەیانەوە تا ئێوارە شەڕ دەوامی کردو پاڵەوانانی هەردوولا دلێرانە دەجەنگان، تا لەئەنجامدا سوپای شا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. کوچك ئەحمەد پاشای بەگلەر بەگی مووسڵ کوژراو قول ئاغاسی شامو سیواس بەدیل گیرانو خان ئەحمەد خانیش بەگوێرەی پەندی (پاڵەوان بەزیندوویەتی بمێنێتەوە باشە)، جڵەوی وەرگێڕاو رایکردو سوپاکەیشی وەك کوللەی دەشتو کێو بڵاوبوونەوەو، لەترسانا سێبەری خۆیان لێ بووبوو بەدوژمنو لایان وابوو کەئەوە دوژمنەو شمشێری لێ هەڵکێشاون، پووشێکیان لێ بووبووە شاخێكو لەهەموو لایەکەوە بۆنی مردنیان ئەکرد لەسەد کەسیان یەکێکیان بەسەلامەت دەرچوو. بەڵێ ئەوانەی کەلەخەیاڵی داگیرکردنی وڵاتاندابوون، وەك هیچیان لێهاتو ئەوەش کەئەیویست بگاتە لووتکەی بەرزی چاڵێك هاتە بەردەمی.

هر فتح کاسمان نهدش منتهار کار        چون بنگری مقدمه فتح دیگراست

ئەم سەرکەوتنە ڕوویدا، سیاوش بەگی قوللەر ئاغاسی نامەی نووسی بۆ بارەگای شاو، لەچۆنیەتی ڕووداوەکە ئاگاداری کردەوەو لەگەڵ خان وەلی بەگی یوزباشیو حوسین خانی گودەرزی کەلەغولامانی شابوو، ڕەوانەی بارەگای سوڵتانی کرد. کاتێك ئەم مژدەیە گەیشت بەشا زۆر خۆشحاڵ بوو و دەستی کرد بەبەخشینەوەی خەڵات بەسەر سەرکردەکانی لەشکرداو بەمیهرەبانی خۆی سەری بەرزکردنەوە. هەر لەهەمان ڕۆژدا، شا (ئیبراهیم سوڵتانی سفرەچی) ڕەوانەی بارەگای شا لەئەسفەهان کرد، بۆ ئامادەکردنی پێشوازیو خۆیشی بەدوای ئەودا بەرەو ئەوێ کەوتەڕێ.

لەو کاتەدا کە شا لەسەفەرەکەدابوو، نامەیەکی لەقوللەر ئاغاسییەوە پێگەیشت تیایدا هاتبوو کەپاش خۆ ئامادەکردن بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەتی خان ئەحمەد خان، هێرش کراو قەڵای زەڵمو مەریوانو حەسەن ئاواو هەموو قەڵاکانی تر کەوتنە ژێر دەستی سوپای دەوڵەت.. لەو قەڵایانە، قەڵای زەڵمو حەسەن ئاواو مەریوان و قزڵجەمان سپارد بەکەسانێکی لێهاتوو و ئیتر هەموو قەڵاکانی تر، لەگەڵ زەویدا تەخت کرانو لەگەڵ تاڵانیو کەلوپەلەکاندا بەرەو بارەگای ئێوە هاتووین. شای سێبەری خوا زۆر خۆشحاڵ بوو، ئەو کارانەی کەسیاوش بەگ ئەنجامی دابوون زۆر بەلایەوە پەسەندو باش بوون.

لەو شوێنەدا کەشا دابەزیبوو، لەماڵی عەلی قولی بەگ ئیلچی باشی ئاجوقو دادییەکانی خەڵات کردو مۆڵەتی دان بگەڕێنەوە لای خۆیانو پاش ئەوە، شا مەقسوودو سوڵتانی دامەزراند بەئیلچی ویلایەتی ڕۆمو ئەویش پێی شای ماچکردو کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ دەسکردن بەکارەکەی خۆی.

شـای سـێبەری خـوا، پـاش لێبوونـەوە لـەم ئەرکانـە، رووی کـردە ئەسفەهان و لـە(دار المؤمنین)ی کاشان شـا بـۆ حەوانـەوە لای‌دا.. لەهـەمان رۆژدا ١٥ی (رەبیعی دووەم ساڵی ١٠٤٥ی کۆچی) نامەی (جانبازی سوڵتان کـوڕی شـاباز سـوڵتانی زەنگەنـە گەیشـت، ناوەڕۆکەکـەی ئـەوەبوو کەجاسوسـێك لەمووسـڵەوە هـاتووە، هـەواڵێکی راسـتی هێنـاوە کـەخان ئەحمەد خان بەهۆی رووداوێکەوە گیانی لەدەستداوەو مردووە. لـەم کاتـەدا شاعیرێك ئەم شیعرەی خوێندۆتەوە:

باولی نعمت ار بون آیی        گر سپهری کەسرنگون آیی

واته

ئەگەر لەگەورەی خۆت سەرپێچی بکەی

ئەگەر قەڵغانیش بی سـەرەنگوم دەبی

## عەلەوییە توندڕەوەکانی ئەهلی حەق لەسەردەمی ئەفشاریو زەندییەکاندا

لەسەردەمی شا سوڵتان حسێنی سەفەویدا ١١٠٥ - ١١٣٥ی کۆچی، بەهۆی پەیدابوونی ترسو بیمو گوشارو پیلان لەدژی زۆربەی ئایینو ڕێبازە ئایینیە جیاجیاکانەوە، بەتایبەت لەسەر عەلەوییە توندڕەوەکان کەگرفتاری درەختی نێژراوی دەستی خۆیان بوونو هێرشی ئەفغانییەکانو ترس لەدەسەڵاتی فراوانیان کەبەهۆی لاوازیو دەستەپاچەیی شا سوڵتان حوسەین خۆیەوە بوو، ئەفغانییەکان کەخەریکبوون بەمەرامەکانی خۆیان بگەن، هەر بەدەرکەوتنی نادر شای ئەفشار لەڕووی سیاسیو سەربازییەوە دەرکەوتنی لێهاتوویی و داگیرکاریو سەرکوتکردنی سەرپێچیکاران لەلایەن ئەوەوە، پەیڕەوانی بزووتنەوەکە پشتێنی خزمەتیان بەستو نادر شا لەگەڵ ئەوەدا کەخۆی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننەتو جەماعەت بوو، بەڵام بەباشترین شێوە سوودی وەرگرت لەهێزو توانای سەربازی عەلەوییە توندڕەوەکانو بیروبۆچوونو ڕێبازی ئایینی ئەوانی زۆر ڕێز لێ ئەگرتو فەرمانیدا هەموو شوێنە پیرۆزەکانیان، کەهێمای رووبەروونەوەو بەگژداچوونەوەی بێگانەو ئەوانەی کەدەستدرێژییان ئەکردە سەر خاکی ئێران بوون، فەرمانیدا نوێ بکرێنەوە. لەکاتی داگیرکردنی مووسڵو بەغداو زیارەت کردنی شوێنە پیرۆزەکان کەگەڕایەوە، چەند کەسێکی لەبنەماڵە ناسراوەکانی وەك شا ئیبراهیمی، خامۆشی، یادگاریو.. لەگەڵ خۆیدا لەکەرکووكو مووسڵو شارەزوورەوە کۆچی پێکردن بۆ بنارەکانی شاخی زاگرۆسو فەرمانی دەرکرد موڵكو زەویو زاریان بۆ دابینکراو بەم کردەوەیە سیستمی سیاسی ئایینی یارانی زیندووکردەوەو لەسەرانسەری سنووری خۆرئاوای وڵات دەستی کرد بەپاراستنو بەهێزکردنی پەیڕەوانی ئەهلی حەق، هەر لەم کاتەشدا، بنەماڵەی شامیهمانی ئاتەش بەگی کەلەخوراسانو قۆچان بوون، بەهۆی ڕووداوەکانی سەردەمی شا

ئیسماعیلەوە کەباسکران، گەڕاندنیەوە بۆ شوێنی جارانی خۆیان لەکرماشان و سوارەی شمشێروەشێن و تەوەرزین کێشی عەلەوی، لەدەوروبەری خۆی کۆکردەوە، (کەمێژوونووسە ئەفشارییەکان بەهەڵە بەیەزیدییەکانیان داناون) لەشەڕە جیاجیاکاندا ئازایەتی و گیانبازی ئەوان دەکەوتە بەرگوێ. ئەو قەڵایانەی هەبوون لەسەر سنوورەکانی سەرانسەری وڵاتدا، زۆربەیان بەهۆی هێزە سەربازییەکانی (ئەهلی حەق)ەو ئەبران بەڕێوەو ئەپارێزران و چاودێری کردنی سنوورەکانی عوسمانی هەر لەئاراسەوە تا ئەروەند روود خرابووە ئەستۆی ئەوان.

نادرشای ئەفشار بەم فیکرو بیرکردنەوە وردەی خۆی پێزانین و خۆشنوودیی خۆی دەربڕی، بەرامبەر کۆششی هەزار ساڵەی ئەم ئێران پەروەرو ئیسلام دۆستانە هەم رێگەی گرت لەبڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندەی بەربڵاوی عوسمانییەکان لەکوردستانی عیراق و پەرەی سەندبوو. ئیتر ئەو باری سیاسی و فیکرییە کەبەگوێرەی بیروباوەڕی باو باپیرانی نادرشا لەئێرانی ئەو رۆژەدا پەیدابووبوو، بەربەستێکی قایمی دروستکرد لەبەردەم دەسەڵاتی فیکری و سەربازی و سیاسی عوسمانییەکاندا.

سەردەمی ئەفشارییەکان، یەکێکە لەچاکترین و پڕ بەرهەمترین رۆژەکانی ژیانی فیکری و فەرهەنگی پەیڕەوان و بنەماڵەکانی ئەهلی حەق، لەسەرانسەری بنارەکانی شاخی زاگرۆسدا بووە.

تۆمارو سەرچاوەکانی سەردەمی دەرکەوتنی شامیهمان پڕە لەهیواو هەوڵی خۆفێرکردن و فێربوون و رووکردنی پەیڕەوان بۆ پەروەردەو خۆپاك کردنەوە بەلایەنی فێرکردن، بەشی زۆری داگیرکردووەو پەیامی رووبەڕووبوونەوەو شەڕکردن لەم سەردەمەدا، لەتۆماری گەورەکاندا گەیشتووەتە پلەیەکی خوارەوە. ئەو بەرچاوروونانە بەهۆی شوێنی جوگرافیانەوەو بەهۆی ئارامی بارودۆخەکەوە، لەسەر لووتکەی کێوەکان و لەدەشتەکاندا جێگیر بوون.

لەناو پیاوە گەورەکانی ئەو سەردەمەدا ئاغا سەیید فەرەزی قەزوینەیی هەیە. ئاغا سەیید فەرەزی (١١٠٠ - ١١٧٠)ی کۆچی، کوڕی سەیید

ئەمرۆڵلایـە، لـەگوندی قەزوێنـەی نێـوان سـەحنەو کنگـاوەر پـەیدابووە، لەحەزرەتی ئیمام عەلیو سەید خامۆشەوە بەهرەی وەرگرتووە. یارانی ئاغا سەیید فەرەزی بریتین لە ١. شێخ ئەمیر کەساڵی ١١٢٥ کۆچی کردووە، ٢. سەلیم باوکی شێخ ئەمیر. ٣. ئاغا سەیید عابدین. ٤. کاکی قوربان عەلی. ٥. کاکی نەدرەویس. ٦. ئاغا سەیید جوزی کەهەمویان ئەبن بەحەوت کەس.

ئاغا سـەیید فەرزعـەلی ناسـراو بەئاسـەیید فـەرزی نمایانگـەری نـوری حەزرەتی عەلی بووە، حەزرەتی شێخ ئەمیر نوێنەری سەیید موحەممەدی گەورە سواری سەر ئەلقەی حەوتەوانەو لەحەزرەتی بینامینە خەڵکی شاری مووسڵی عیراقەو لەسـاڵی ١١٢٥ی کۆچیـدا لـەگوندی قەزوێنـە مـردووە، حەزرەتی سەلیمی باوکی شێخ ئەمیر لەحەزرەتی شا ئیبراهیمی ئەوانیتر هەریەکە نماینگەری یەکێکن لەگەورەکانی حەوتەوانە.

نادرشا بەعادەتی خۆی کەبەرەو بەغدا گوزەر ئەکات، دەچێتە خزمەتی ئاسـەیید فـەرزیو داوای هیمـەتو بەرەکـەتی لێدەکـاتو هـەندێ لەموڵکـە تایبەتـەکانی خـۆی بەمەبەسـتی خزمـەتکردنی تەکیـەو مەسـرەفەکانی رووبەرووی ئەو ئەکاتەوە، ئەم موڵکە وەقف کراوانە تا سەردەمی عیمادو دەولە هەروا مایەوە، بەڵام هەمووی خستە سەر ناوی خۆی. (پێشەکی دیوانی شێخ ئەمیرو باسی کاروبارو ئەحواڵی حەزرەتی ئاسەیید فەرزیو یارانی، سەیید ئەمروڵڵا شا ئیبراهیمی).

لاکردنـەوەو هـاودڵیو لوتفـی شـای ئەفشـار بەرانبـەر گـەورەی هـەموو بنەماڵەکان، تا کۆتـایی پاشـایەتی ئـەو، هـەر بـەدرەوام بـوو. ئاغا سـەیید یـەعقوبی خامۆشـی گـەورەی تەکیـەی گـۆرانو سـەیید رەزا بـەگی شـاە ئیبراهیمی گـەورەی تەکیـەی کرنـد لـەپیاوە کۆچبـەرە گـەورە ناودارەکـانی سـەردەمی نـادر شـا دادەنرێـن کـەپاش جێگـیربوونی بنەماڵـەی ئوجـاق، بنەماڵەکانی خۆیان گەیاندە لوتکەی گەورەیی.

پاش مردنی نادر شای ئەفشار (١١٤٨ - ١١٦٠ی کۆچی)و پەیدابوونی ئـاژاوەو هەڵگەڕانـەوەی تایفـەی زەنـدو وەنـدو گـۆرانو کەڵـهورو.. کەگیانبازانی زۆریان هـەبوو، بەتایبـەت زەندەکـان کەزۆربـەیان لەعەلەوییـە

توندڕەوەکان بوون، لەفیکرو خەیاڵی پاراستنی هێنمی‌و ئارامی‌و ئازادیی ئایینی سەردەمی ئەفشارییەکان‌و پاراستنی یەکیەتی خاکی ئێران‌و پشتگیری کردن لەپاڵەوانی تازە پەیدابووی زەندەکان کەکوردبوون‌و دەیانتوانی ئەم ئەرك‌و خزمەتە گەورەیە بەجێبگەیەنن، لەدووبارە بوونەوەی مێژوودا پاش دامرکاندنەوەی بزووتنەوە دوژمنەکان، لەپێناوی پاراستنی بنەماڵەی زەندی لەبەرامبەر بەخێڵی بەدەسەڵات‌و گەورەی قەشقاییەکان کە سەرکردەکانیان خۆیان بەپاشماوەی جەنگیزخانی مەغۆل دەزانن، بەرەو شیراز کەوتنەرێ‌و ئەو ڕێگایانەی کەباوباپیرانی خێڵەکانی پەیڕەوان لەسەردەمانی (ئال بویە)و پێش ئەوانیش لەسەردەمی ساسانییەکاندا گرتبوویانە بەر، بەو ڕێگایەدا کەوتنە ڕێ، جارێکی‌تر بەمەبەستی سەربەخۆیی‌و یەکپارچەیی خاکی ئێران‌و دابینکردنی ئازادی ئایین بەرەو خاکی فارس (شیراز) زێدی ئەردەشێری بابەکان‌و نیشتمانی گەورە خێڵەکانی کورد، شوانکارەو پایتەختی دەیلەمەکانی ئال بویەو.. جارێکی‌تر سەفەریان کرد، ئەم هەلە بەدەست هاتووەش ئەوەندەی نەخایاند، کەبەهۆی مردنی کەریم خانی زەندەوە (١١٦٣ - ١١٩٣)ی کۆچی بارودۆخەکە گۆڕاو گیانبازەکانی ئەهلی حەق، هەندێکیان لەوێ مانەوەو بەبڵاوکردنەوەی ڕێبازەکەیانەوە خەریك بوون کەلەڕۆژگاری سەڵتەنەتی کەریم خانی زەندەوە لەشیرازو دەوروبەریدا، برەوی پەیدا کردبوویەوە، هەندێکی تریشیان ڕێگای کرماشان‌و کوردستان‌و شارەزوورو ئازربایجان‌و خوزستان‌و مازیندەرانیان گرتەبەرو لاپەڕەیەکی تر لەراپەڕینەکان لەسەردەمی قاجارییەکاندا، لەسەر زەوی‌و خاکی بنارەکانی زاگرۆس کە لەقەڵەمڕەوی جوگرافیایی پەیڕەوان، کەبەرەبەرە بە عیراق‌و تورکیاو سوریا ناویان لێنراوە، بەهۆی بارودۆخی ناهەمواری کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و ئایینی‌و کرداری زوڵم‌و زۆر لەسەر توێژی ستەمدیدەی کۆمەڵگە، بارێکی هەموار پەیدابوو بۆ سەرهەڵدانی پیاوانی ڕاست‌و لەئەنجامدا، دەسکرایەوە بەبڵاوکردنەوەی پەیامی دادگەری.

# راپەرینی تەیمور بانیارانیو
# تەیموری دووەم (١٢٦٨ی كۆچی)

تەیمور بانیارانی كوڕی ڕەزا خەڵكی گوندی بان یارانی ناوچەی گۆرانە، لەدامێنی كێوی دالآهوی شاری كرماشان. تەیمور یەكێك بوو لەموریدەكانی ئاغا سەید حەیدەر (براكە) كەناسرابوو بەئاغا سەید براكە (١٢١٠- ١٢٩٠ی كۆچی)و پەیڕەوانی بنەماڵە، لەدامێنی كێوی دالآهوو شاهۆو گۆرانو شارەزوورو چەند شوێنێكیتردان. هاتنی سەید براكەیان بەدەركەوتنی سوڵتان لەقەڵەمداو پاش (بەرەكە) مامۆستا عەینولقوزاتی هەمەدانی (كە لە، ٥٢٥ی كۆچی مردووە) دووەمین كەسایەتییە لەرێبەرانی عەلەوییە توندڕەوەكان كە بە(بەرەكە) ناو دەبرێ.

تەیموری بانیارانی لەسایەی ڕێنمایی ئەو ڕۆحانییەدا، پەروەردە دەبێو دەگاتە قۆناغی وسالو ئیدیعای دەركەوتن دەكا. لەسەرەتای دەركەوتنەوە تا شەهیدبوون، كەرامەتو كاری نائاسایی زۆر لەتەیمور بانیارانی دەگێڕنەوە، لەوانە (تەیكردنی زەوی)، دەسڕۆیی بەسەر كاتو شوێنو زمانی جیاجیاو توانایی پێشبینیكردنی ڕووداوی ئایندەو..

ئەگەرچی هێشتا زیاتر لە١٥٠ ساڵ بەسەر راپەڕینی (باطنی)و شەهیدبوونی تەیمور بانیارانیدا تێپەڕی. نەكردووەو هێشتا باسی سەر زمانی خەڵكەو سەرچاوە مێژووییە ناسراوەكانی سەردەمی ناسری، لەوانە (ناسخ التواریخ . حقایق الاخبار خورموجی-روضة الصفا) ڕووداوی دەركەوتنی تەیمور بانیارانییان تۆماركردووە، بەڵام وەك بڵێی بووەتە باو كەلەگێڕانەوەی ڕاستییە مێژووییەكانی پێشەوایانو راپەڕینی عەلەوییە

توندڕەوەکاندا، لەهەر سەردەمێکداو چ لەدوورو چ لەنزیکەوە دوچاری شێواندن و گۆڕان ببنەوە تائەوشوێنەی پێویست دەکا جارێکی تر لەو بزاڤانە بکۆڵرێتەوەو درۆ لەراستی جیا بکرێتەوە. بۆ نموونە لەداستانەکانەی نووسەری (طرائق الحقائق)داو لەباسی (بابا تمور) ناوێك و لەسەر گوزەشتەی میرزا مەحمودی گورگانیدا چەندین جار لەزاری مورشدو سۆفی‌یە هاوچەرخەکانەوە بیستوومە کەبابا تموریان بەجەنابی تەیمور لەقەڵەم داوەو فتوای مردنیان داوەتە پاڵ ئاغا محەمەد عەلی کرماشانی، لەکاتێکدا ئەو قسە دەماودەمە بەلێکۆڵینەوەی مێژووی روون دەبێتەوە کەراست نییە، چونکە ئاغا محەمەد عەلی کرماشانی ساڵی ١٢١٦ی کۆچیدا مردووە، لەکاتێکدا تەیموری بانیاران لەساڵی ١٢٤٦ی ق دا لەدایك بووەو لەساڵی ١٢٦٨ی کۆچیدا شەهید بووە، واتە لەمردنی ئاغا محەمەد عەلییەوە تا شەهیدبوونی تەیمور، پەنجاو دوو ساڵی قەمەری جیاوازی هەیە. بۆیە ئەو گێرانەوەیە لەوانەیە پەیوەندیی بەیەکێکی‌تر لەپەیڕەوانی ئەهلی حەقەوە هەبێ‌و هیچ پەیوەندییەکی بەتەیمور بانیارانییەوە نییە. (طرائق الحقائق، ج٣، ص ٥٩١).

لەئاسەواری گەورە شارەزایانی عەلەوییە توندڕەوەکانی‌تر (ئەهلی حەق) لەسەردەمی ئەفشاری بەدواوە، جێ پێی تەیموڕو دەرکەوتن‌و راپەڕینەکەی دیارەو ئاغا سەید ئەمروڵلا شاە ئیبراهیمی کەیەکێکە لەمەسنەدنشینەکانی بنەماڵەی شاە ئیبراهیمی، نامەیەکی دەربارەی پلەو پایەی باطنی‌و گوزەرانی تەیمور بانیارانی‌و ئاغا تەیموری دووەم (فەتاح) ئامادە کردووەو لە ساڵی ١٣٦٤دا چاپی کردووە. لەو سۆنگەیەوە کەنامەکە بەقووڵی لەو زاتانەی کۆڵیوەتەوەو ئاماژەی بۆ چەند سەرچاوەیەکی بایەخداری وەك

نووسینگەکانی شێخ ئەمیر، ئاسەید فەرزی، حەزرەتی سلیم و .. کردووەو بەپێی بەڵگە مێژووییەکان داڕێژراوە، ئێمە لێرەدا باسیان ناکەین.

(لسان الملك)ی نووسەری(ناسخ التواریخ) لەراپۆرتێکدا، سەبارەت بەراپەڕین و دەرکەوتنی حەزرەتی تەیمور، کەبەگوێرەی راپۆرتەکانی حکومەت رێکخراوەو لەبەرگی چوارەمی جوگرافیای مێژوویی و مێژووی کرماشانەوە وەرگیراوە، ئەم لێکدانەوەیەی خوارەوەم هەڵبژاردووە: لەسەرەتا حکومەتی عیمادودەولەو هاوکات لەگەڵ گەندەڵی کاروبارەکان، تەیموری یەکەمی گۆران دەرکەوت و بووە سەرچاوەی ترسی پیاوانی دەربار. عیمادودەولە بەسیاسەت رەفتاری لەگەڵدا کرد. (لسان الملك) دەربارەی ئەو رووداوە نووسیویەتی :(پیاوێکی‌تری هۆزی گۆران قەلازنجیری بەناوی تەیمور، خۆی بەنائبی ئیمامی غائب دانا و هۆزەکانی ئاگادارکردەوە کەمن بۆ ئەوە هاتووم تا سەرجەم ولاتانی سەر زەوی بگرم سەرجەم پاشاکان تێك بشکێنم و رۆژی پانزەهەمی جەمادی یەکەم دەردەکەوم و ئەنجامدانی ئەو ئەرکەش بەشمشێر دەبێت لەو سۆنگەیەوە بانگێشتی خەڵکی سەرجەم هۆزەکان دەکەم و داوای بەیعەتیان لێدەکەم. ژن و پیاوی هۆزەکانی سنوری بانگێشتەکەی ملیان بۆ داواکەی کەچ کردو لەپێناویدا ئامادەبوون گیان و سەرو منداڵی خۆیان ببەخشن. تاوای لێهات هێندەی نەمابوو وەك میرزا عەلی محەمەد باب! کەلێنێکی گەورە بخاتە نێوان ئایین و حکومەتەوە. شازادە ئیمام قولی بەو لەشکرەی لەزەهاو هەیبوو دڵی، خۆش نەبوو، چونکە متمانەی پێی نەمابوو فەرمانی نەدەدا پێیان شەڕی تەیمور بکەن چونکە لەشکرەکەی بەپەیرەوانی تەیمور دەزانی.

خەڵکی دەستە دەستە لەکرماشان و سنەو لورستان و سلێمانییەوە روویان لەتەیمور دەکردو ناوچەوانی خۆیان بەخاکی بەر پێی ئەو ئارایشت دەدا، سەرەنجام شازادە (عمادالدولە) پلانێکی داڕشت و لەشکرێکی جێ متمانەی پێکەوە ناو بەشێوەیەك غافڵگیرانە هەڵیان کوتایە سەر تەیمورو پێش ئەوەی هۆزەکان ئاگاداری رووداوەکە بن، تەیمور بەدیلی رەوانەی کرماشان دەکرێ. شازادە ئەوەندە ترسی لەدڵی نیشتبوو، یەکسەر فەرمانی‌دا سەری لەلەشی جیابکەنەوە.. (ناسخ التواریخ، لسان الملك سپهر، ج٤، ص ٢٩-٣٠ (محمد جعفر خورموجی، حقایق الاخبار، ص ١١٢ هدایت، روضة الصفا، ج ١٠، ص ٥٢٩) (تاریخ مفصل کرماشان، محمد علی سلطانی، ج٤، ص ٣٤٠) بەلەبەرچاوگرتنی وتەکانی نووسەری (ناسخ التواریخ) کە(سەریان لە لەشی جیاکردەوە)و بۆ پشت راستکردنی ئەوەی دەربارەی راپەڕینەکەی تەیمور وترا، ئێستا ئاماژە بۆ ئەو راپۆرتەی خوالێخۆشبوو میرزا باقر فانی، سەرۆکی مەعاریفی قەسری شیرین باسی لەچۆنێتی و سەرەتاو دەرئەنجامی دەرکەوتنی حەزرەتی تەیمور کەلەو چاوپێکەوتنەوە کەلەگەڵ مەلا مستەفا قەڵخانیی ئەنجامی‌داوە لەگەڵ هەوادارانی تەیموردا، تۆماری کردووە لەو بارەیەوە راپۆرتێکی نووسیوەو ئاراستەی سەید عەبدولحسەین سوڵتانی سەرۆکی مەعاریفی کرماشان کردووە دەخەینەڕوو بۆ یەکەمین جار چاپ و بڵاوکراوەتەوە، چۆنێتی گێڕانەوەی راپۆرتەکە لەهەموو گێڕانەوەکانی‌تر، زیاتر لەقسەکانی نووسەری (ناسخ التواریخ)ەوە نزیکترە. میرزا باقر فانی نووسیویەتی: نووسەری ئەم مێژووە کورتە، بەیارمەتی خوێنەرانی بەڕێز، بەبێ زێدەڕەویی وسۆزی شاعیرانە، دەنووسێت: ساڵی ١٣٣٥ی کۆچی، ئەو کاتەی لەشکری روس بەنیازی داگیرکردنی بەغدا هاتنە قەسری شیرین، دانیشتوانی شارەکە بەزۆری پەرتەوازەی دەوروبەر بوون، لەوانە منیش بەخۆم و ماڵ و منداڵەوە

بەرەو کێوی دالاهو ڕۆیشتین و پەنام بردە ماڵی قەنبەر سوڵتانی سەرۆکی هۆزی قەڵخانی و ماڵەکەی دەکەوتە میر حەسارو شوێنێکی خۆش و لەبار بوو، بۆماوەی چەند مانگێك بەئاسوودەیی لەوێ مامەوە، ڕۆژێکیان لەدەرەوە دانیشتبووین و کۆمەڵێکی زۆری پیاوانی قەڵخانیش لەوێ سەرگەرمی قسەو باسی کۆن بون لەپڕ قسە چووە سەر شا تەیموری گۆران و هێنانەوەی ئەوشیعرانەی بۆی وترابوو.

بەقەنبەر عەلیم وت کەزۆر حەزدەکەم بەدروستی لەسەرگوزەشتەی تەیمور ئاگادار بم و پرسیم ئایا لەناو عەشیرەتی گۆراندا کەسێ هەیە بەچاکی لەو بارەیەوە یارمەتیم بدا؟ قەنبەر عەلی ئاماژەی بۆ پیاوێکی پیری ناو کۆڕەکە کردو وتی، ئەو مەلایە خۆی یەکێ بوو لەموریدو دەروێشەکانی شا تەیمورو هەرچییەکت دەوێ لەخۆی بپرسە. سەرەتا سەرم سوڕماو بەناوی گاڵتەوە لەمەلام پرسی: جەنابی مەلا مەگەر تەمەنتان چەندە تا لەزەمانی شا تەیموردا، موریدی ئەو بووبی؟ لەوەلامدا وتی، من ساڵی لەدایکبوون نازانم، بەلام ئەوەندە دەزانم کەلەکاتی مردنی محەمەد شای قاجاردا (١٢٦٤ی کۆچی) ژنم هێنابوو و یەك دوو مناڵم هەبوو. ئینجا لەگەڵ ئامادەبووانی کۆڕەکە حسابمان کرد، مەلا تا ئەوکاتە نزیکەی ١٠٦ ساڵ تەمەنی هەبوو، کەچی هێشتا دانەکانی بێ عەیب و وزەو توانایەکی باشی هەبوو، بەتایبەتی هەستێکی بەهێزی هەبوو. زۆر دڵم خۆشبوو، بۆیە یەکسەر دەستی مەلام گرت و کۆڕەکەمان بەرەو ماڵ بەجێهێشت. کاتێ گەیشتینەوە ماڵ، دەمەو نیوەڕۆ بوو، پێکەوە نانی نیوەڕۆمان خواردو کەوتینە قسە. داوام لەمەلا کرد لەنوکەوە تاکۆتایی ڕووداوەکەم بۆ بگێڕێتەوەو منیش بینووسم، ئەویش ڕازی بووو گووتی:

لەسەرەتای پاشایەتی ناسرەدین شادا، تەیمور ناوێکی گۆران کەدەروێشی سەید یەعقوب (سەید حەیدەر؟) ی باپیرەی ئەم ئەمجەد ئاغا سەید رۆستەمە (..) دەبێ‌و دێتە کێوی دالاهوو لەئەشکەوتێکدا بەتەنهایی‌و بەنهێنی دەمێنێتەوە، رێگای بەکەس نەدەدا بچێتە لای‌و بەتوندی دژی چاوپێکەوتنی خەڵکی بوو.

زۆر سەیر لەوەدابوو کەتەیمور نە لەئەشکەوتەکە دەهاتە دەرو نەکەسێك دەچووە لای، ئەی چۆن‌و بە چ شێوەیەك پێویستیەکانی ژیانی خۆی دابین دەکرد، کەس نەیدەزانی. ئەو زستانەی بەو جۆرە بردەسەر تا بەهارهات‌و هەوا خۆشی کرد. ناووناوبانگی تەیمور، هەموو ئەو دەورووبەرەی گرتەوەو ئینجا لەدوورو نزیك‌و لەتورك‌و تاجیك‌و هۆزە هاومەزهەبەکانی ترەوە، واتە عەلیوڵلاهی(مەبەستی عەلەوییە توندڕەوەکانی . ئەهلی حەقە) بەوپەڕی خۆشییەوەو بۆ نواندنی ئیرادەت‌و بەدەستهێنانی مراز سەردانی تەیموریان دەکردو، وردە وردە لەچەند شوێنێکی دووری وەك ئازەربایجان، کەئەهلی حەقی زۆرە، خەڵکانێکی زۆر هاتنە لای تەیمورو دەوریان تەنی. پاش تێپەڕبوونی یەك دوو مانگ، ژمارەی پەیڕەوەکانی گەیشتنە نزیکەی ١٠ تا ١٥ هەزار کەس کەهەمووان دەستیان لەکاروباری دنیایی هەڵگرتبوو و ببوون بەموریدی گیان لەسەردەستی تەیمور. ئاشکرایە کە لە هەموو شوێنێك‌و جێگایەك هەمیشە لەناو باوەڕدارەکاندا پیاوچاك هەیە (؟!!) و ئەو پیاوچاکانە یەکە بەیەکەی ئەو رووداوانەیان دەکرد بەراپۆرت‌و رەوانەی (عماد الدولە)ی فەرمانڕەوای کرماشانیان دەکرد. (عماد الدولە)ش راپۆرتی بۆ تاران نووسیبوو کەگوایە شا تەیمور ناوێکی گۆران ٥٠-٦٠ هەزار کەسی بەدواوەیەو ئیدیعای پاشایەتی دەکا ئیتر وەرە لێکی‌بدەرەوە.

پاشایەکی گەنج و هەرزەکار کەتازە لەسەر کورسی پاشایەتی دانیشتبێت کەناتوانێت گوێی لەناوی ئازادی بێت، وەها راپۆرتێکی پێبگات دەبێ چی بکات؟ یەکسەر فەرمان دەداتە عماد الدولە تا تەیمور دەسگیر بکرێ. (عماد الدولە)ش فەرمان دەداتە کاربەدەستێکی خۆی تا لەگەڵ ژمارەیەك سوار بچنە لای ئەسەدوڵلا خانی گۆران و داوای دەستگیرکردنی تەیموری لێ بکەن. ئەسەدوڵلا خان سەرتیپی فەرمانڕەوای گۆران بوو، ئەگەرچی دەسەلات و ناوبانگێکی زۆری هەبوو، بەڵام دەستەو پاچە بوو بەرامبەر بەهۆزەکانی گۆران و سنجابی و کرندو هۆزەکانی‌تر کەخۆیان کردبووە مورید و گیانفیدای تەیموور، جگە لەوە ئەسەدوڵلا خۆیشی باوەڕی بەتەیمور هێنابوو.

ئەسەدوڵلا لەئەنجامدانی ئەو راسپاردەیەی (عماد الدولە) دۆش داماو داوای هەڵوێستی راوێژکارانی کردو سەرەنجام (گوایە بەناچاری بۆ بەجێهێنانی فەرمانی شاو خواستنی لێبوردن بۆ شا تەیمورو رزگارکردنی) بڕیاردەدەن ژمارەیەك مەڕ وەك نەزرو نوالە سەرببڕن و داواکاریەك بۆ شا تەیمور بنووسن و داوای لێبکەن بۆ خوێندنی دوعای نەزرەکە سەردانی گاهوارە بکا، پاش تەواوبوونی مەراسیمی نەزرەکەو لەو سۆنگەیەوە کەتەیمور عادەتی وابوو، هەمیشە بەتەنها لەگوند دەردەچوو و پیاسەی دەکرد، مەئمورێك دەستنیشان دەکرێ، تا لەگەڵ هاورێکانیدا دوای بکەون و بەبێ دەنگی دەسگیری بکەن و سواری ئەو هێسترەی بکەن کەبۆی دانراوەو رەوانەی کرماشان بکرێ.(وئەم مەسەلەیە بەلای راوێژکارو پیاوەکانەوە بەنهێنی بمێنێتەوە تالەژێر چاودێریدا بێت و دواتر ئەسەدوڵلا خانە لای عیمادودەولە داوای لێبوردنی بۆ بکات).

ئەسەدوڵلا خانی فەرمانڕەوا پاش ئەو راوێژکردنە، کەوتە دەسەبەرکردنی ئەو مەڕانەی بۆ نەزرکردنەکە رەچاو کرابوون و پاشان نامەیەکی زۆر بەرێزانەی بۆ شا تەیمور بەنامەبەرێکی تایبەتدا نارد.

هەروەها مەلای ناوبراو لەدرێژەی قسەکانیدا وتی تەیمور عادەتی وابوو کەزۆربەی رۆژەکان لەئەشکەوت دەهاتە دەرەوەو، لەسەر تاشەبەردێکی بەردەم ئەشکەوتەکەدا دادەنیشت و قسەی بۆ ئەو پەیڕەوانە دەکرد کەسەردانیان دەکرد. وارێکەوت هەمان رۆژ شا تەیمور لەئەشکەوتەکە هاتبووە دەرو، لەسەر تاشە بەردەکەوە خەریکی قسەکردن بوو و ئەو رۆژە منیش لەخزمەتیدابووم.

لەکاتێکدا قسەی دەکرد، لەپڕ قسەکانی خۆی بڕی و وتی(رەقمی قەتلی من ئاما) واتە(کاتی کوشتنی من هاتووە). ئامادەبووان هۆیەکەیان لێ پرسی، بەڵام ئەو هێندەی وت کەمەسەلەکە باتینەو دەبێ بڕۆم.

شا تەیمور کەسێکی سادەو نەخوێندەوار بوو، بۆیە نامەکەی دایە من تا بیخوێنمەوە. کاغەزەکەم کردەوەو زۆر بەرێزەوە بانگێشت کرابوو، هیچ یەکێ لەو وشانەی تەیمور باسی کرد، تێدا نەبوو. ئینجا وتی (باوانم) (؟) تۆ نازانی ئەو هەمان ئەوەیە کەوتم و ئاهێکی کێشاو فەرمووی (رەزام بەرەزای باتن).

پاش درکاندنی ئەو دوو وتەیە، گۆچانەکەی دەست دایێ و هەستاو رووی کردە ئەو کۆمەڵە کەسەی لەدەوری دانیشتبوون (خەڵکینە، مەسەلەکە مەسەلەیەکی باتنەو دەبێ من بڕۆم و هەر دەشڕۆم و جارێکیتر نامبیننەوە، تا پاش چەند سەدەیەك، کەلەگەڵ (شای دالاهو)دا دەگەڕێمەوە. بۆیە

مانەوەی ئێوە لێرە مەترسیدارەو چیتر سوودی نییە، هەروەها هەرکەسێکم لەگەڵ بێ دوچاری مەترسی دەبێ و ئینجا لەگەڵ نامەبەرەکە کەوتەڕێ.

چوومە لای تەیمورو وتم، ماڵمان لەگاهوارەیە، ئەگەر مۆڵەتم بدەی تا ئەوێ هاوڕێتیت دەکەم، ئەویش وتی قەیناکاو کەوتینەڕێ. لەرێگا وردە وردە لێوی دەبزواندو شیعری دەخوێند بێ ئەوەی لێی تێبگەین چی دەڵێ تا گەیشتینە نزیك (؟) کەدەکەوتە دوو میلی باشووری رۆژاوای گاهوارەوە. نامە بەرەکەی ئەسەدوڵلا خان پێشکەوت و هاتنی تەیموری راگەیاند.

ئەسەدوڵلا خانی فەرمانڕەوا بەخۆی و سەیدو کاربەدەستەکانەوە، کەسوارەو پیادەبوون و لەدووری نزیکەی میلێك لەگاهوارەوە هاتنە پێشوازی کردنی تەیمور. هەرکە لەدوورەوە چاویان بەتەیمور کەوت لەولاخەکان دابەزین و لەدوو سێ جێگاداو بەوپەڕی رێزەوە دەهاتنە پێش و دەکەوتنە سەر پێی و ماچیان دەکردو پاشان هەڵدەستانەوە دەستیان ماچ دەکردو ئەحواڵ پرسیان لێدەکرد.

پاش دەست و پێ ماچ کردن ولاخێکیان بۆ شا تەیمور هێنا تا سواری بێ، بەلام شا تەیمور قبوڵی نەکردو بەپێ کەوتەڕێ. ئەسەدوڵلا خان و کاربەدەستەکانی ترو سەیدەکانیش کەبەسواری بۆ پێشوازی کردن هاتبوون، بۆ رێزلێنان لەتەیمور سواری ولاخەکانی خۆیان نەبوون و بەپێ لەملاو ئەولاو بەدوای تەیمورەوە کەوتنە رێ ،تا گەیشتنە نزیك گوندی گاهوارە. لەگوندی گاهوارەش خەڵکێکی بێ شومار کۆبوونەوەو لەوێش نیوسەعاتێك بەدەست و پێ ماچ کردنەوە دواکەوتن.

پاش گەیشتن بەگاهوارە، تەیموریان بردە ژوورێکەوە کەپێشتر لەماڵی خان ئامادەکرابوو. لەماڵی ئەسەدوڵلاخانیش خەڵکانێکی زۆر بۆ دەست و

پێ ئەسەدوڵلا ماچ کردن سەردانی تەیموریان کردو هەندێکیان پاش وەرگرتنی مۆڵەت دادەنیشتن و هەندێکیان دەڕۆیشتن.

کات، کاتی نیوەڕۆ بوو، قوربانی یەکانیش پێشتر ئامادە کرابوون و لێنرابوون. بۆ ئەنجامدانی دوعاو مەراسیمی مەجلیسی جەم کەباوە، هەمووان بازنەیەکیان پێکهێنابوو و گۆشتە نەزرکراوەکەیان خستبووە ناو چەند تەشتێکی گەورەوەو ئێسکەکانیان لەگۆشتەکە جیاکردبووەوەو لەچاڵیان دەنا، ئەوانەی پێشەوە هەریەکەو بەزمانی خۆی دوعای دەخوێندو ئەوانی‌تر دەیانگوت ئامین. پاشان گرتکێك گۆشت، کەبەشی خواردنی یەك کەس بوو، دەخرایە ناو نانێکی تیری گەورەو دەکرایە بابۆڵەو کەپێی دەڵێن(نواڵە)هەریەکەی بابۆڵەیەکی دەدرایە. پاش ئەنجامدانی ئەو مەراسیمەو خواردنی نانی نیوەڕۆ، ئامادەبووان کەوتنە گفتوگۆو قسەو باس تا دەمەو ئێوارە. ئێوارە ژمارەیەکیان ڕۆیشتن، بەڵام سەیدو کاربەدەستەکان لەگەڵ ئەسەدوڵلاخانی فەرمانڕەوا تا سەعات ٣ یان چوار مانەوە. پاشان دەستێك نوێنیان بۆ شا تەیمور هێناو هەرکەس چووەوە ماڵی خۆی.

دواجار (اسد الله)ش هەستاو چووە ژوورەکەی خۆی، بەڵام مەئمورە دەستنیشانکراوەکە بۆ دڵنیابوون دووکەسی لەپیاوانی خۆی و دوو کەسی لەپیاوەکانی (اسد اللە) خان لەپشت دەرگاکەوە داناو رایسپاردن تا نەخەون و چاودێریی تەیمور بکەن. پاش ئەو راسپاردنە مەئمورەکە چووەوە ماڵی خۆی. بۆ سبەینێ بەر لەخۆرکەوتن و پێش هەمووان مەئموورەکە هاتەوەو لەژووری بەرامبەری ژوورەکەی تەیمور کەجێگای دانیشتنی کاربەدەستانی حکومەت بوو، دانیشت و وردە وردە ئەوانی تریش هاتن، لەو کاتەدا ئەسەدوڵڵا خانیش هات و هەمووان چاوەڕوانی لەخەوهەستانی شا

تـەیموربوون. نزیکـەی دوو سـەعاتی خایاند، کەچی شـا تـەیمور نەلەخـەو هەسـتاو نـەدەنگی هـەبوو. هـەمووان وتیـان لەوانەیـە لەبەرئـەوەی بـەپێ هاتووەو ماندووە، با سەعاتێکیتر چاوەڕێ بکەین. سەرەنجام مەئمورەکە تـەنگی پـێ هـەڵچنراو هەسـتا لەسـەرخۆ دەرگاکـەی کـردەوەو لـەدرزی دەرگاکەوە تەماشایەکی ژوورەکەی کـردو کتوپڕ بەپەشـۆکاوی گەڕایـەوەو وتـی، نوێنەکە وەك خۆی مـاوەو تـەیمور لەژوورەکـەدا نیـیە. ئامـادەبووان هـەموو سەیریان لێهات و خودی (اسـدالله)ش هەسـتاو چـووە ژوورەکـەوەو هیچ ئاسەوارێکی تەیموری تێدا بەدی نەکردو بەجارێ پەرێشان بوو و لەناو خـەڵکدا وابڵاوبۆوە کەگوایـە شا تـەیمور رایکـردووە. مەئمورەکە تاوانەکـەی خستە ئەستۆی دوو سوارەکەی هـاوڕێی خـۆیو دوو پیاوەکـەی (اسـدالله) خان و بەجیدی کەوتە گەڕان بەدوای تەیموردا، تا بزانێ بۆ کوێ ڕۆیشتووە. تەنانـەت مەئمورەکە تـاوانی ئـەوەی خستە پـاڵ ئـەو چـوار کەسـە کەگوایـە بەرامبـەر بـەئازادکردنی بـەرتیلیان وەرگرتـووەو هەرچـەندە ئەوبێچارانـە سـوێندیان دەخـوارد، سـوودی نـەبو و کوتـەکیان دەخـواردو ئەشـکەنجە دەدران و سەرەنجام هەر چواریان زیندانیکران. ئەسەدوڵلا پەرێشان و مات و مەلوول بوو، نەیدەزانی تەیمور چی لێهاتووەو بەناچاری کەسێکی ڕەوانەی ئەشـکەوتەکەی تـەیمور کـرد، بـەو خەیاڵـەی لەوانەیـە گەڕابێتـەوە ئـەوێ. بەرێکـەوت دوو سـێ ڕۆژ پێشـتر ئەسـەدوڵلاخان بـۆ چـاککردنی هەڵـەو پشتگیریی لەتەیمور نامەیەکی بۆ (عماد الدوله) نوسیبوو و داوای لێبوردنی تەیموری لێکردبوو. بەڵام نامەبەرەکە بەپەلەو پرووزە گەڕایەوەو رایگەیاند کە خەریکە دنیا خراپ دەبێ. لێیان پرسی چی بووە، وتـی ئـەمڕۆ دەمـەو بەیان لەمـەیدانی تۆپخانـەوە تێپـەڕیم و لـەدامێنی تـورە (جێگـای پۆلیسـی

ئێستا، جێگای زیندانی حکومەت)و لەکەناری حەوزەکە یەکێکیان سەربڕی، بەچاکی لێم روانی بینیم شا تەیمورەو سەریان لەلەشی جیاکردووەتەوە، نامەبەرەکە لەگەڵ گێڕانەوەی رووداوەکەدا دەگریاو فرمێسك بەچاویا دەهاتە خوارەوە. ئەسەدوڵلاخان و ئامادەبوان ئەگەرچی هێشتا باوەڕیان بەوپێشهاتە نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا پەژارەو غەم دایگرتبوون، لای ئێوارەی هەمان رۆژ (عماد الدولە) نامەبەرێکی نارد کەفەرمانێکی بۆ مەئمورەکەو فەرمانێکیتری بۆ ئەسەدوڵلاخان تێدابوو. هەروەها لەنامەکەدا نووسرابوو کەتەیمور بەپێی خۆی هاتووەتە کوشتارگەو کاری تەواو بووە، ئێوەش موریدەکانی دەروبەری بلاوە پێ بکەن و یەك دو کەسی ناسیاوی بۆ شار بێنن.

لەو سەروبەندەدا ئەو کەسەی رەوانەی ئەشکەوت کرابووەوە، گەڕایەوەو رایگەیاند کەنەتەیمور لەوێ بوو، نەهیچ یەکێ لەپەیرەوەکانی.

مەئموری ناوبراو دیاریو بەخشیشی خۆی لە (اسد الله )خان وەرگرت و گەڕایەوە بۆ شار. ئەوە پوختەی سەرگوزەشتەی شا تەیموری گۆران بوو، بەپێی گێڕانەوەی مەلا مستەفا قەلخانی.

پێشبینییەکانی شا تەیموور بەشیعر وتراون زۆرن و بەشێوەی بەندبەندو بەناو (رەوشی تەیموری) وتراون. هەر رەوشێك تایبەتە بەبابەتێك، لەوانە ئەم چەند شیعرەی کەبەرەوشی تایبەت بەپێشهاتەکانی سەردەمی ئێستایە (١٣٠٥ی کۆچی هەتاوی). بۆنموونە لەکۆتایی ئەم کورتە مێژووییەدا بڕوانە وتەکانی تەیمورو پێشبینییەکانی کەتاچەند، مو بەمو

نیشانی پێکاوەو بەئاشکرا نیشانی داوە، وەك چۆن وتراوە مشتێ نموونەی خەرواریکەو کەم نموونەیە بۆ زۆر.

«ولە»

تیمور عیان و حکم باطن و نت عیانن    و امــــر بــــاطن وقت بــــیانن
تــیمور مــواچـه چـه قـول بـاطن    و اعــــجاز پــــاک امــام ضــامن
رضـای در رضـای یکتای بی‌همتا    بــی‌مثال و رفـیق کس سـر نزانـا
ای دوره تـــــارن دورهٔ قـــجرن    دوران قـــجر پــر شــور و شــرن
شکـــاک کـــور زیـــن، دار بـــی‌برن    حـــقیقت گـــمن بـــاطل ســمرن
عـــدالت گـــمن ظــالم و زورن    حق‌گویان زبون، حق بینان کورن
دوران قـــجر دیـــن کـــم عــیارن    دیانت خاموش راگـه شـان تـارن
دور قـــــجرن نســـــل تــــاتارن    حرف حق لاشـان چـو زهر مـارن
وای ای دوره بــــــی‌دوامــــنی    تــــوسن ســـرکش بـــی‌لجامنی
دو کس مـــــلوزم و قـــجرمیون    نـــار نــنگشان له دفــتر مــنون
یکـــیشان قـابض اروای نـاصرن    و او یکــی هــنی احــمد بــاطلن
قـــجر قــرانــن له ایــران زمــین    واتــــه بـــــاطنن و امــــر یــقین
لوای نـــاتمام جـــموری عــیان    بگــیر و شــهرت نـه مـلک ایـران
لودمـــا احــمد و تــاو و جــخت    و امــبر بــاطن مکــفو له تــخت
ایــــران لودمـــا امــن امـان بـو    جمهوری مطلق و جخت عیان بو
لودمـــا و پـــا جـــنگ دیـــن مــبو    ای جـــنگ دیـــنه له قــزوین مبو
آو آســـیا و ان کـــل مـــیوا ســرین    آوهـــســر مـــزی مستکبر و هــوین

| | |
|---|---|
| اوســـا مکـفو خـروش غـوغو | اسبان تشنهٔ آب، مـردان تشـنهٔ کـو |
| نـــابوشا ســوار نــه پــرده خـفا | رومکـــی عـــیان و خـلق بـــرملا |
| مــن نــه رکــاوش بگــیلو مــوه | شـــور رسـتاخیز مــخیز و مــوه |
| هــونیان ویـم یک یک و قـصاص | مکـیشرم و هـوین و تـیغ الماس |
| ای واتــــهٔ مـــنه له آخـر زمـان | و کـــــل خـلقان پــاک مـبوعیان |
| ســروش غـیبیم و گـوش یـه وانـا | تیمور سرفاش کـرد سـرو پـی دانـا |

(راپۆرتـــی خوالێخۆشـــبوو مـــیرزا بـــاقر فـــانی، کۆمەڵـــەی ســـەید عەبدولحوسێنی سوڵتانی دەستنووسی کتێبخانەی نووسەر)

لەکۆبەندی راپۆرتەکانی سەرەوەو بەگوێرەکۆچیسەی نووسەری (ناسخ التواریخ) دەردەکەوێ کەدانیشتوانی ناوچەکە باوەڕیان بەجەنابی تـەیمور هــەبووەو ناوبژیوانـەکری ئەســـەدوڵلا خـــان کەنـــەدژی ئـەنجامدانی ئـــەو مەئموریەتە بوو کەپێی سپێردرابوو، نەدەیویست تەیمور دەسگیربکا، بەڵکو هــەوڵی دا ئـەو تۆمەتانـەی درابوونـە پـاڵ تـەیمور نـەهێڵێ و ئـازادی بکـا. هـەروەها (عماد الدولـه) زەمینـەی دەسـگیرکردنی تـەیموری خـۆش کردبـوو، خودی خۆی یەکەی سوارەی تایبەتی بۆ دەسگیرکردن و هێنـانی تـەیمور بۆ قــەڵای حکومــەت ولــەگۆران پێکــهێنا، بۆئــەوەی دانیشــتوان و تەنانـــەت حکومەتیشی لێ ئاگاداربکاتەوەو ئەو یەکە سوارە تایبەتـە، داواکـەی (عماد الدوله)یان بەنهێنی ئەنجامدا. لەبەرامبەردا جەنابی تەیمور کەشەهیدبوونی خۆی بەمەسەلەیەکی باتنی لەقەڵەم دەدا. بەرەنگاری حکومەتی نەکردو ملی بۆ داوای باتن کەچ کردو بەو جۆرە راپـەڕینی تـەیمور لەسنوری عەلەوییە توندڕەوەکان ئەهلی حەق، لەسنووری گۆران کۆتایی هات.

## درێژەی بزاڤی تەیموری:

بەدەرکەوتنی حەزرەتی تەیموری دووەم (فەتاح)، بڵێسەی ڕاپەڕینو بزاڤی تەیمور لەناوچەکانی سەحنە، دینەوەر، کرماشانو.. دەستی پێکردووەو درێژەی پێدرا، چونکە بەگوێرەی ئەوەی ئاغا سەید ئەمروڵلا شاە ئیبراهیمی نووسیویەتی، مەلا بەهرام خان گەشویری لورستانیی بەرپرسی زیندانی تەیمور، کەپاسەوانو پارێزەرو چاودێری ڕووداوە ڕواڵەتیەکانو جیهانە باتنیەکانی ئاغا تەیمور بوو، وتویەتی کەجگە لەبینینی کەشفو کەراماتو موعجیزەی زۆرو زەبەندی جەناب تەیمور لەشەوی سێهەمی شەهیدکردنیدا، تەنانەت خودی ئاغا تەیمور پێش شەهیدکردنی بەم بەیتە شیعرانەی خوارەوە، مژدەی داوەتە مەلا بەهرام خان کەباوەڕێکی پتەوی بەجەناب تەیمور بووەو پێی ڕاگەیاندووە کەپاش مانگو نیوێك دەردەکەومەوەو خەڵکی بەئاشکرا دەبینن، نامرمو هەراو هۆریایەکی گەورە بەرپا دەکەم. بنچینەی ئەو بەیتانە کەمەلا بەهرام خان نووسیویەتیو پاشان لەسەحنە نیشانی خوالێخۆشبوو سەید فەرەجوڵلا شای ئیبراهیمی داوە بەمجۆرەی خوارەوەیە:

| | |
|---|---|
| پـــــری زنجیرم دل مارانو تنگ | بەکردە ویمنو هزاران رنگ |
| وعدە مویەرو یـك مانگو نیمی | مکرومو پاشـــور عظیمی |
| ذات من نە ذات حـــیدر دورنین | شکاکان ماچان بەتیمور نین |
| یاران بزانان بەکـــــــــــراماتە | مردە زندەبی هیهات هیهاتە |

وەك گێڕدراوەتەوە، تەیموری دووەم (فەتاح) بەو خەسڵەتانەی پێشتر ئاغا تەیمور باسی کردووە، لەناوچەی بالاوەندو لەرۆژگاری حکومەتی لوتف عەلی خان بالاوەندی هاوچەرخی (عماد الدولە)دا دەردەکەوێ.

دەرکەوتنی تەیموری دووەم دەگاتە گوێی ئەوانەی باوەڕیان بەدووبارە دەرکەوتنی ئاغا تەیمور هەبوو، بۆیە بەپەلە زیارەتی دەکەن. هەروەها باوك و دایك و برای ئاغا تەیمور درك بەتەیموری دووەم دەکەن، بەتایبەتی دانیشتوانی سەحنە کەئەو دەرکەوتنە بەدرێژەپێدانی رۆحی و جسمیی حەزرەتی تەیمور لەقەڵەم دەدەن و پێشوازی لێدەکەن و چەندین موریدی بەرجەستەی ئەو ناوچەیەی دەخەنە خزمەت، لەوانە ئاغا سەید فەرەجوڵلا شای ئیبراهیمی و شێخ نەزەر عەلی جەنابکەکاریگەریەیکی گەورەیان، لەبڵاوکردنەوەو درێژەپێدانی بزاڤی تەیموری، لەناوچەکانی سەحنەو دینەوەرو کرماشان و تاراندا هەبوو.

پاش دەنگدانەوەی بزاڤ و دەرکەوتنی تەیموری دووەم، لەکاتێکدا گەشتێك دەگەڕایەوە بۆ بالاوەند، لەگەڵ دەروێش نەسروڵلا وەندی هاوڕێی تایبەتیدا، لەلایەن مەئمورانی حکومیی لورستانەوە دەسگیر دەکرێن و ماوەی ١٨ مانگ لەزیندان بەسەر دەبا. لەلایەکەوە هیچ تاوانێك بەسەریدا ناسەپێ و ولەلایەکیترەوە دووپاتکردنەوەکۆچیازییەکانی شەرع، ئاغا تەیمور لە(بەرزەخ) زیندانی دەکرێ، چونکە مەئمورانی حکومەت لەوە دەترسن ئازادکردنی بەئاشکرا ببێتە مایەی ناڕەزایی بەرهەڵستکارانی حکومەت، بۆیە بەنهێنی پێشنیازی راکردن لەزیندان دەخەنە بەردەمی. ئاغا تەیموریش پێشنیازەکە بەو مەرجە قبوڵ دەکا کەسەرجەم زیندانییە بێگوناهەکانیشی لەگەڵدابێ، ئەوانیش ئەو مەرجە قبوڵ دەکەن و زیندانیەکان پێکەوە لەزیندان رادەکەن. ئاغا تەیمور ماوەیەك لەدەوروبەری سەحنەو ئەسەد ئابادو هەمەدان و ئەسفەهان و چەند شارێکیتر بەسەر دەباو لەیەکێ لەو سەردانانەدا لەزرەندی ساوە، دووبارە لەلایەن مەئمورانی

حکومەتەوە دەسگیر دەکریّو رەوانەی تاران دەکریّو لە(انبار شاهی)ی مەیدانی ئیّستای ئەرك زیندانی دەکریّ. لەناو زیندانەدا ژمارەیەکی بەرچاو لەمەئمورانی زیندانو زیندانیەکان پەیوەندی پیّوە دەکەن.

هەروەها پاش لیّکدانەوەی خەونیّك بۆ ناسرەدین شا (١٢٦٤ . ١٣١٣ی کۆچی) کەداوای خەون لیّکدەرەوەی کردووەو جنابی تەیموری دووەم دەبریّتە دەرباری شاو، پاش چەند روونکردنەوەیەك ماهیەتی خەونەکە بۆ شا لیّکدەداتەوە. شا لەوەلامدا دەلّیّ:..( هەمان ئەو کەسەی کە لەرۆژاوای ولاّت ئاژاوەت دروست کردووەو ئیدیعای پاشایەتی دەکەی) تەیموریش لەوەلاّمی شادا دەلّیّ: ئیّمە پاشای باتنینو پاشایەتی روالّەتمان بەتۆوکەسانی وەکو تۆ..) هەرچۆنیّ بیّ لەپاداشتی لیّکدانەوەی خەونەکە، شا ریّزی لیّدەنیّو موچەیەکی سالاّنەی بەدلّی خۆی بۆ دەبڕیّتەوە هەموو پیّداویستییەکی سەفەرو نیشتەجیّبوونی لەشاری هەمەدان بۆ دابین دەکات. لەهەمەدان بەهۆی بیروباوەڕی پەیڕەوانو نواندنی کاری نائاساییەوە، سەرنجی بنەمالّەکۆچیەرەگیّوزلوی هەمەدان، کەبنەمالّەیەکی سەر بەروحانییە گەورەکانو ئەهلی مەشرەبو زەوق بوون رادەکیّشیّو ئەمیر ئەفخەمکۆچیەرەگویّزلو، فاتمە خانمی کچی خۆی لیّ مارە دەکاو بەئەنجامی ئەو پەیوەندیەدا کوڕیّکیان بەناوی حەسەن شا (قطب الدولە) دەبیّ.

(فرید الملك قەرەگویّزلو لەیاداشتەکانیدا چەندین جار ناوکۆچیطب الدولەی بردووە)

پاش ماوەیك ئاغا تەیموری دووەم لەهەمەدان کۆچی دوایی کرد، پڕوپاگەندەی واهەبوو لەناو خەلّکدا کەگوایە تەیمور ژەهرخوارد کراوە. بەگویّرەی وەسیّتنامەی خۆی، لەگەرماوی بن بازاڕدا دەیشۆنو تەرمەکەی

لەپاڵ ئارامگەی بابا تاهیری هەمەدانیدا بەخاك دەسپێردرێ. دەروێش نەسروڵلا هاوڕێی نزیك و تایبەتی تەیمور، کە گەنجینەی سەرگوزشتە باتینییەکانی حەزرەتی تەیموری دووەم بوو، لەسەردەمی ئاغا تەیموری دووەمدا لەشارۆچکەی تویسرکاندا دەژیاو پاش مردنی ئاغا تەیموری دووەم گەڕایەوە تویسرکان و زیاتر لە٧٠ ساڵ تەمەنی کردو تا لەژیاندابوو پەیوەندیی خۆی لەگەڵ نەوە روحانییەکانی تەیموری دووەمدا نەپچڕاند تاسەرەنجام هەر لەشاری تویسرکاندا مرد (شرح زندگانی واحوالات جناب تیمور بان یارانی و ئاقا تیمور ثاني ملقب به فتاح، سید امر الله شاى ابراهیمی، صحنه ، دیماه ١٣٦٤)

بزاڤی تەیموری لەسەردەستی نەوەکانی درێژەی پێنەدرا، چونکە حەسەن شا (قطب الدوله)ی کوڕی، خوێندنی تەواو کردبوو و ئەهلی زانست بوو، بۆیە لەدەرباری ئەحمەد شاکۆچیاجاردا، ژیانێکی خۆشی بەسەردەبردو کاری دەکردو زیاتر کەسێکی دنیایی بوو.. تاقە نەوەی (قطب الدوله)ش کچێك بوو کەشووی بەسەید عەلی ئەسغەر تورکستانی کرد، کەیەکێ بوو لەگەورە پیاوانی ئەهلی حەق و گوایە کچەکەش کەسی لەدوا بەجێنەما.

بەڵام سەید فەرەجوڵلا شاە ئیبراهیمی لەهەمەدان و کرماشان و سەحنەو دینەوەرو ئازەربایجان و شێخ نەزەر عەلی جەناب کە بەفەرمانی تەیموری دووەم (فەتاح) کاروبارەکانی تارانی ئەنجام دەدا، لەتاران بەهاوکاری موریدە راستەقینەکانی تری ئەو حەزرەتە، وەك نەوەی باتنی و روحانی و راستەقینەی ئاغا تەیمور، نەیانهێشت چرای بزاڤی تەیموری کوێر ببێتەوەو بەرووناکی هێشتیانەوە.

## راپەڕینی ئاغا سەید رۆستەم حەیدەری گۆران (١٣٠٠ كۆچی)

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی مەسعود میرزا (ظل السلطان)ی كوڕی ناسرەدین شادا، زوڵم و زۆری فەرمانڕەواكانی سەر بە(ظل السلطان) سنووری خۆی تێپەڕاندو وای كرد لەسەرتاسەری رۆژاواو ناوەندی ئێراندا، یەكێتییەك لەسەر بنەمای مەزهەبەی گۆران، لەنێوان خێڵە هاوسنوورەكاندا، بەسەرۆكایەتی ئاغا سەید رۆستەم رێبەری مەزهەبی گۆران دروست بێ. بۆ ئەو مەبەستە لەماڵی سەید رۆستەم لەتوت شامی، تایفەكانی گۆرانیقەلعە زنجیری، كرندی، كەلهور، لەسەر بنەمای بیروباوەڕو عەشایەری خۆیان هاوپەیمانێتییەكیان پێكهێناو سوێندیان خوارد، تا دژی حكومەتی (ظل السلطان) راپەڕن، چونكە مەسعود میرزای (ظل السلطان) لەرێگای سەپاندنی باج و خەراجی قورس و تاقەت پروكێن و بێگارییەوە، حكومەتێكی لەناو حكومەتدا دروست كردبوو، بەجۆرێ جگە لەپارەوپول هیچی لەدەست و پێوەندەكانی خۆی نەدەویست و ئەوانیش ئازادانە هەموو دەست درێژیەكیان دەكرد.

حسێن خان (سەرداری گەورە)ی سەرۆكی ئێلی گۆران لەبەر رەوشتی موحافیزكارانەی خۆی، ئامادە نەبوو بەشداریی ئەو هاوپەیمانێتییەی سەرەوە بكا، فەراموورز سوڵتان كرا بەفەرماندەی سەربازی راپەڕینی ئاغا سەید رۆستەم حەیدەری گۆران و ئالای راپەڕینی گرتە دەست. لەو سەروبەندەدا جموجۆڵی بازرگانێتی، كەلەژێر سایەی ئینگلیزو عوسمانییەكاندا بووو، رەنجی هاووڵاتییانی بەتاڵان دەبرد، كەوتە مەترسییەوە.

هاووڵاتییانی ژێر ڕکێفی هاوپەیمانێتییەکە، دڵنیاییان پەیداکردو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی لایەنگرانی ڕاپەڕین لەدژی حکومەتی ستەم زیادی دەکرد، تا کار گەیشتە ئەوەی کە (ظل السلطان) و ناسرەدین شا لەو ڕووەوە کەوتنە دانوستان و ڕاوێژکردن. شا لە وەڵامی کوڕەکەیداو بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ڕاپەڕینی گۆران نووسی (.. چاککردنی زەهاو و قەرەبووکردنەوەی وێرانکارییەکان، پێویستییان بەفەرمانی تایبەتە،زەهاو دەبێ بەباشی ئاوەدان بکرێتەوە. خۆت هەموو ئامرازێکی کارت لەبەردەستدایەو هەرچییەك لەبارەی بیرکردنەوەی باش و ئاوەدانیو ڕێکخستنەوە بخەیتەڕوو، مایەی پەسەندی ئێمەیە. بۆ ڕێکخستنی کاروباری گۆران و هەندێ سەرنجی ناوخۆیی، لێکۆڵینەوەی دروستی خۆت بەڵگەیەو ئەوەی بەچاك و دروستی دەزانی ئەنجامی بدە. بۆ ئەمجۆرە کێشانە پێویست ناکا لەلایەن ئێمەوە حوکم و فەرمان بدرێ) (٣ی رەجەب، یونت ئیل ٢٩٩ کۆچی (اسناد برگزیده دوران قاجاریه، ص ٧٤).

پاشان (ظل السلطان)، حاجی سەید سەیاح مەعروف، کەلایەنگرو مەئموری نهێنیو ئاشکرای خۆی بوو، بۆ هەڵسەنگاندنی کێشەکەو لێکۆڵینەوەی بارودۆخ و ئامادەکردنی ڕاپۆرتێك، ڕەوانەی ناوچەکە کردو کاردانەوەی (ظل السلطان) بەگوێرەی ڕاپۆرتەکەی حاجی سەید مەعروف ڕێکخرا. حاجی سەیاح لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا، سەبارەت بەو سەفەرە (مەئمورییەتە) نووسیویەتی: بریتین لەدوو تایفە (گۆرانەکان) کەهەردووکیان لەکوردەکانی ڕۆژاوای ئێرانن. یەکێکیان (گۆرانی کرندی) کە عەلی مورادخان سەرۆکایەتی دەکاو ئەویتریان تایفەی گۆڕانیقەڵا (زنجیری)یە کە سەرۆکەکان حسێن خانەو گوایە زنجیری دادەپەروەری نەوشیروان لە شوێنێکدا بووە کەئێستاماڵی ئەمانە، سەید ڕۆستەم لەو

ناوچەیەدا سەرۆکی مەزهەبییەو بەوتەی حاجی سەیاح سەرۆکی ئەهلی حەقەو سەرجەم دانیشتوانی ئەو دەوروبەرە موریدو فیدای ئەون، خێوەتگەکەی سەید ڕۆستەم لەتۆت شامی‌یە، ئاوو هەوایەکی خۆشی هەبوو، بەر لەسپێدە لەبابا یادگارەوە بەسواری لەوچیایانەی ئاوهەوایان سازگارە بەگەشت‌وگوزار کەوتمە ڕێ‌و لای نیوەڕۆ گەیشتمە تووت شامی، لەگەڵ گەیشتم یەکسەر بردمیانە خێوەتگەکەی سەید ڕۆستەم کەگەنجێکی قۆز بوو، کڵاوێکی لبادی لەسەر بوو، جل‌و بەرگی لەلباد دروستکراوی لەبەربوو. ئینجا مەڕێکیان سەربڕی‌و کەوتینە قسەو گفتوگۆ، وتم: لای حکومەت بەباشی باست ناکەن ناسرولمولکم هێشتا نەبینیوە، بەڵام ئەوانی‌تر (مەبەستی ظل السلطان) بوو بەخراپە باست ئەکەن، لەوەڵامدا سەید ڕۆستەم وتی: من گوناهێکم نی‌یە. چەند کەسێك بەهاوبەشی ئەسپێکیان کڕیوەو بۆ سواربوون داویانە بەمن‌و ئەو ئەسپە حکومەتی تۆقاندووە هەزاران ئەسپیان هەیە، نابینن کەچی ئەو تاقە ئەسپەی من دەبینن. منیش لەبەرئەوەی خەڵکی مینییان هێناوەو سوودی لێ وەردەگرن‌و کڕیارەکان هەم رازی نین، ناتوانم ئەو ئەسپە پێشکەش بکەم. ئەو ئەسپە بەجۆرێ دەرکەوتووەوبۆ ئەوەی نەکەونە شپرزەییەوە، منیان بەیاخی داناوەو داوای کوشتنم دەکەن، تا ئەسپەکە بەتاڵان بەرن. بۆ بەدبەختی، حکومەتیش دەسەڵاتی تەواوی داوەتە دەست‌و پێوەندەکانی خۆی‌و تا ئەوپەڕی بەهێزی کردوون، بەجۆرێ ئەوانیش دەستدرێژی دەکەنە سەر ماڵ‌و گیان‌و ئابڕووی هەموو کەسێك‌و هەر ستەمێك بیانەوێ ئەنجامی دەدەن‌و ئەگەر کەسێ نەیەوێ، ئەو ستەم‌و زۆرانە قبوڵ بکا، ئەوا بەبنەماڵەکەیەوە لەناوی دەبەن. ئەوەیە گوناهی من‌و کەسانی

وەکو(داستانی ئەسپ زیاتر لێکچواندنەو ئەم بابەتە لێکچوونێکی تەواوی لەگەڵ ئەو بابەتەی سەبارەت بەمیر خەسرەو لەسەرەتای بەشی یەکەمی سەرەنجامی (سەردەمی حەوتەوانە) دا هاتووە، هەیەو لەبنەڕەتدا ئەسپ لەرێورەسمی عەلەوییەکاندا (یارسان) وەك ئێرانی‌یە کۆنەکان، پێگەیەکی تایبەتی هەیەو ئاماژەو هێمای دەرکەوتن و راپەڕینە).

لەو سەروبەندەدا چەند سوارێك دەرکەوتن کەیەکێکیان فەراموورز سوڵتان بوو. فەراموورز کەسێکی زۆر تێگەیشتوو ژیر بوو، بۆ ماڵی خۆی لەتەختگا بانگێشت کرد. شەومان لەماڵی سەید رۆستەم بردەسەرو نیو سەعاتێکی مابوو بۆ دەمەو بەیان، بەرەو تەختگا کەوتینەڕێ. چونکە ماڵەکەیان زۆر دوور نەبوو، کەگەیشتمە ئەوێ، ئەوپەڕی رێزیان لێنام. حسێن خان یاوەرو سوڵتانەکان سەردانیان کردم و پێکەوە رۆژمان بردە سەر ئینجا وتم (دەمەوێ سبەی یەکسەر لێرەوە بەرەو کرماشان بڕۆم) وتیان : دوورە. بەڵام تکام لێیان کرد تا زوو بکەوینەڕێ. سوارەکانی عەلی مورادخان (احتشام الممالك) یان گەڕاندەوەو خۆیان چەند سوارێکیان خستە تەکم) (خاطرات حاج سیاح، ص ٢٣٠ ـ ٢٣١)

پاش گەڕانەوەی حاجی سەیاح، (ظل السلطان) بەهەموو هێزێکی مرۆیی و چەك و جبەخانەو بەپشتیوانی دارایی ئاغا حەسەن (وکیل الدولة)و لەژێر چاودێری نوێنەری سەربازی عوسمانی دەستی کرد بەسەرکوتکردنی راپەرینە سیاسی و مەزهەبییەکەی ئاغا سەید رۆستەم حەیدەری گۆران و خەڵکی گۆران یارمەتی کەلهوری‌دا بەفەرماندەیی فەراموورز سوڵتان تفەنگچی، (ظل السلطان) بەمجۆرە باسی رووداوەکە دەکا: ( لەیاداشتە رۆژانەکەی خۆمدا صاحب دیوانم لەگەڵ (جلال الدوله) (کوری ظل السطان) بەکەلوپەلی تەواوەوە بەرەو (شیراز) فارس ناردو خۆیشم تەرخانکرد بۆ

ڕێکخستنی کاروباری کرماشان و(سنه) کوردستان، کەهەزار پلە لەلورستان خراپتر بوون، چونکە ئێلەکانی کرماشان دەستیان دابۆوە جۆرێ سەرەڕۆیی. گومانی تێدانەبوو کەبارودۆخی ئەو ئێلانەی کرماشان لەلورستان خراپتر بوو.. هۆزەکانی گۆران لەلایەن دوو سوڵتانەوە، فەراموورز سوڵتان و حسێن عەلی سوڵتان ناوێکەوە، دەستیان بەئاژاوە لەو ناوچەیەدا کردبوو کەباسکردنی مایەی نەفرەتە(!) هۆزەکانی کرندو کەلهور هەزار پلە لەچەلەبی و گۆران خراپتر بوون و بێ سەروبەری باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو. یەکەمجار بەتەلەگراف فەرمانم دابە حاجی حەسەن (وكيل الدولة) تا هەر کاتێ (ناصر الملك) پێویستی پێبوو یەکسەر کوورێکی بداتێ و بۆ (ناصر الملك) هەم تەلەگرافێم کردو پێم ڕاگەیاند کەتۆ لەهەموو جێگایەك و هەموو کات وەزیری پلە یەك بووی و لەکەموکوڕی کاروبارەکان باشتر ئاگاداری و دەزانی کەمەبەست شای ئێمە چییەو چی دەبێتە مایەی ناوبانگی ئاغاکەت، بەوتەی میرزا مەلکەم خان، هاوڕێی هەردوکمان و چارەی هەموو گرفتەکان پارەیە. بۆیە بێئەوەی خۆت پێشنیاز بکەی و داوا بکەی، ٥٠٠ هەزار تومانم بەهۆی وەکیل الدولەی ئینگلیزەوە بۆ حەواڵە کردووی، سێ تیپی هەمەدان، کەلەتیپەکانی عاشقلون لەژێر فەرماندەیی خۆتدا دەبن و حسام الملك ئامادەی کردوون و چوار تیپیشم لەعیراقەوە ناردووە، کەسەرجەم دەکاتە (٧) تیپ. خۆیشم بە(١٢) هەزار عەسکەرەوە لەبروجەرد بۆ بەهێزکردنی لەشکرەکەی تۆ ئامادە دەبم، چونکە دەمەوێ ریشەی ئاژاوە لەبن دەرکەی. هەروەها والی ئەبو قەدارەم بەخۆی و ٢ هەزار سوارو پیادەوە، ڕەوانەی پشتکوە کردووە، جگە لەلەشکرەکەی خۆت لەکرماشان و لەسەربازگەکەی من نزیکە ٢٠ هەزار کەس بۆ شەڕ ئامادەن و ئەمانە تەنها

قسە نین. خۆت باش دەزانی کەکردەوەشی هەیە. دەربارەی پارەوپول چەندت بوێ لە(وەکیل الدولە)ی ئینگلیز وەریبگرەو دەمێنێتەوە عەقڵ و نمەك حەلاڵیو دڵسۆزی کەتیایدایە، (ناصر الملك) بەردەوام لەبەرخۆیەوە دەیوت، کاتێ ئەو تەلەگرافەیان لەتەفەگرافخانەوە بۆ هێنام خوێندمەوە، بەلام تا دوو سێ هەفتە وەلامم نەدایەوەو بەتەلەگرافە ئاساکانی ئێران لەقەڵەمم دا. پاش تێپەڕبوونی سێ هەفتە، سەرنجم دا قۆرخانە* بۆ تۆپ و تفەنگی نەمسایی و چوار هەزار تفەنگ و شەش عەرادەی تۆپ و حصام الملك، عەلی نەقی خان کەزازی بەخۆی (٤) تیپیعیراقیو والی بە ٢ هەزار سوارەو پیادەوە، گەیشتن وەك کەسێکی فێ لێهاتوو، کاتێ مانگی تازە ببینێ، بەتەواوی شێت بووم. ناردمە لای (وکیل الدولە) تا بزانم لەبارەی ئەو حەواڵەیەی ئەسفەهانو (ظل السلطان)ەوە چی دەڵێ؟ وتی: لەهەر جێگایەك بتەوێ ٥٠٠ هەزار تومان ئامادەیە. ئینجا بەئاگاهاتمەوەو زانیم (ظل السطان) لەو جۆرانە نییە، بەڵکو وەك ئاغا محەمەد خانی باپیرەیو نایب السلطنة ئەوەی دەیڵێ، دەیکا. ناوی دەوێ، کاری دەوێ، ئابڕووی دەوێ. داوای (حسام الملك)م کردو وتم: کوڕم کاروبار بەم شێوەیەیە. ئەو پارەو ئەم کەلوپەلانە لەپشتکو و عیراقو ئەسفەهانەوە بۆمان ڕەوانە کراوە. ئێستاش بەم ریشی سپییەوەو ئەو نیعمەتەی پێمان دراوەو ئەو متمانەیەی بەئێمەیان هەیە، جوان نییە خزمەتیان نەکەینو قوربانی لەڕێگای ئەواندا نەدەین. بۆیە هەر ئێستا وەك پەیامبەر بڕۆ و تیپەکانی عاشقلو بێنە بۆ ئێرە. لەبەرخۆیەوە دووپاتی دەکردەوەو بەمنیشی دەوتو سوێندی دەخوارد تا باوەڕم کرد، کاتێ منو (حسام الملك) لەتەلەگرافەکەدا

* قۆرخانە: جبەخانە ( وەرگێڕ)

خوێندمانەوە کەلەئێوە بەهیچ شێوەیەك داوای حساب ناکەم، تەنها لەو کوڕوڕە داوای ڕێکخستن و ناوی باش، بەرەو پێشەوە چوونی کاروبارم دەوێ، ئێمەی پیرەمێرد هەردووکمان بەهۆی ئەو متمانەو غیرەتەی لەئێوەوە بەدیمان کرد، نزیکەی دوو سەعات کوڵ کوڵ گریاین، جا نازانم گریەی شادی بوو یان گریەی ڕۆژانی ڕابوردو، بەیەکمان دەوت دەبێ خەریکی کارکردن بین. بەو شێوە بەکورتی وەڵامم دایەوە، وەڵامی (ناصر الملك) بۆمن بەمجۆرە بوو کەبوونی موبارەکی بەلەشکرەوە تەشریف بهێننە بروجەرد، کارێکی باشە، چونکە ناوەندی هەرسێ ویلایەتی عەرەبستان و لوڕستان و کرماشانەو هەر ئەو ناوە موبارەکە، ڕێکخستنی تەواو بەگوێرەی سەلیقەی و موبارەکی بەدەست دەهێنێتەوە لەڕووی هەرزانی و زۆرو زەبەندی دانەوێڵە..
بەهۆی گەیشتنی تیپەکانی عیراق و والی و ئەو کەل وپەل و جبەخانەو تۆپ و تفەنگە بارکراوانەوە، لەگەڵ گەیشتنی تیپەکانی عاشقلودا، ئومێد دەکەم پێویست بەزەحمەتی بوونی موبارەك و جموجۆڵی لەشکری موبارەکی کرماشان نەکاو پیر غولام خزمەتەکانی بەگوێرەی مەیلی موبارەك ئەنجام بدا. بەڵام پیر غولام هەموو کاتێ ڕایگەیاندووە کەکەژاوەی موبارەکی تەشریف هەر دەهێنن و سەرگەرمی ئاوەدانکردنەوەی بینایەکان و قەسری شیرین و زەهاب دەبم، کەبەپێویستی دەزانم. ئەو مەسەلەیە خاڵێکی گرنگەو لەسایەی ئەو متمانەیەی بەبەندە هەتانە، ئومێدەوارم یەك عانەش بەفیڕۆ نەڕوا (لەو سەروبەندەدا خوا ڕەحم بکا، ئەو پیاوە بەڕێزە چ خۆی و چ حسێن خان (حسام الملك)ـ ی ئامۆزای، بەحەق لەوەی گومان دەکەم و دەنووسم، باشتر خزمەتیان کرد، بێ نیازی و بێ تەماحی خۆیان نواندو ناوچاکی یان بۆ دین و حکومەت بەدەستهێنا. خوا نمەکی باوباپیرانی من بۆ باوباپیرانی ئەو

نمەکی باوکم بۆ ئەو حەڵاڵ بکا)-بەڵام چ سەفەرێکم بینیو چ زەحمەتێکم کێشا، لەو سەفەرەدا خوایە کافر نەیبینێو موسڵمان نەیبیستێ. لەماوەی ئەو ٤ مانگەدا، ڕۆژێکیان کەلەبەیانییەوە تاکو ئێوارەو لەئێوارەوە تاکو دەمەو بەیان باس لەخوێندنو نووسینو ناردنی فلانە نۆکەرو گەڕانەوەی فیسان نۆکەر بۆ کرماشانو جەنگەکانی کرماشانو نووسراوەکانی کرماشانو گفتوگۆی کرماشان لەگەڵ تاران، یان لەگەڵ خودی کرماشان بەولاوە شتێکی تر نەبوو. خودی خۆم لەوانەیە ٣٠ جار چوبێتمە تەلەگرافخانەکەو لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەتو بوونی موبارەکی وەلی نیعمەتمو (ناصر الملك)و (حسام الملك)و والی ئەبو قەدارەدا قسەم کردبێ. ١٠ جار بڕیارمدا خۆم بڕۆم، یەك دووجار حاجی حەسەن (وکیل الدوله)ی ئینگلیز لەکرماشانەوە بۆ بروجەردو لەبروجەردەوە بۆ کرماشان ڕۆیشت میرزا حەسەن عەلیخان کە گەنجێکی ڕەوشت بەرزە هەر لەهاتووچۆدابوو. سەرەنجام بەخواستی خوا سەرجەم مەرامەکانم هاتنە دییو ڕەزا قولی خانو داودخانی کەلهورو، فەرامورز سوڵتانو حسێن عەلی سوڵتان سەر بەهۆزی گۆرانو عەزیز خانی باجەلان لەهۆزی باجەلان بەخۆیو سێکەس لەکەسوکارییو عەلی مورادخانی کرندی دەسگیرکران. سەید ڕۆستەم کەوەك خوای کوردەکانە، نەوەی سەید بەرکەیەو سەرجەم هۆزە کوردەکانی کرماشان (علی اللهی)نو خودی سەید بەرەکەو نەوەکانی بەڕواڵەتی عەلی دادەنێنو دەڵێن عەلی لەو کەسانەدا حلولی کردووە، وەك بابییەکانو دەهرییەکان. تەنها باوەڕیشیان وایە کە هەرکەسێ ئیمان بەسەید بەرەکەو نەوەکانی بهێنێ، ئەوا لەسەرووی هەموو

پەرستنێکەیەوەیەو هیچ بەندەگیو پەرستنێکی تری پێویست نییەو ئەم شیعرەیان بەردەوام دەوتەوە:

بارها گفته ام به خلوت دل　　　علـــی الله وغیره باطل

در مذهب عارفان اگـــــاه　　　الله علی و علی است الله

از سر درون جمله اگاه علی است　گردش ده این بلند خرگاه علی است

جــــز وی نبود یلد ولم یولــد　　تفسیر کـــــلام قل هو الله علی است

ئەمە وێردی شەوانە ڕۆژیانە، نیازی خوّدان بەبنەماڵەی سەید بەرەکەو ئەم وێردی شەوو ڕۆژیانە، ئیتر کەس پێویستی بەهیچ پەرستن و تاعەتێ ناکا.

از چلیم و چرس و چنگال و چلو　چون بحق واصل شدی آسوده شود

ئاغا سەید ڕۆستەم حەیدەری بووبووە نیگەرانیی گەورەی ئێمە، تا سەرەنجام (حسام الملك) کەوتە شەڕکردن لەدژیو بەزەبری توّپ لە ماڵو خانەقای خوّی دەری پەڕاندو بەرەوناوچە عەرەب نشینەکانی عێراق ڕاوی نا.

جەهانمیرو فەقێ قادرو کەریم بەهلول و سەلیم ئەحوەل کە لە سەرانی هەمەوەند بوون، لەگەڵ ٦٠٠ سواری حسێن قولی خان بەهوّی والی ئەبو قەدارە، دڵنیای کردبوونەوەو لەگەڵ خوّیدا هێنابوونی بوّ لای من لەبروجەرد و هەر هەموویان بەزنجیر بەسترابوونەوە. پاشان جگە لەجەهانمیرو لایەنگرەکانی، ڕەزا قولی خانی کەلهور ئازاد کرا، بەڵام فەرمانی پێدرا لەئەسفەهاندا بمێنێتەوە. عەلی مرادخانی کرندی بووە پیاوی حکومەت و کرا بەسەروّکی تیپی کرند. داودخان پاش ئەوەی پلەی ئێلبێگی گەری ئێلی کەلهوری پێ سپێردرا، ئازاد کراو گەڕایەوە ناو ئێلەکەی.

بەڵام فەرامورز سوڵتان لەبەرئەوەی سەرەڕۆیی زۆری کردبوو (؟!!) گوللە باران کرا (لەفەرهەنگی شازادەی قاجاردا، ملکەچ نەکردن بۆ ستەم و زۆرداری، واتە سەرەڕۆیی) حسێن عەلی سوڵتان بەزنجیرکراوی رەوانەی ئەسفەهان کرا. جەهانمیرو سەلیم ئەحوەل سپێردران بەمیرزا رەزاخان تا بریێنە ئەسفەهان و لەوێوە، لەگەڵ من ببرێنە تاران تا لەبەردەم هومایونی ئازاد بکرێن. لەبەرئەوەی بەڵێنم دابوو سوپاس بۆ خوا بەڵێنەکەی خۆم جێبەجێکرد، خەرجی شەوو رۆژی جەهانمیرو لایەنگرانی کە نزیکەی (٣٠٠) کەس دەبوون دابین کردو ئەوانیترم ئازاد کرد تا بچنەوە لای والی پشتکو. چوارسەد تومان خەرجیم بۆ دابین کردن، پاش ئەنجامدانی ئەو کارانەو مۆڵەت وەرگرتن لەباوکی تاجدارم، گەڕامەوە ئەسفەهان.

فەرید بەگی سەرتیپی عوسمانی سەردانی سەربازگەی (حسام الملك)ی لەکرماشان کرد، بەڵام لەبەرئەوەی من نەچووم بۆ کرماشان، لەبەر چەند هۆیەك بانگێشتم بۆ سەربازگەکەی خۆم نەکردو سەرەنجام فەرید بەگ پاش چەندێ مانەوە لەو سەربازگانە گەڕایەوە عیراقی عەرەبی (تاریخ مسعودی، ص ٢٩٦ - ٣٠٣).

ئەو راپۆرتەی (ظل السلطان) گەورەیی و فراوانی بزاڤە سیاسی و مەزهەبییەکەی سەید حەیدەری گۆران نیشان دەدا کە بەدان پێدانانی خۆی، بنچینەکەی ئاغا سەید رۆستەم گۆران بووەو سەرکردەو فەرماندەو رێبەری خەبات و جەنگەکان، لەدژی لەشکری حکومەت فەرامورز سوڵتان بوو و هەر لەو پێناوەشدا سەری خۆی بەخت کرد. پارەو پولی زۆرو زەبەندی (وکیل السفارە)ی حکومەتی ئینگلیز، لەدژی شۆرش و بۆ رکوتکردنی بزاڤەکە بەکارهێنرا، سوود لەهێزی مرۆیی چەندین تیپی جیاجیای ئەسفەهان، تاران، ئازەربایجان و لورستان کەژمارەیان دەگەیشتە ٢٠ هەزار

کەس وەرگیراو هەزار باری جبەخانەی تۆپ و تفەنگی نەمساوی و چوار هەزار تفەنگ و شەش عەرادە تۆپ بەکارهێنرا، جگە لەچوار تیپی عیراقی (ئەراکی)و والی بەدوو هەزار سوارو پیادەوەو هاتنی خودی (ظل السلطان) بۆ بروجەرد، کەبۆماوەی چوار مانگی تەواو لەسپێدەوە تا شێو، خەریکی پەیوەندیکردن و رێکخستنی کاروباری ناوەندی جەنگ و پشتیوانی بوو، بەرادەیەك ژیان لەو فەرمانڕەوایە قەدەغە کرا کەتەنانەت دوگمەکانی کراسەکەشی لەلایەن کەسانیترەوە دەبەستراو ناچار کرا لەنێوان تەلەگرافخانەو پۆستەکەیدا خەریکی هاتوچۆ بێ. چاودێریکردنی بارودۆخەکە لەلایەن ئەو مەئمورەی عوسمانییەوە وایکرد سێکوچکەی قاجار عوسمانی . ئینگلیز پێکەوە بکەونە سەرکوتکردنی بزاڤێك کەپەیڕەوەکانی هاووڵاتییانی شیعەو ئالحەقی کەلهورو سوننەی باجەلان و ئال حەقی گۆران و مەنشیی و کرندی بوون و سەیدێك رێبەری دەکردن کەجەزبەیەکی ئەوتۆی لەقسەو کردەوەکانیدا هەبوو، بەجۆرێ پەیڕەوکارەکانی جگە لەفەرمانی ئەو (ئاغا سەید رۆستەم حەیدەری گۆران) گوێیان لەقسەی هیچ حوکمڕانێکیتر نەدەگرت. کەواتە بەهێزبوونی ئاغا سەید بەمانای تەنگ پێ هەڵچنینی تاران، لەندەن و ئەستانبول بوو، بۆیە پێکەوەو بەهۆی پیلانێکی پڕ خەرج و سەرسامەوە، بزاڤەکە لەباربرا. شمشێرو چەکی ئاگرین، بەرامبەر بەچەکی پێشکەوتووی ئەو رۆژەی وەك تۆپ، سەربازی موچەخۆری تیپەکان و فەرماندەی کەشوفش کەرو خاوەن نازناوی زل زل، بەرامبەر بەژمارەیەك گیان لەسەردەست کەخۆراکیان بریتیبوو لەبەرووی رووت و هیچ موچەیەکیان جگە لەنەفسی حەققانی نەبوو، رووبەڕووی یەك بووبوونەوە.

لێکۆڵینەوەی لایەنە جیاجیاکانی ئەو راپەرینە سیاسیو مەزهەبییەو ئاسەوارە کۆمەڵایەتییەکانی، کەپەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ مێژووی ئەو هۆزانەدا (کەلهور، باجەلانو گۆران بەگشتی) و ئێلی گۆران بەتایبەتیدا هەبوو، رەهەندە فراوانو قووڵە مێژوویيو مەزهەبییەکەی راپەڕینەکەی دەردەکەوێ. جەزبەو کاریگەریی کۆمەڵایەتی راپەرینەکەو عەیشقو ئیرادەو ئازایەتی فەرامورز سوڵتان، بەرادەیەك بوو، کەکاتێ دەسگیرکرا، مانگرتووانو گەنجە دەنگە خۆشەکانی شاری کرماشان، لەکوچەو کۆڵانەکانداو بەئاوازی دێرینەی خۆماڵی (لاوە لاوە)و بەو شێوەی (قەتار)، کەلەدوا رۆژگارەکانی زەندیو بەهۆی ئازایەتیو مەرگی لوتفعەلی خانی زەند لەلایەن دایکیەوە (مادەرشاهی) کەوتبووە سەر زمان، موناجاتیان دەکردو بۆ رزگاری فەرامورز سوڵتانی سەر سپەردەو فەرماندەی گیان لەسەر دەستی ئاغا سەید رۆستەم حەیدەری گۆران دەپاڕانەوە. ئەمەی خوارەوە یەکێکە لەبەیە یادگارەکانی ئەو رۆژگارە:

یاامام رضا شاگە خراسان     برسو فریای فرامرز سلطان

ئەی ئیمام رەزا شای خۆراسان     بگەرە فریای فەرامەرز سوڵتان

دواتر ئەو ئاوازە بەسرودی فەرامورز سوڵتان ناوبانگی دەرکردو، تا ئەم دواییەش لەلایەن گەنجە دەنگخۆشەکانی کرماشانەوە، لەمەیدانو بازارەکانی شاردا دەوترایەوەو جەنگاوەرانو تفەنگچییەکانی (جاف گۆران) لەپرسەی فەرامورزدا (بەگۆرانی)و لەسەر ئاوازی کۆنی خەزانی، چەند بەیتێکیان لەکۆچی نەمرانەی فەرامورز سوڵتان هۆنیبووەوەو پێیان دەوت

دیلانە (Dilane)، واتە دیلێتی (دیل لەکوردی سۆرانیدا مانای زیندانی دەگەیەنێ).

گریانە ئاڵۆزەکانی (ناصر الملك)و (حسام الملك)و باوەڕنەکردنیان، بەڵگەی رەشبینییان بوو لەتێکشاندنی راپەڕینەکە، بەڵام مانەوەی (ظل السلطان) لەناوچەکە، تا دوا ساتەکانی ئۆپراسیۆنەکان و سەرکوتکردنی یەکجارەکی راپەڕینە سیاسیی و مەزهەبییەکەی ئاغا سەید رۆستەم حەیدەری گۆران، ئەو رەشبینییەی گۆڕی بۆ باوەڕو پێکەنین و سەفەری (ظل السلطان) لەلای رۆژاواوە. خاڵێکی گرنگی تر، بریتییە لەوەی کەبۆچی لەبری کرماشان، (ظل السلطان) لە بروجەرد جێگیر بوو.. و ئەو ٥٠٠ هەزار تمەنەی لەکوێوە دابین کرا؟ ئەو ماوەیەی راپەڕینی عەلەوییەکان (ئال حەق) کە (ظل السلطان) بەدرۆ هەڵبەستراوەکانی خۆیو ئاراستەکردنی کەسانیتر، بەبابییەوە لێکی چواندبوو (!؟) و دەیویست بەبزاڤێکی خورافیو دژ بەئایین و رای گشتی کۆمەڵ نیشانیبدا، بزاڤێکی بەبیروباوەڕ بوو کەلەلایەن یەکەیەکەی ئێلەکانەوە گیان لەپێناویدا بەخت دەکراو بزاڤێکی تێکەڵ لەشیعەو سوننەو ئال حەقە بوو (بزاڤەکە لەسەر بنەمای خواناسین و باوەڕ بەموقەدەسە مەزهەبییەکانی خەڵکی سنوورەکە دارێژرابوو، بەڵام دژی چەوساندنەوەو داگیرکەران و بێگانە پەرستی بوو، بۆیە رووی راستەقینەی بزاڤەکە لەگەڵ درۆ هەڵبەستراوەکانی (ظل السلطان) یەکی نەدەگرتەوە.

تەرمی فەلامورز سوڵتان وەك قارەمانێکی مێژوویی و خۆشەویستی خەڵك، لەلایەن لایەنگرانی بزاڤەکەوە، لەئیسفەهانەوە هێنرایەوە کرماشان و لەناوەندی خانەقای (بوقعەی) حەزرەتی سوڵتان سەید ئەحمەد عەلەوی

بەرزنجی (بابا یادگار)ی شەهیدی خەباتی سەردەمی تەیموری ڕاپەڕینی عەلەوییەکانی زاگرۆسدا بەخاك سپێردرا. لەسەردەمی مەشروتەدا، کەسەردەمی پێداچوونەوەی کردەوەکانی سەرانیقاجار بوو، ڕاپەڕینە سەرکوتکراوەکانی گەل، دووبارە ئاشکرابوونو کەوتنەوە سەر زمان، ڕۆژنامەی (صور اسرافیل) لەژمارەکانی ٧و٨ی ڕۆژی ٢١ی جەمادی ئاخری ١٣٢٥ی کۆچیدا، بەتوندی سەرکوتکردنی بزاڤی ئاغا سەید حەیدەری گۆرانی مەحکوم کردو نووسی کەبەیاخی لەقەڵەمدانی بزاڤەکەو سەرکوتکردنی نەخشەی ئینگلیزەکان بوو. هەروەها ڕۆژنامەکە بەباشی ناوی قارەمانەکانی بزاڤەکەی برد. (بڕوانە: ڕۆژنامەی صور اسرافیل شماره ٨.٧ ص٣) (محمد علی سلطانی، ایلات وطوایف کرماشان، ج ، ص ٣٩٢ . ٣٩٧). لەدرێژەی ڕێگای ئەو ڕاپەرینەدا، لەشەهریوەری ١٣٢٠دا لەژێر کاریگەریی سیاسەتی ئیستیعماری بەریتانیاو لەسایەی یەکە سەربازیەکانی ئینگلیزدا، جێنشینی تەکیەی ئاغا سەید ڕۆستەم حەیدەری گۆران، ئاغا سەید (شمس الدین)، کەپێشینەیەکی هەبوو لەدژایەتیکردنی ئیستیعمارو بەشداری چەندین ڕاپەڕینو پەیامی باتنی کردبوو، بەفەرمانی ئینگلیزەکان بۆ تاران دوورخرایەوەو ماوەیەکی زۆر کەوتە ژێر چاودێریو زیندانو ئازارەوە.

## راپەڕینی سەید محەمەد کلار دەشتی
## (موشەعشیعی، ئاتەش بەگی) لەساڵی ١٣٠٩ کۆچیدا

خولی ناسری (١٢٦٤. ١٣١٣کۆچی) بەیەکێ لەناسکترین ماوە مێژوویی و سەرنج راکێشەکان لەڕووی فرەیی بزاڤە ئازادی بەخشە سیاسی و مەزهەبییەکانەوە دادەنرێ، بەتایبەتی بزاڤە عەلەوییەکان راپەڕینی عەلەوییە توندڕەوەکان لەو ماوەیەدا، بەدوای ئەو بێدەنگی و خامۆشییەدا هات کەسەردەمی ناجێگیرو زوو بەسەرچووی ئەفشاری (١١٤٨. ١١٦٣کۆچی)و زەندی (١١٦٣. ١١٩٣) پێداتێپەڕی، لەگەڵ هاتن و گەرمبوونی بازاڕی سەرانی سۆفیگەریدا لەدوا دوایی سەردەمی زەندی و سەردەمی سوڵتان ئاغا محەمەدخان و فەتحعەلی شادا، کەرووبەرووی بەرهەڵستی توندی زانا و موجتەهیدەکان بوون و بەهۆی ئەو نارەزایی و بەرهەڵستکارییانەی خەڵکەوە کەبەپاڵپشتی زانا و روحانییەکان ئەنجام دران، زۆربەی سەرکردە سۆفییەکان گیانی خۆیان لەدەستدا، بەڵام خاڵی گرنگ و جێ بایەخ ئەمەیە کە راپەڕینە یەك لەدوای یەکەکانی عەلەوییە توندڕەوەکان، بەدرێژایی هەزار ساڵی تەمەنی خۆی، نەك تەنیا لەلایەن زانا و موجتەهیدە هاوچەرخەکانی خۆیانەوە، دژایەتی نەکران، بەڵکو لەلایەن ئەو گەورە پیاوانەوە بەچاوی ئاشتیخوازانەوە تەماشا کراون، لەراستیدا وەك لەبڕگە مێژووییە جیاجیاکاندا راست کراوەتەوەو دەستپێکردنی سەفەوی نموونەیەکی بەرجەستەو ئاشکرای ئەو راستییە بوو، راپەڕینی عەلەوییە توندڕەوەکان بەبازووی سیستمێکی شیعەی میانڕەو لەقەڵەم دەدرێ، کەخۆی بەملکەچی زەمینە خۆشکردن بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی جێگرانی ئیمام مەهدی

دەزانیّ و لەو سۆنگەیەوە، لەهیچ بڕگەیەکدا دوچاری لێپێچانەوەو هەڵکوتانەسەر نەدەبوونەوە.

هەلومەرجی کۆمەڵایەتی سەردەمی ناسری (١٢٦٤. ١٣١٣کۆچی) بەتایبەتی پاش مردنی ئەمیر کەبیر، کەهاوکات بوو لەگەڵ راپەڕین و شەهیدبوونی تەیموردا، بەیەکێ لەقەیراناویترین بڕگە مێژووییەکان. لەڕووی گەندەڵیی کۆمەڵایەتی، ستەمکردن لەهاووڵاتییان و توێژی زەحمەتکێش، بێ سەروبەری کاروباری ئیداری و وڵات و لەشکردا، رەواج پەیداکردنی شێوەی رەوشتە ناپەسەندەکانی سەردەمی مەغۆڵ و فراوانتربوونی حەرەمسەراکان و دیاردەی بەرزبوونەوەی پلەی منداڵە غولامەکانی دەربار لەچاوتروکانێکدا دادەنرێ کەیاداشتە بەپێزەکانی (اعتماد السلطنة)ئاوێنەی سەراپاگیری رەهەندە جیاجیاکانی ئەو ماوە مێژووییە ترسناکەیە. لەو ماوەیەدا دوو راپەڕینی بەناوبانگ لەهەناوی نەقشبەندییەکانی کوردستان و پاشماوەی پەیڕەوانی ئەهلی حەق سەریان هەڵداو گەیشتنە لوتکە.

بەلەبەرچاو گرتنی ئەو هەلومەرجەی باڵی بەسەر دامێنی کێوەکانی زاگرۆس، لەدەساڵی یەکەمی سەدەی چواردەی کۆچیدا، کێشابوو، سەرکردەکانی ئاتەش بەگی (موشەعشیعی، نووربەخشی) بنکەی جموجۆڵەکانی خۆیان گواستەوە بۆ دامێنی کێوەکانی ئەلبورز، لەسایەی بوونی ئەو ناوەندانەی لەقەزوین و تاران و دەوروبەردا هەیانبوو، هەروەها لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی یەکالاکەرەوەمامەڵە لەگەڵ راپەڕینی سەید محەمەد کلاردەشتیدا نەدەکرا، واگومان دەکرا کەپەرەسەندنی راپەڕینەکە بەدڵنیاییەوە کۆتایی بەستەم و تۆقاندنی باوی سەردەمی ناسری بهێنێت.

راپەڕینەکـەی سـەید محەمـەد کلاردەشـتی، وەك بزاڤـەکانی پێشـترو بەهـەمان شـێوە رەفتـاری نووسـەرەکانی دەربـارو وابەسـتە، لەلایـەن مێژوونوسـەکانی قاجـار، لـەژێر ناونیشـانی جیاجیـادا، راسـتییەکان شێوێندران و ئـاوەژوو کرانـەوە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لـەناو راپـۆرت و بیرەوەرییـە جێماوەکـاندا، راسـتی و روونـی رووداوەکـان بـەدی دەکـرێ، بەتایبەتی لەیاداشتەکانی ئیعتیماد سەڵتەنەدا کە بەبەڵگەنامەیەکی (أعتماد السلطنة)دا سەلمێندراو دادەنرێ.

سـەید محەمـەد ئاتـەش بـەگی (موشەعشـیعی، نووربەخشـی) ناسـراو بەسـەید محەمـەد بـاقرو مـیرزا سـەید محەمـەد کلاردەشـتی، یەکێکـە لەسەیدەکانی بنەماڵەی ئاتەش بەگی و لەگەڵ سەید حەسەن ئاتەش بەگیدا، دوانەن، کەلەناو موریدەکاندا بەسەید حەسەن خودا ناوبانگی دەرکردبوو، بەپێی ئەو قسانەی میرزا حەیدەر عەلی نووسەرو رەشنووسی (دار التألیف) کە لەراپۆرتی یەکێ لەگەورە پیاوانی کوردی خواجەوەندەوە وەریگرتووە، سەید محەمەد پڕوپاگەندە کەرو بانگێشتکەری خودی سەید حەسەن دایی بووە، عەلەوییـەکانی خواجـەوەند موریـدی بنەماڵـەی ئاتـەش بـەگی بـوون لەباکووری ئـێران و ناوچـەی کلاردەشـتدا، هـەروەها ساڵی ١٣٠٠کۆچی ، لەگـەڵ هاتنی سـەید حەسـەن بۆ ناوچەکە، خەڵکەکـە بەیعـەتیان داوەتـێ و بـەگوێرەی رێ و رەسمـی عەلەوییـەکان، بـوون بـەفیدایی و چوونەتـە ژێـر فـەرمانی ئـەوەوە، پاشـان سـەید حەسـەن لـەدرێژەی پڕوپاگـەندە کـردن و ئیرشـادی خۆیـدا، چووەتـە تـەوریزو شـێروان، وادیـارە بەهـەمان رێـڕەوی حـەیدەرو جونـەویدو شائیسـماعیلی سـەفەویدا رەتبـووە لەسـەر رێـی خۆیئیدیعـای دەرکـەوتنی کـردووەو بـەدرێژایی رێـڕەوی خـۆی تادەگاتـە

روسیای قەیسەری لەهەر شوێنەو ژمارەیەك پەیڕوەی پەیدا کردووەو سەرەنجام لەناو روسیای قەیسەری‌دا گرفتار بووە، یان بە ڕیوایەتێکی تر مردووە، ساڵی ۱۳۰۸کۆچی میرزا سەید محەمەد ئاتەش بەگی کە لەگەڵ سەید حەسەندا دوانەن یارو هاوڕێی‌و سەرسپاردەو پڕوپاگەندەکەری بوو، لەناو هاوڕێکانی سەید حەسەندا، لەگەڵ دوو کەسی تر گەڕایەوە بۆ ناوچەی کلاردەشت‌و لەلایەن پەیڕەوانی کلاردەشت‌و رودبارەك‌و ئەوانی ترەوە پێشوازی کران. سەید محەمەد لەلایەن سەید حەسەنەوە کە پاش دەرکەوتنی (شا حەسەن) گوایە داوای جێگری کردووە {داوای شامحەمەد بەگ‌و حەسەن خەلیفە} کردەوەو وهەڵ‌و دەربڕینەکانی سەید محەمەد لەو قۆناغەدا هاوشان‌و هەمان وتەو جەختکردنی سەید محەمەد موشەعشیعی لەسەر پەیڕەوکارانی لەسەرەتای بزاڤی موشەعشیعییەکان بوو. (قیام ونهضت علویان زاگرس، ج۱، ص۱۵۹) سەید محەمەد کلاردەشتی بەپەیڕەوانی خۆی‌دەگووت: (..کە شاحەسەن منی مەئمور کردەوە تائێوە بانگێشت بکەم بۆ دەرکەوتنی ئەم نزیکانەی حەزرەت‌و شاحەسەن جێگری حەزرەتە، دەبێ ماڵ‌و پاشماوەو شتی تر (کەلوپەلی دنیایی) هەموو بفرۆشن‌و ئەسپ بکڕن‌و شمشێر بگرنە دەست، خۆتان بۆ ئەو جەنگەی (صاحب الزمان) ئامادە بکەن‌و لەریزی پیرۆزی ئیمامی عەسردا بەشداری جەنگ بکەن، پەیڕەوان گوێ رایەڵییان کردو وەك موشەعشیعییەکانی سەرەتا، هەموو کەلوپەلێکیان فرۆشت‌و ئەسپ‌و شمشێریان کڕی، خۆیان ئامادەکردو هەموو بەرهەڵستکارییەکیان بەشمشێر وەڵام دەدایەوە، رۆژ لەدوای رۆژ ژمارەی لایەنگرانی سەید محەمەد زیادی دەکردو زەمینەی راپەڕین لە بارتر دەبوو، لەبارەگای سەید محەمەددا وەك بنکەیەکی سەربازی، چەك

باروبنەو ئەسپ و کەلوپەلی جەنگی، لەهەموو کەلوپەلێکی تر زیاتر بەرچاو دەکەوت. گیان لەسەردەستەکانیش چاوەڕوانی زستان و گەمارۆدانی حکومەتیان لەکلاردەشتەوە تائەسترئاباد دەکرد.

سوبحانقولی خانی برای ساحب سوڵتانی خواجە وەندی هاوسەری ناسرەدین شا، فەرمانڕەوایی ناوچەکەی دەکرد، پاش ئەوەی زانیاری دەربارەی پێگەیشتن و بەلوتکە گەیشتنی بزاڤەکەی سەید محەمەد کلاردەشتی پەیداکرد، بۆ لەنزیکەوە ئاگاداربوون لەچۆنیەتی مەسەلەکە، لەگەڵ ژمارەیەك لەدۆستاندا لەئەستراباەوە بەرەو کلاردەشت کەوتەڕێ و بەپێی خۆی بەرەو مەرگ چوو، لەگەڵ گەیشتنی بۆ (حەسەن کیف) گەمارۆدرا، لەوانەیە بۆ سەنگەرگرتن بوو بێ، خۆی دەخزێنێتە ناو خانوویەکەوە پەیڕەوانی بزاڤی موشەعشیعیش، ئاگر لەخانوەکە بەردەدەن، سوبحانقولی لەترسی گیانی خۆی هاتەدەرەوە تاهەڵبێت، بەڵام تەقەی لێکراو بریندارکرا، پاش دەسگیرکردنی خۆی و دوو ئامۆزای، پارچە پارچە کران و لەناو ئاگردا سوتێنران، گەیشتن و مردنی سوبحانقولی چوار سەعاتی خایاند، ئینجا پەیڕەوان روویان لەعەشایەری ناوچەکە، ئەوانەی پەیوەندییان پێوە نەکردبوون، کرد. نیعمەتوڵڵاخانی سەرتیپی خواجەوەند پاش کوژرانی فەرمانڕەوای ناوچەکە هەستی بەمەترسی بارودۆخەکە کرد و پەیامنێرێکی بەپەلە رەوانەی تاران کرد و درێژەی پێشهاتەکەی بە (أمین السلطان)و (صاحب جمع) راگەیاند، لەو سەرو بەندەدا (ساعد الدولە) بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینەکە دەستنیشان کرا.

(ساعد الدولە) سوودی لەدوژمنایەتی دێرینەی نێوان هەردو توێژی چبەرو خانەخوێی ناوچەکە وەرگرت، کەلەسەرەتای سەردەمی قاجاریدا

خواجەوەندییەکانیان لەشیرازەوە بۆ باکوور راگواستبوو ئەو دوژمنایەتییە دروست بوو بوو، وەرگرت. ئەوخێڵانە کەلەلایەن کوردە راگوێزراوەکانەوە چەندین جار سەرکوت کرابوون، بیریان لەتۆڵەکردنەوە کردەوە، (ساعد الدولە) کاتێ گەیشتە مەرزن ئاباد، بەناردنی پەیامنێرێك داوای ئامادەبوونی سەید محەمەدی کرد، بەڵام سەید داواکەی پشت گوێ خستو لەبەرامبەردا کەوتە ئامۆژگاری کردنو هاندانی موریدەکانو سەید محەمەد موشەعشیعی دووپاتی کردەوە کەچەكو کەلوپەلی جەنگی کاریگەریی نابێ لەسەرتان (تۆپو تۆپخانە کاریگەریی نابێ لەسەرتان، دڵتان هیچ نەکاو ئاسوودەبن ئەو لەشکرو جبەخانەیەی لەتارانەوە هاتووە، دەبێتە مێشولە لەبەرچاوی ئێوە، لەگەڵ سپێدە هێزەکانی هەردوولا رووبەرووی یەکتربوونەوە، سەید محەمەد دوو ئاڵای بەرزکردبۆوە، یەکێکیان سەوزو ئەوی تریان سوور، لەسپێدەوە تاخۆراوا جەنگ گەرم بوو، لەنێوان هەردوولاداو سەید خۆی جلو بەرگی جەنگی لەبەرکردبوو، شمشێرێکی بەستبوو و بەتفەنگێکەوە پێشی تاقمەکانیگرتبوو.. سەرەنجام لەگەڵ رۆژاوابووندا هێزەکەی سەید تێکشکاو خۆیشی دەسگیرکرا. بەگوێرەی گێڕانەوەکان، ژمارەی فیداییە کوژراوەکانی سەید محەمەد کلاردەشتی لەنێوان ٥٠٠-٢٠٠٠ کەس مەزەندە کراون.

(ساعد الدولە)و دەستو پێوەندەکانی بەهەمان شێوەی سەدەکانی ناوەڕاست مامەڵەیان لەگەڵ راپەڕیوەکان کردو لەترسی دووبارە هەڵگیرساندنەوەی راپەڕین، تا سێ مانگ ناوچەکەیان خستە ژێر چاودێرییەوە. کوڕانی (ساعد الدولە)ش بەردەوام خەڵکی ناوچەکەیان ئازار دەداو لەهەر شوێنێك فیدایی یان کەسێکی سەر بەخێڵی خواجەوەندیان

ببینیایە، بێ لێپرسینەوە دەیانبەستە دارێکەوەو گوللەبارانیان دەکرد، تەنانەت ژمارەیەکیان بەزیندوویی‌و بەدەست‌و پێ بەستراوی زیندە بەچاڵ کران. چەندین گوندی خواجەوەندەکان، ئەوانەی لەلێواری دەریا مابوونەوە، تالان کردو دانیشتوانەکانیان بەدیل گرت. کاتێ (انتظام الدولە) بووە فەرمانڕەوای مازندەران، لەبەرئەوەی زانی ئاوێکی خراپیان ڕشتووە، کەوتە چاککردنی میانەی خواجەوەندو خێڵەکە، چونکە بەهۆی سەرکوتکردن‌و گوشارەوە بڕستیان لەخواجەوەندەکان بڕیبوو، کەچی هێشتا ترسی ئەوەیان هەبوو، ڕاستەوخۆ پاش دەرچوونیان لەناوچەکە، دەست‌و پێوەندەکانی حکومەت بەدەست خواجەوەندەکان سزا بدرێن‌و تۆڵەیان لێ بکرێتەوە. بەڵام دواجار ئاشتی سەقامگیر بوو. دەتوانرێ ئاستی توندی سەرکوتکردنی خواجەوەندەکان لەم بەیتەی خوارەوە بزانرێ.

چنان کار ممالك خوردە برهم　　　کەزالی کردە پیدا زور رستم

واتە:

کاروباری ناوچەکە بەجۆرێ شێواوە کە زاڵمی ڕۆستەم زەواڵی لێپەیدابووە (از استاراتا رستاباد، ج٣، ص ٥١٠-٥٠٤)

(اعتماد السلطنة) لەیاداشتەکانی خۆیدا بەمجۆرە باسی ناردنی لەشکری حکومەت‌و دابینکردنی خەرجی‌و کەلوپەل‌و گەڕانەوەی لەشکرو سەید محەمەد کلاردەشتی بۆ تاران‌و کاردانەوەو کاریگەریی کۆمەڵایەتییانەی دەستگیرکردنی سەید، کەنیشانەی بێزاریی خەڵك لەسەرکەوتنی لەشکری حکومەت بوو، دەکات.

یەکشەممە ٢٨ی ڕەبیعولئەوەلی ١٣٠٩ی کۆچی نووسیویەتی: (سپێدە چوومە پێش دەرگا، دەنگە دەنگ‌و قەڵەباڵغی بوو.. سەید محەمەد ناوێ

کەخەڵکی سەحنەی کرماشان و یەکێ لەمورشیدەکانی تایفەی عەلی اللهی بوو، چوو بووە کلاردەشت و کەوتبووە ئیرشاد کردن و دنەدانی خواجەوەندەکان و ژمارەیەکیانی لێ کردبووە پەیڕەوی خۆی. لەو سەروبەندەدا سەرتیپێکی خواجەوەندی، بەخۆی نۆکەس لەژن و کچ و برایەکی و دایکی کوشتبوو و دواتر سوتاندبوونی. کوژراوەکان برا، دایك و کەسانی (صاحب سلطانی) خواجەوەندیی ژنی شا بوون. (ساعد الدولە) تەنکابونی دەکرێتە بەرپرسی سەرکوتکردنی سەید، ئەویش بەسوارەو تیپی تایبەتەوە خۆی ئامادە دەکاو حکومەتیش بڕی شەش هەزار تمەن پارە بۆ خەرجیی هێزەکەی تەرخان دەکا{روزنامە خاطرات اعتماد السلطنة، ص٨٨٦} هەروەها یاداشتەکانی ڕۆژی چوارشەممە ٢٢ی رەبیعی دووەمی ١٣٠٩ بەمجۆرەیە: ئەو سەیدەی کەدەیانگوت یاخی بووە. هێزی حکومەت بەرەو کلاردەشت کەوتەڕێ و ئەمڕۆ چوونە ناو شارەکەوە. هێزەکە ڕێ و ڕەسمی باوو نیشاندانی تۆپخانەولێدانی تەپڵ. خانە لەگەڵ سەرجەم تیپەکانی تاران و قەزاق و مۆسیقا ژەن و ئەوانیتر پێشڕەوییان کردو سەیدیان هێنا بەعەمامەیەکی سەوزو زنجیر لەمل و بەدەست بەستراوی، وەکو چۆن حەزرەتی (سجاد)یان بۆ شام هێنا. تەواوی خەڵکی ناوچەکە دەگریان. من سەیرم لەوە دەهات کەسەیدێکی هەژار، خۆی بەزمانی خۆی بە(نائب السلطنة)و دواتر بەشای وتبوو کەمن هەموو ساڵێ بۆ کۆکردنەوەی پێویستی، سەردانی ئەوێ دەکەم و نەیاخیم و نەهیچ، کەچی ئەو هەموو هێزە کۆکراوەتەوە، ئەی ئەگەر یەکێ لەسەرکردەکانی وڵاتانی بیانی دەسگیر بکرابایە، چییان دەکرد. بەپێی قسەی سەربازەکانی (نائب [illegible]ة)، نزیکەی دوو هەزار ژن و پیاو، پیرو گەنج و منداڵ کوژران.

شەویٚ بانگ کرامە بەر دەرگاو شا وتی سەید پیاویٚکی سەیرە. بالاْبەرزو سپی پیٚستو ریشیٚکی دریٚژی سووری هەیە، بەلاْم زمان دریٚژو بویٚرە.. بەشای وتبوو: بۆ سەیدیٚکی هەژاری وەك من بۆچی کلار دەشتت ویٚران کردو دوو هەزار هاوولاْتی خۆت بەکوشتن دا؟ لەکاتیٚکدا ئەگەر یەك تاقە کەست بەدوامدا بناردایە، ئەوا خۆم دەهاتم. بەپەلە سەیدیان بردە زیندان، ئەو کاتەی بردیان شا وتبووی عەمامە سەوزەکەی سەری دابگرن، باعەمامەکەی بۆ زیندان نەبریٚ.

(روزنامه خاطرات اعتماد السلطنة، ص۸۹۰)

مەئمورە بیانییەکان بەزۆری دژی بزاڤە باوەڕداریو جەماوەرییەکان بوونو هەمیشە حەزیان بەوە دەکرد خەلْکی گیٚل بن، تاخۆیان خەریکی دزیو تالاْن کردنی سامانی نەتەوەییو شیٚواندنی بیروباوەڕی ئایینی کۆمەلْ بن.

لەو سۆنگەیەوە دکتۆر فۆریەی پزیشکی تایبەتی ناسرەدین شا، لەیاداشتەکانی خۆیدا کەگومانی لەمردنی سەیددا نەبوو بەچاویٚکی سووكو دوور لەڕاستی باس لەکەسایەتی سەید محەمەد دەکا کەدوورە لەڕاستگۆیی (اعتماد السلطنة)ەوە (سەسال در دربار ایران، ترجمه عباس اقبال اشیتانی، بەکوشش همایون شهیدی، ص ۳۲۳).

## بزاڤی حەقە لەکەرکوك

شەدەڵە گوندێکە لە ناوچەی سورداشی سەر بەپارێزگای سلێمانی لە کوردستانی عیراق. لەکۆتایی سالآنی ۱۹۲۰ (۱۳۳۸کۆچی مانگی) (۱۲۹۹کۆچی هەتاوی) لەو گوندە خنجیلانەیەدا، بزاڤی حەقە لەسەر دەستی شێخ عەبدولکەریم کوڕی حاجی شێخ مستەفای کوڕی حاجی شێخ رەزای عەسکەری بنیات نرا.

حاجی شێخ رەزای باپیرەی شێخ عەبدولکەریم خەڵکی گوندی عەسکەری ناوچەی ئاغجەلەر بوو، کە پێشتریش شێخ موسای بەرزنجی لێوە هەڵکەوتبوو. ئەم بنەماڵەیە لە سەیدە عەلەوییە بەرزنجی‌یەکانەو سولالەی سەیدییان دەگاتەوە شێخ عیسای بەرزنجی هەمەدانی باوکی سوڵتان سەید ئیسحاق عەلەوی بەرزنجی. حاجی شێخ موستەفای باوکی شێخ عەبدولکەریم لەجەنگی یەکەمی جیهاندا، بۆ روبەڕو بوونەوەی هێزەکانی ئینگلیز چوە باشووری عیراق و لەساڵی۱۲۲۳ی کۆچی لەبەغدا کۆچی دوای کردو لەگۆڕستانی شێخ مەعروف کەرخیدا بەخاك سپێردراو پاشان مەزارەکەی بۆ گۆڕستانی شێخ جونەیدی بەغدادی گواسترایەوە.

ئەم بنەماڵەیە تا کاتی دەست بەئیرشاد کردنی مەولانا خالد نەقشبەندی(۱۱۹۰-۱۲٤۲ی کۆچی)لەکوردستان، لەسەر تەریقەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، کە میراتی باوباپیرانی بوو، ئیرشادی دەکرد، بەلآم پاشان لەبەر ئەوەی کەوتە ژێر کاریگەریی ئیرشادی مەولانا خالد نەقشبەندییەوە، دەستی ئیرادەتی دەداتە دەستو لەسەر بنەمای تەریقەتی نەقشبەندی ئیرشادی کرد.

یەکەمین کەسایەتی ئەم بنەماڵەیە کە تەریقەتی نەقشبەندی هەڵبژارد، شێخ ئەحمەد سەردار بوو. شێخ ئەحمەد پەیوەندیی بە مەولانا خالد شارەزوری میکائیلی نەقشبەندی، نەوەی ناوداری پیر میکائیل دوانی و هاوچەرخ و هاودەم و یاری سوڵتان سەید ئیسحاق عەلەوی بەرزنجییەوە کرد، کە نوێکەرەوە و زیندوکەرەوەی تەریقەتی نەقشبەندی بوو لەکوردستان و میزوپۆتامیا و سوریا و وڵاتە ئیسلامیەکاندا. مامۆستا کەریم زەند دەڵێ کە مەولانا خالد ئەو کاتەی خەریکی ئیرشاد بوو هاتۆتە گوندی سەرگەڵو، کە شێخ ئەحمەدی تیادا دەژیاو شێخ قادری (سوور)ی بەخەلیفە هەڵبژاردوە و ئیزنی داوە. ئەویش شێخ ئەحمەدی بەجێگری خۆی هەڵبژاردوە (بڕوانە کەریم زەند، ئایین و باوەڕ لەکوردستان، سلێمانی، ١٩٧١، ل٨٥) بەڵام ئەو راپۆرتە دروست نییە، بەڵکو یەکەمین کەسێ لەناوچەی سورداش ئیزنی ئیرشادی لەمەولانا خالد وەرگرتبێ، شێخ ئەحمەد سەردار بووە و ئەو شێخ قادرەش، کوڕی شێخ ئەحمەد سەردارە، کە پاش مردنی باوکی دەستی بەئیرشادکردن کردوە. هەروەها شێخ ئەحمەد لەسلێمانی دەستی ئیرادەتی داوەتە مەولانا خالد، نەك لەکاتی سەردانەکەی مەولانا خالددا بۆ سەرگەڵو (بڕوانە مەلا عەبدولکریم مودەرس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم،ل ٨٨). بەڵام بۆچوونەکانی مامۆستا کەریم زەند دەربارەی سەفەری مەولانا خالد بۆ سەرگەڵو، لەنێوان پەیڕەوانی بزاڤی تازەی حەقەدا بڵاوە. ئەگەرچی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم مودەریس لەکتێبی (بنەماڵەی زانایان)دا ئاماژەی بۆ ئەو پێشهاتە نەکردوە، بەڵام لەچاوپێکەوتنێکی تایبەتدا وتویەتی کە مەولانا خالد کاتێ لەرێگای کۆیەوە بەرەو شام سەفەری کردوە، دور نییە لەسەر رێگای خۆی چوبێتە

سەرگەڵوو بوبێتە میوانی موریدەکانی. جگە لەوە شێخ حسێن خانەقا دەڵێ کە شێخ ئەحمەد سەردار بانگێشتی مەولانا خالدی بۆ سەرگەڵو کردوەو بەرێگای دۆڵی هەناراندا رۆیشتون و لەرێگا بەدڕك و داڵ، پێی مەولانا خالد بریندار بووە. کاتێك هەردووکیان دەگەنە ماڵەوە، شێخ ئەحمەد خوێنی برینی جێ دڕکەکانی مژیوە، ئەویش لەوانەیە لەبەر ترس لەژەهری دڕکەکان بوبێ یان بەهۆی باشەی ئەو کارەوە بوبێ کە لەنێوان مورادو موریدەکاندا باوبوە (ئەو گوزارشت کردنە سومبولی و عیرفانی یە، بیرمان بۆ چیرۆکەکەی مەعاویەو پێغەمبەر رادەکێشێ و دەگێڕنەوە کە (پێغەمبەر لەکاتی خۆ ئارایشت کردندا، تیغی دەلاکی یەکەی روشانێك دروست دەکاو مەعاویە خوێنی روشانەکە دەمژێ و..) هەر چۆنێ بێ لەهەمان سەفەردا، شێخ ئەحمەد سەردار قەسیدەیەکی بەفارسی هۆنیوەتەوە کە ئەمەی خوارەوە دوو بەیتی ئەو قەسیدەیەیە:

غلام خالد کردم، سگ صدیق و سەلمانم     کە جدم سید مرسل، چە پاك از کوە عصیانم
بە فقرو فاقە می‌نازم، بەیمن قاسم وجعفر     زمنسوبان طیفورم، غنی از شاە و سلطانم

واتە:

غوڵامی خالیدی کوردم، سەگی سدیق و سەلمانم کە باپیرەم پێغەمبەرو هیچ باکم نییە لەیاخی‌بوون، بەهەژاری و نەداری خۆم شانازی دەکەم، ەپیرۆزی جەعفەرو قاسم، سەر بەتەیفورم بێ‌نیازم لەشاو سوڵتان.

پاش مردنی شێخ ئەحمەد وەك باسکرا، شێخ قادری کوڕی لە ناوچەی سورداش دەستی کردە ئیرشادو رابەری کردنی خەڵکی ناوچەکە. واباس دەکرێ کە کاتی هاتنی مەولانا خالد بۆ ماڵی شێخ ئەحمەد، شێخ قادر کە ئەو کات منداڵ بووە، لەئامێز دەگرێ و دەڵێ ئەمە موریدی خۆمە، ئنجا

کلاوێکی درێژو عەبایەکی بەدیاری وەك موفەڕك بۆ دادەنێ کە نیشانەی خەلیفایەتی‌یە. پاش مردنی شێخ ئەحمەد سەردار، سەید تەها نەهری دێتە کەرکوك‌و ئەو دیارییەی مەولانا خالد، کەلای ئەو بووە، بۆ شێخ قادر دەهێنێ‌و بەنوێنەرایەتی ئەو مۆڵەتی ئیرشاد کردن لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی دەدا. شێخ قادر لەسەرە مەرگداو بەپێچەوانەی ڕەوشی باوی شێخەکانی ئەم دواییەوە، مۆڵەت بەحاجی شێخ ڕەزا عەسکەری باپیرە گەورەی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە دەدا تا ڕێنوێنی موریدەکان بکا. حاجی شێخ ڕەزاش شێخ محەمەد ئیللەڵلا دەکاتە جێگری خۆی. پاش ئەو حاجی شێخ مستەفا عەسکەریی کوڕی شێخ ڕەزا تا ساڵی١٩١٥(١٣٣٣ی کۆچی) کاری ئیرشادو تەبلیغ لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی ئەنجام دەداو پاش مردنی لەساڵی١٣٣٣ی کۆچی شێخ مەلا ئەحمەد گەڵنێری لەسەر وەسیەتی حاجی شێخ مستەفا کەوتە ئیرشاد کردن. بەڵام لەبەر ئەوەی لەساڵی١٣٣٨ی کۆچی=١٩٢٠ی زایینی. شێخ مەلا ئەحمەد مرد، پاش یەك ساڵ شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە کاری ئیرشادو تەبلیغ دەگرێتە ئەستۆو لایەنگرانێکی زۆر لەسورداش، مەرگە، میرزا ڕۆستەم، بەری کۆیە، ئاغجەلەر، شوان‌و .. هتد پەیدا دەکات.

بەدەستپێکردنی خەلیفایەتی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، بزاڤی حەقە، کە گەڕانەوەیەك بوو لەنەقشبەندی‌یەوە بۆ ڕێ‌و ڕەسمی عەلەوی‌یە توندڕەوەکان=(ئەهلی حەقە)=ئال حەق، لەسنوری ئیرشادی شێخ عەبدولکەریمدا دەستی پێکرد. ئەگەرچی ئەدمۆندز ئەو بزاڤە بۆ شێخ عارف سەرگەڵویی دەگەڕێنێتەوە کە لەخزمە نەسەبی‌و تەریقەتی‌یەکانی شێخ عەبدولکەریم بوو (بڕوانە: کرد، ترك، عرب، ترجمە جرجیس فتح اللە، بغداد، ١٩٧١، ص١٨٧).

بەڵام بزاڤەکە لەکاتی ڕێبەری و ئیرشادکردنی شێخ عەبدولکەریمدا و لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی دەستی پێکرد.

ساڵی لەدایك بوونی شێخ عەبدولکەریم بە تەواوەتی دیار نی‌یە، بەڵام بەهۆی بەڵگەو ئاسەوارە جێماوەکانەوە، مەزندە دەکرێ دەوروبەری ساڵی ۱۳۱۰ی کۆچی ۱۸۹۲-۱۸۹۳ ز لەدایك بووبێ. بەرواڵەت پیاوێکی گەنم ڕەنگ، بالا مام ناوەند، دەموچاو پان و دوو چاوی گەورەی بووە. هەروەها زانستخواز بووەو زانستە باوەکانی ئەو ڕۆژەی لەسەرف و نەحوو بەلاغەو تەفسیرو فیقە ئوسولْ خوێند بوو. ئیجازەی فتواو وانە وتنەوەی زانستە ئایینی‌یەکانی لە مەلاعەبدوڵڵا جەلی کۆیی وەرگرتبوو. هەرسێ زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی بەچاکی دەزانی و دەنووسی. دایکی ناوی ئامینە خانم کچی شێخ عەبدولسەلام قازی بوو. شێخ عەبدولکەریم دووجار بۆ حەج چووە، جاری یەکەمیان لە ساڵی ۱۳٤۰ی کۆچی جاری دووەمیان لە ساڵی ۱۳٤۹ی کۆچی. ئەم کەسایەتی‌یە زانستی و ئایینی‌یە، ساڵی ۱۳٦۱ی کۆچی لەشەدەڵە کۆچی دوای کردو هەر لەوێ بەخاك سپێردرا.

شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە یەکێکە لەکەسایەتی‌یە جێ باس و سەرنج و سەیرو ئازاکان، بەڵام بەهۆی دەمارگیریی قەڵەم بەدەستەکانی ئەوکاتەی عیراق و لەبەرئەوەی بە درێژایی تەمەنی شێخ عەبدولکەریم بزاڤە هاوچەرخ و گەڕانەوەکەی خۆی تێکەڵ بەپڕوپاگەندەی ئینگلیزو وڵاتە بیانیەکان نەکرد، بۆیە پلەی ئاینی و فیکری ئەم کەسایەتی‌یە بەتەمومژاوی و نادیاری مایەوە. هەروەها سەرەڕای لێدان و دووبەرەکی دروست کردن و هەڵکوتانە سەر، کەچی پەیڕەوانی شێخ عەبدولکەریم وەك تێکۆشەرەکانی تری

ڕێبازیعەلـەوی، لەوانـە سـەید ڕەزای دەرسـیمی لەکوردسـتانی تورکیـا، بەکوڵنەدەریو پتەوی مانەوە.

ئـەو وتانـەی شـێخ عەبدولکـەریم لەسـەرزەمینی زانسـتو ئـایینو دەمارگـیریو بـاوەڕ، لەکوردسـتاندا ڕایگـەیاند، بـۆ کـاتی خـۆی هیچـی لەوتەکەی (انا الحق)ی مەنسوری هەلاج کەمتر نەبوو. ئەگەر کەسێ ئاشنای بارودۆخی کۆمەڵایەتیو بیروباوەڕی ناوچەکە نەبێ، نازانێ کە ئامرازی ئەم سەلیقەو مەیلو باوەڕە لەو کاتو ماوە مێژوییەو لـەو سنورە جوگرافییـەدا، چەند بوێری پێویست بووە. هەروەها خاوەنی ئەو وتەیە چەند تانەو لۆمـەو ئازاری بەگیان کڕیوە، تا بتوانێ ئەندێشـەی فیکریو ئایینی خـۆی لـەپێناو بەرز ڕاگرتنـی ژیـانی شـەرەفمەندانە، گوزارشـت بکـاو بـرەوی پێبـدا، ئـەو پڕۆسـەیەش لەهـەناوی تەریقـەتێکدا ئـەنجام بـدا کـە لەسـەر تاسـەری کوردسـتاندا یـەك سـەرەموویەك نـاکۆکی شـەرعی لـەنێوان کەڵـە پیـاوە گەورەکانو موریدە گیان لەسەر دەستەکانیدا نەبینرا. ئەگەرچی ناولێنـانی بزاڤە نوێیەکـە بەڕواڵـەت وادیـارە لـەو زیکرکردنـە بەردەوامـەی پـەیڕەوانی بزاڤەکەوە هاتووە کە وشەی (حـەق)یان وتۆتـەوەو دووپاتیـان کردۆتـەوە، بـەڵام ئـەوەش بزانـین کـە وشـەی حەقـە زیکـری بـەردەوامی عەلەویـیـە توندڕەوەکان (ئەهلی حەقە)ئال حەق بووەو ئەم ناولێنانە هەروا بەسانایيو بەڕێکەوت هەڵنەبژێردراوە.

شـێخ حسـێن خانـەقا، کـە پیـاوێکی ئاگـادارو بەتەمـەنو هـاودەمو هاوچەرخی شێخ عەبدولکەریم بووە، دەربارەی سەرەتای بزاڤی حەقە دەڵێ: شێخەکانی حەقـە سـەرەتا وەك بنەماڵـە نەقشـبەندییەکانی تـرو بـەگوێرەی ڕەوشی باو، ئیرشادو سلوکیان دەکرد. بەڵام لـە کـاتی خەلیفایـەتی شێخ

عەبدولکەریمدا، وردە وردە لەناو موریدە پەیڕەوەکانی شەرعدا،کە پاش تەواو کردنی زانستی حەوزەو وەرگرتنی ئیجازە لەشوێن و ناوچە جیاجیاکانی کوردستانەوە دەهاتنە ریزی بزاڤەکەوە، قسەو(شطحات)* کردن دەستی پێکردو ژمارەیەك بەبیانووی ئەوەی کاتی دەرکەوتنی مەهدی نزیك بۆتەوەو زەمینەی دەرکەوتنی لەبارە، پاشان وردە وردە دەستیان بەتەرك کردنی حوکمە تاکرەوییەکان کردو پاشتر لەپلەی پێشکەتوتردا روویان لەکاروباری دنیایی وەرگێڕاو دەستیان لەکاروبار هەڵگرت. ئەو جۆرە کەسانە خاوەنی فیکرو باوەڕو فەلسەفەیەکی قولیش بوون. لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو بیروباوەڕەدا، ژمارەیەکی زۆری خەڵك، بەتایبەتی کەسانی سادە پەیوەندییان پێوە کردن و لەنێوان هاوولاتییانی ناوچەکەدا بە شێت ناودەبران، بەڵام ئەوانەی کە وەك جاران و لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی رەفتاریان دەکرد، بەگوێرەی رەوشی باو، (سۆفی)یان پێ دەوترا، خودی شێخ عەبدولکەریم بەو رەوتەو ئاشکرا کردنی رازی نەبوو، تەنانەت جارێکیان حەمەسوورکە یەکێ بووە لەموریدە سادەو توندڕەوەکانی شێخ عەبدولکەریم، لەبەرئەوەی لەبەردەمی شێخ دا دانی بەوەدا ناوە کە لەو باوەڕەدایە ئەحکامی شەریعەت بەسەرچووە، بە فەرمانی شێخ دارکاری کراوەو داوای لێکراوە لەقسەکەی خۆی پەشیمان بێتەوە، بەڵام حەمەسوور پێی لەسەر باوەڕو قسەکانی خۆی داگرتوە.

هەروەها شێخ حسێن خانەقا دەڵێ: ژمارەیەك زانای ئاینی ئەهلی تەسەوفیش هەبوون کە بەهەموو دڵێکەوە لەگەڵ بزاڤە نوێیەکەدا بوون، بەو

---

* شطحات: شطحیات: واتا بێشەرمی و بێحەیایی، بەڵام لە سۆفیزم دا واتە بەپێچەوانەی شەرعەوە قسەکردن یان چەند وشەیەك کە بەرواڵەت پێچەوانەی شەرع بێت، وەك وتەکەی (انا الحق)ی حسێن کوڕی مەنسوری هەلاج. (وەرگێر)

مەرجەی مەسەلە شەرعییەکانیش رەچاو بکرێن، کەچی لەترسی کاردانەوەی کۆمەڵایەتی و روبەروبوونەوەی خەڵکی، بیروباوەڕەکەی خۆیان دەشاردەوە.

شێخ حسێن خانەقا دەڵێ کە وردە وردە پڕوپاگەندەی شار بەدەرکردنی (حەقە) کەوتە سەر زمان. سەربەخۆیی و جیابوونەوەو بەرەسمی ناسینی بزاڤی حەقە، لەکاتی رێبەرێتی مامەرەزاو حەمەسووردا هاتە دی. لەبەرئەوەی مامەڕەزا برای شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە بوو، پەیڕەوەکانیشی وەك نەوەکانی شێخ عەبدولکەریم بە مامە بانگیان دەکرد. زاراوەی مامە جگە لە مانا رواڵەتی‌یەکەی و بە جێهێنانی پەیوەندیی گیانیو رۆحی، دیسانەوە مانای رێزو گەورەیش دەگەیەنێ، وەك زاراوەی باوە. ئەوەی لەقسەکانی شێخ حسێن خانەقاوە هەڵدەهێنجرێ ئەوەیە کە وەك چۆن تەسەوف لەبنەڕەتدا بریتی‌بووە لەبزاڤێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی لەدژی ستەمو زۆرداری، لەنێوان پەیڕەوانی حەقەشدا، ئەو بیروباوەڕەو بە لەبەرچاو گرتنی بارودۆخی ئەوسای کوردستان سەری هەڵدا (بێگومان ئەوە تەنها لایەنێکی مەسەلەکەیە)و لایەنەکەی تری ئەوەیە کە تەریقەتی نەقشبەندی بایەخێکی تایبەتی بە فیکرو ئەندێشە دەدا، بەڵام بەهۆی سادەیی و باوەڕەوە، هەروەها لەبەر بارودۆخی کاتو شوێن، پرۆژەی سیاسیی خۆیان بەمجۆرە گوزارشت لێکرد. دەرکەوتنی مەهدی کە جیهان پڕ لەدادپەروەری دەکا، نزیك بۆتەوە. کەس نازانێ ئایا لەرۆژانی رێبەرێتی کردنی مامە رەزاو حەمە سووردا، یان لەوانەیە لەسەردەمی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەشدا ئەو بیروباوەڕەش هەبووبێ کە داوای دەکرد، بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکان، واتا چەسپاندنی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و

سیاسی دەست لەبەدواداچوونی كاری مژدە بەخشی نەبینراو هەڵگیرێی و لەبری ئەوە، دەبێ لەناو ئەو كۆمەڵ و مرۆڤە هاوچەرخانەدا، بۆ رزگاربەخش و سەرۆك بگەڕێ و بەو شێوەیە ڕێگای خۆت بدۆزیتەوە و پەیڕەویی بكەی.

(مامۆستا محەمەدی مەلا كەریم چەند روونكردنەوەیەكی زانایانەی لەسەر نامەكەی مستەفا عەسكەری نووسیوە و مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا و دكتۆر عیزەدین مستەفا رەسول-یش چەند سەرنجێكی زانایانەیان لەسەر ئەو بەرهەمە نوسیووە. محەمەدی مەلا عەبدولكەریم لەو باوەڕدایە كە بزاڤی حەقە لەبزاڤی عەلەوی‌یەكانی زاگرۆسی=ئەهلی حەقە=ئال حەقەوە وەرگیراوە. ئەگەر بەرگی یەكەمی ئەم كتێبەی(قیامەت و نهضت علویان زاگرس)ی لەبەردەست بوایەو سەرنجی پەیوەندییە مێژوویەكان و پەرەسەندنی هاوشان و هاوكاتی ئال حەقە و نەقشبەندی‌یەكانی بدایە، ئەوكات دەهاتە سەر ئەم باوەڕەی كە ئەم بزاڤە پاش ئەنجامدانی چەند ریفۆرمێك، بریتی بووە لەگەڕانەوە بۆ خاڵی سەرەتا، واتا بۆ ئەهلی حەقە).

## چۆنێتی پەیدابوونی بزاڤی حەقە

ئەو کاتەی شێخ عەبدولکەریم لەشەدەڵە خەریکی تەبلیغ و ئیرشادکردنی تەریقەتی نەقشبەندی و بناغە دانانی مەزهەبی حەقە بو، بزاڤی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئازادیخوازی لەعیراقدا پەرەی سەندبوو، بەتایبەتی لەکوردستانداو پێکدادانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لەسلێمانی نموونەیەکی بەرجەستەی ئەو پەرەسەندنە بوو. ئینگلیزەکان،کە ئەو کات لەناوچەکەدا بوون و سەرجەم کاروبارە سیاسی و ئابووری و سەربازییەکانی عیراق بەگشتی و ناوچە نەوتییەکانی کەرکوك و سلێمانی و موسڵ بەتایبەتی، لەژێرچاودێری تەواوی ئەواندا، یەکلایی دەکرانەوەو ئەگەرچی لەبیری پێشکەوتنخوازانەی ئەواندا، بزاڤە ریفۆرمخوازو پێشەنگەکان بەهادار بوون، بەڵام لەبەرئەوەی لەچوارچێوەی بیرکردنەوەی کۆنی بیروباوەڕدا، بەتایبەتی بیروباوەڕی هاووڵاتییانی کوردستان، کە زۆر لەپێشتر لەرەهەند و لایەنی جیاجیاوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کرابوو، لەسەری کار دەکراو کارگوزارانیش کاریان لەسەر دەکردو مەرامەکانی خۆیان لەو ڕێگایەوە بەجێ دەهێنا.
هەرچەندە بزاڤی حەقە، بزاڤێکی ساواو پێشڕەو پێشکەوتوخواز بوو لەکوردستانی عیراقدا، بەڵام لەبەرئەوەی پەیامی ئازادی و دادپەروەری بەشێوەیەکی بەربڵاو هەڵگرتبوو، بۆیە توێژە زەحمەتکێشەکانی کۆمەڵ و جوتیاران پشتیوانیان لێدەکرد، بەتایبەتی ژنان کە لەبزاڤی حەقەدا، مافە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینییەکانیان بەتەواوەتی لەبەرچاوگیرابوو، بۆیە دەبینین بەهۆی ئەو پێشوازییە گەرمەی هاووڵاتییانەوە لەبزاڤی حەقە، ئیستعماری ئینگلیز هەوڵیدا بزاڤەکە بەساوایی لەناو بەرێ، جگە لەهەوڵدان بۆ ئەگەری رازی کردنی شێخ عەبدولکەریم لەپەشیمان بوونەوە

لەبیروباوەڕکانی. بۆ ئەو مەبەستەش ئینگلیزەکان ژمارەیەکی زۆر نوێنەرو پەیام و مەئموریان بۆ لای شێخ نارد کە یەکێکیان مستەر ئەدمۆندزی ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق بوو. ئەدمۆندز دووجار بۆ ئەو مەبەستە سەردانی شەدەڵەی کرد، یەکەمیان بە شێوەی نهێنی و جاری دووەمیان بەئاشکرا. لەهەردوو سەردانەکەدا، ئەدمۆندز هەوڵی زۆری‌دا شێخ لەتەبلیغ و پەرەپێدانی حەقە پەشیمان بکاتەوە، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا و نەیتوانی شێخ عەبدولکەریم لەدەرەبەگەکانی ناوچەکە نزیک بکاتەوە کە هاوپەیمان و هاوڕێی سیاسەتی ئینگلیز بوون لەکوردستاندا، ئەگەرچی بەڵێنی زۆری ئابووری و پارەو نیشاندانی ئامادەگی بۆ پشتیوانی کردن و پلەوپایەدان بەخۆی و بنەماڵەکەی بەشێخ درا. شێخ عەبدولکەریم نەک هەر پەشیمان نەبووەوە، بەڵکو درێژەی بە پەیامە ئایینی و ڕێبەری‌یە باوەڕداری‌یەکەی خۆی‌داو پێی لەسەر بڵاوکردنەوەی داگرت. شایانی باسە ئەدمۆندز لە یاداشتەکانی خۆی‌دا ئاماژە تەنها بۆ یەک سەفەریان دەکا (بروانە: ترکها، کردها، عربها – ادموندز، ترجمە جرجیس فتح الله، بغداد، ص١٨٨). دانیشتوانی شەدەڵە باس لەو سەفەرەی ئەدمۆندز، کە بەجل و بەرگی کوردییەوە بۆ شەدەڵە کردبووی دەکەن و بە کەراماتی شێخی لەقەڵەم دەدەن، چونکە ئەدمۆندز لەکاتی نوێژکردندا خۆی کردووە بەمزگەوتداو شێخ لەبەرچاوی نوێژکەرەکان داوای لێکردوە تا ڕیزی جەماعەت چۆڵ بکاو لێگەڕێ خەڵکی نوێژەکەیان بکەن، بەڵام ئەدمۆندز کە بەشێوەی سیخور خۆی گۆڕی بوو، گوێی خۆی کەڕ دەکاو ناجوڵێ، کە شێخ دەبینێ ئەدمۆندز داوا یەک لەدواییەکەکانی ڕەت دەکاتەوە، بەناچاری خۆی دەستی دەگرێ و لە مزگەوت دەری دەکاو ڕەوانەی ماڵی دەکا.

# پەرەسەندن و بەلوتکە گەیشتنی بزاڤی حەقەو دەستگیرکردنی شێخ عەبدولکەریم

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانەی بزاڤی حەقە هەیبوو، زۆر بەزوویی بڵاوبۆوە. لەکاتی بەلوتکە گەیشتنی ئەو بڵاوبونەوەیەی حەقەدا، حکومەتی عیراق بەپشتیوانیی سیاسەتی ئینگلیزو لەئۆپراسیۆنێکی غافڵگیرانەدا، شێخ عەبدولکەریم و ژمارەیەك گەورە پیاوی بزاڤی حەقەی دەستگیرکردو لەکەرکوك زیندانی کردن، هەروەها ژمارەیەکی تری بۆ حەویجە دوورخستەوە.

هەر کە موریدەکان بیستیان شێخ دەستگیرکراوە، یەکسەر وەك سەرسپاردەی راستەقینە بە جەزبەو بە هاوارو نەعرە کێشان خیرقەو کراسیان دڕاند حاڵیان لێهات و جل وبەرگەکانی خۆیان سوتاندو بەروت و قووتی دەرکەوتن، پاش ئەوەی خۆیان بەگوێنی پۆشی، ئنجا بەرەو کەرکوك کەوتنە رێ، بەڵام ژنەکانیان ئەو کارەیان نەکرد، بەڵکو خۆ رووتکردنەوەو سوتاندنی جل وبەرگەکان تایبەت بوو بەپیاوان و هەموویان ئەوەیان کرد. بەگەیشتنی رێپێوانە چەند هەزار کەسییەکە بۆ کەرکوك، یەکسەر بینایەی پۆلیس و قەزایی کەرکوکیان داگیرکردو هاواریان دەکرد یان شێخ بگەڕێننەوە شەدەڵە، یان ئێمەشی لەگەڵدا زیندانی بکەن. سەرەتا حکومەت ویستی سازش بەرامبەر بەحەقە نەکاو ژمارەیەکی زۆری لێگرتن و خزێنرانە زیندانەوە، بەڵام پاش ماوەیەك و لەئەنجامی درێژەکێشانی مانگرتنەکەو پێ داگرتن لەسەر داواکاریەکانیان، کاربەدەستانی حکومەتی عیراق بەناچاری نەك تەنها بۆیان دەرکەوت کە زیندانی کردن و دوورخستنەوەی شێخ عەبدولکەریم بەباش نازانێ، بەڵکو وای بەباش زانی بارودۆخەکە ئاسایی بکاتەوەو شێخ عەبدولکەریم ئازاد بکا، لەمێژوودا ئەو ساڵە بە

ساڵی گوێنی ناسراوە. پاش ئەو کردەو کردەوانەی حکومەت، ماوەیەك سستی باڵی بەسەر بزاڤی حەقەو ناوچەکەدا کێشاو شێخ عەبدولکەریم موریدی نوێی وەرنەدەگرت، تەنانەت تاکاتی مردنیشی جگە لەچەند کەسێك، کەسی تری وەرنەگرت. شایانی باسە، ئەو هەنگاوەی حکومەتی عیراق، لەدژی شێخ عەبدولکەریم ماوەیەك سوودی بەسیاسەتی حکومەت و ئینگلیز گەیاند، چونکە مەرامی حکومەت ئەوەبوو پڕوپاگەندەی شێخ سنووردار بکاو ڕێ لەپەرەسەندنی بزاڤی حەقە بگرێ، هەروەها شێخ عەبدولکەریم لەلای خۆیەوەو بەرەچاوکردنی بارودۆخی بزاڤە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، خۆی بەملکەچی داواکەی حکومەت بۆ خۆبواردن لەتەبلیغ کردن بینی، چونکە سیاسەتی ئیستیعمارییانەی ئینگلیز لەناوچەکەدا، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە هێزترو دەستڕۆیوتر ئەبوو، جگە لەوە سیاسەتمەدارە بۆرژوازییەکانی عیراق دەستیان لەکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی کێشابۆوەو چوبوونەوە ژێر ڕکێفی حکومەتە دەستنیشان کراوەکەی عیراق. هەروەها بزاڤەکەی شێخ مەحمودی نەمر لەکوردستان، بەتەواوەتی سەرکوت کرابوو، شێخ بۆ هیندستان دوورخرابۆوە. بارودۆخی ناوچەکانی دەوروبەریش، بەهەمان شێوە باشتر نەبوو، ئینگلیز لەهەموو جێگایەك باڵادەست بوو، بۆیە سەیر نەبوو شێخ عەبدولکەریمیش بەناچاری، مل بۆ کەمکردنەوەی تەبلیغاتی خۆی بدا.

شێخ عەبدولکەریم هەتا لەژیاندا مابوو، بەهەمان شێوەی مەسنەدنشینەکان و سۆفی و شێخی بنەماڵەکان، کەسی وەك جێگری خۆی دیاری نەکرد، چونکە وەك لەنێوان پەیڕەوانی حەقەدا باوە، مەولانا خالد پێش ئەوەی بمرێ وەسیەتی کردبوو کە پاش ئەو تا حەوت پشت ئیرشادو دەستگیریی خەڵك بکەن و پاش ئەو حەوت پشتە پرۆسەکە بوەستێنرێ.

پرۆسەکەش لەشێخ ئەحمەد سەردارەوە تا شێخ عەبدولکەریم کۆتایی حەوت پشتەکە بوو.

## بزاڤی حەقەو بزاڤەکانی دژی ئیستعمار لەناوچەکەدا

وەك پێشتر باس کرا، پەیوەندیی نێوان شێخ عەبدولکەریمی دامەزرێنەری بزاڤی حەقەو بزاڤە ڕیفۆرمخوازە سیاسی و کۆمەلایەتی یەکانی ناوچەکە زۆر پتەو بوو، بۆ نمونە پێش شەڕەکەی کۆتەڵ، پەیوەندیی یەکی هەمەلایەنەی لەگەڵ شێخ مەحمودی نەمردا هەبوو و هاوکاریی دەکرد، هەر لەبەرئەوەش ژمارەیەکی زۆر لەخزمو کەس و کاری شێخ عەبدولکەریم و سەرجەم عەشیرەتەکانی ناوچەی ئاغجەلەر بەفەرمانی شێخ عەبدولکەریم و بەفەرماندەیی شێخ عەبدوڵلای برای، لەگەڵ کاکە رەزای کوڕی حاجی شێخ عەلی عەسکەری و (کە لەپێشەنگەکانی بزاڤی حەقە بوون) کێوەکانی گەورە دێیان گرت و بۆ پارێزگاری کردن لەپاشەوەی لەشکرەکەی شێخ مەحمودی نەمرو ڕێگرتن لەپێشڕەوییەکانی ئینگلیز لەناوچەکەدا،سەنگەریان لەو کێوانەدا لێداو تا کۆتایی جەنگەکە پاراستیان و لەسەر فەرمانی شێخ مەحمود سەنگەرەکانی خۆیان چۆڵ نەکرد. لەتۆڵەی ئەو هاوکاری و پشتیوانی یەی لایەنگرانی بزاڤی حەقە بۆ شێخ مەحمودی نەمر، فڕۆکە جەنگیەکانی، ئینگلیز گوندی شەدەڵەیان بۆمباران کردو شێخ عەبدولکەریم و پەیڕەوەکانی بەناچاری بەخۆیان و ماڵ و منداڵەوە، خانووەکانیان چۆڵکردو پەنایان بردە بەر ئەشکەوتەکانی بۆڵەترێی پشتی شەدەڵە، لەکێوی دابان و دواتر روویان کردە مێرگەپان.

# بزاڤی حەقە لەپاش مردنی شێخ عەبدولکەریم

پاش مردنی شێخ عەبدولکەریم، ژمارەیەك لە موریدو سەرسپاردەکانی ئامادەنەبوون درێژە بەهاوبیریو پەیوەندییکردن بەبزاڤی حەقەوە بدەنو وەك جاری جاران کەوتنە پەیڕەوی کردن لەدابونەریتی نەقشبەندی. هەروەها وەك موریدەکانی تری سۆفیگەرێتی لەکوردستانو ئێستاشی لەگەڵدا بێ، موریدەکان بۆ زیارەتو تازەکردنەوەی پەیمان، سەردانی شەدەڵەو ئارامگەی شێخ عەبدولکەریم دەکەن.

سەرەنجام پەیڕەوانی بزاڤەکە بوون بەدوو بەشەوە: زۆرینەو کەمینەو ژمارەیەکی کەم پەیوەندییان بە حەمەسوورەوە کرد کە یەکێك بوو لەموریدە توندڕەوەکانی شێخ عەبدولکەریم لەهەناوی بزاڤەکەو پێشتر ئاماژەمان پێداو ئەو لایەنگرانەی حەمەسوور لەگوندی کلاوقوت لەناوچەی شوان دەژیان. بەلام زۆرینەی پەیڕەوانی بزاڤەکە پەیوەندییان بە مامە ڕەزای برای شێخ عەبدولکەریمەوە کردو وەك پێشەوای خۆیان هەڵیانبژارد. بێلەوە ژمارەیەکی تری پەیڕەوانی حەمەسوور لەگوندی کانی قۆمەرغانو قەدرانگوێی سەر بەناحیەی سورداش دەژیان. ئەو گروپەش هەوڵی تەرخانی لایەنە کۆمەڵاتییەکان باشتر کردنی گوزەرانی ئابووری لایەنگرانی خۆی دەداو بۆ ئەو مەبەستە سەندوقی هاوکاریو خێرخوازی، بۆ ئەنجامدانی خزمەتگوزاری گشتیو یارمەتیدانی پەیڕەوانی بزاڤەکە دامەزراند. هەروەها گروپەکە جگەرەکێشانو چا خواردنەوەی لەئەندامەکانی خۆی قەدەغەکردو روویان لەکاری کڕینو فرۆشتنو بازرگانی کردو بۆ نیشانە، تەسبیحیان بەدەستەوە دەگرت. بەلام چەند پەیڕەوێکی

تری حەمەسوور، بەهەمان رەوشی پەیڕەوانی مامەرەزا رەفتاریان دەکردو جیاوازیی نێوانیان تەنها لەوەدا بوو کە بە دوورە پەرێزی لەکەسان و بۆنەو کۆڕو کۆبوونەوەکان دەژیان.

بەهۆی ئەو دوولەتبوونەی کە لەڕیزەکانی بزاڤی حەقە، لەپاش مردنی شێخ عەبدولکەریم رووی‌دا، زەمینەی تەبلیغ و پڕوپاگەندەو بوختان لەلایەن گروپە ناحەزەکانەوە، لەدژی بزاڤی حەقە رەخساو دەستکرا بەدنەدان و هاندانی زۆردارو پیاوانی حکومەتی ناوچەکە لەدژی بزاڤەکە. دوا بوختان و تومەتێ کەدژی بزاڤی حەقە پڕوپاگەندەی بۆ کرا ئەوەبوو گوایە حەمەسوور ئیدیعای پێغەمبەرایەتی کردوەو( )بە حەرام نازانێ(؟!!!) تا سەرەنجام لە ساڵی١٩٥٧ی.ز=١٣٣٦ کۆچی هەتاوی، حکومەتی ئەو کاتەی عیراق، حەمەسووری دەستگیروزیندانی کردو خرایە بەردەم دادگا. بەڵام پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەموزو شکستی نەیارەکان، حەمەسوور پاش ماوەیەکی زۆری زیندانی و ئازار، لەبەردەم دادگا بەرگریی لەخۆی کردو بەبێ گوناه ناسراو ئازاد کراو گەڕایەوە گوندی کلاوقوت.

حەمەسوور لەرەچەڵەکی شێخان و گەورە پیاوانی تەریقەت نەبوو، بەڵکو کەسایەتیەکی سەر بە توێژی مسکێن هەژاربوو. حەمەسوور ماوەیەکی زۆر لەماڵی شێخ عەبدولکەریم بەکاری کۆکردنەوەی دارو چیلکەو شوانی‌یەوە خەریك بووەو پاشان بەیعەتی داوەتە شێخ و وەك سۆفی‌یەکی نەقشبەندی رەفتاری کردووەو لەگەڵ موریدەکانی تردا حوکم و رێ و رەسم و ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام داوە، تا وردە وردە چووەتە پێش و سەرەنجام بووە یەکێ لەپێشەوایانی بزاڤی حەقە، شێخ ستارو مەلا سەلام کە کەسانی جێ‌متمانەی حەمەسوور بوون و ئاگاداری بارودۆخی بوون و هاودەم و هاوچەرخی بوون، دەڵێن: دەربارەی باوباپیرانی حەمەسوور دەبێ

بەڕاشکاوی بڵێن کە نە باوك و نە باپیرە گەورەی ناناسین، تەنها ئەوە دەزانین کە دەڵێن خەڵکی دەوروبەری ئالان و سیوەیلە. لەرووی خوێندەواریشەوە، خۆی وتویەتی کە نەیخوێندووە، بەلام شیعرو پەندی زۆری لەبەربووە و زانیارییەکی فراوانی هەبووە، چونکە ماوەیەك لەگەڵ زانا و خوێندکارانی ئایینیی سەروکاری هەبووە.

مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا نووسیویەتی: حەمەسوور لەپاش مردنی شێخ عەبدولکەریم، عەمامەکەی ئەوی لەسەر ناو جبەکەی پۆشی و ئیدیعای شێخایەتی و جێنشینیی شێخ عەبدولکەریمی کرد، بەلام کەسوکاری شێخ عەبدولکەریم، واتە بنەماڵەی ڕێبەری بزاڤەکە، ڕازی نابن و خۆیان نادەنە دەست حەمەسوورو لەشەدەڵە دەری‌دەکەن. حەمەسوور بۆ ناوچەی شوان کۆچ دەکا و پاشان دەچێتە کەرکوك و لای سەید ئەحمەدی خانەقا دەگیرسێتەوە، بەلام سەید ئەحمەدی خانەقاش بۆچوونەکانی‌حەمەسوور ڕەتدەکاتەوەو بەتۆمەتی بیدعەت(داهێنان)، جێگای ناکاتەوەو لە خۆی دووری دەکاتەوە. بۆیە حەمەسوور بەناچاری خۆی و مورید و خزمەکانی دەگەڕێنەوە گوندی کلاوقوت و لەوێ سەقامگیردەبن. بۆ تیشك خستنەسەر قسەکانی شێخ ستار پێویستە بوترێ کە کاتێ دەستەی شێتەکان کە تەبلیغکاری گەڕۆکی بزاڤی حەقەبوون و بەجێهێنانی حوکم و فەرزەکانیان بەسەرچوو(ساقط) لەقەڵەم دەدا، لەهەناوی پەیڕەوەکانی شێخ عەبدولکەریمەوە سەری هەڵداو حەمە سوور یەکێ بوو لەئەندامانی ئەو دەستەیە، بەلام شێخ عەبدولکەریم بەپەیوەندیی حەمە سوور شێتەکان ڕازی نەبوو، تەنانەت زۆر بەتوندی سەرزەنشتی کرد و پێی وت: داواکارم لێرە بڕۆیت و باری بوونی ناخۆشت لەسەر شانمان سووك بکەی، لەدنیا و

قیامەتدا تۆ هاوڕێی ئێمە نیت و لەریزی ئێمە نیت و لەو کاتەوە حەمەسوور ژمارەیەك موریدی شێخی کردە هاوبیرو هاوڕێی خۆی و شەدەڵەی بەجێهێشت و چووە کڵاوقوت و وردە وردە سەرگەرمی کاروکاسبی و بڵاوکردنەوەی ئەندێشەی حەقە بوو. چەند موڵکێکی لەجوتیارانی ناوچەکە کڕی و بووە خاوەن زەوی زاری کشتوکاڵی. بەگوێرەی ئەو قسانەی مەلا سەلام کە شێخ ستار گێڕایەوە، وادیارە حەمەسوور پێش مردنی شێخ عەبدولکەریم چووەتە کڵاوقوت و تیایدا جێگیربووە. بۆیە ئەگەر بمانەوێ دەرەنجامێکی ئەو دوو راپۆرتەمان بۆ ساغ بێتەوە، دەبێ ئەوە بڵێین کە بەبیانووی مردنی شێخ عەبدولکەریم، هاتۆتەوە شەدەڵەو ویستوویەتی جێگای شێخ بگرێتەوە، بەڵام ئەو مەرامەی بۆ نەچۆتە سەرو گەڕاوەتەوە کڵاوقوت. پەیرەوانی حەمە سوور خودی حەمەسوورلە گروپەکەی مامەرەزا زیاتر کەوتنە بەرگلەیی و گازندەو تۆمەت و قسە بۆ هەڵبەستن و گوشاری خەڵك و حکومەت. لەبەرئەوە گروپەکەی حەمەسوور، هەمیشە خۆیان دوورە پەرێز دەگرت و بەشێوەیەکی داخراو مەسەلە کۆمەڵایەتی و ئاینییەکانی خۆیان ئەنجام دەدا. ئەگەرچی حەمەسوور خۆی سەر بەبنەماڵەی دامەزرێنەری بزاڤی حەقە نەبوو، بەڵام دڵسۆزی و وەفاداری خۆی بۆ توێژە زەحمەتکێشەکانی کۆمەڵ سەلماندبوو. مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا دەڵێ: بۆ درێژەدان بەکاری ئیرشادو تەبلیغی تەریقەتی نەقشبەندی، لەناو بنەماڵەی شێخ عەبدولکەریمدا ژمارەیەك بەسەرپەرشتی شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ مستەفا عەسکەری هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە پێویستە بزاڤەکە رابگیرێ و بچێتەوە سەر رێچکە بنەڕەتیەکەی خۆی کە نەقشبەندییە. ئەو بیرۆکەیە لەلایەن توێژی وردە بۆرجوازی ناوچەکەوە خرایە روو. جەنابی مامۆستا

محەمەد مەلا کەریم لەبۆچوونەکانی خۆیدا زیاتر زاراوەی حزبیو سیاسی باوی رۆژ بەکاردەهێنێ، ئەگەرچی ئەو جۆرە بزاڤانە سەرەنجامو پاش چەندین سەدەو لەماوەی رەوتی پەرەسەندنی مێژوویو کۆمەڵایەتیدا، لەچوارچێوەی حزبە سیاسییەکاندا خۆیان دەبیننەوە، بەڵام ئەگەر لەرەهەندێکی باوەڕداریو بەسوود وەرگرتن لەزاراوە ئاینییەکان لێکیان بدەینەوە، زیاتر خوێنەر لەمەبەست نزیك دەکاتەوەو رێنمایی دەکات کە رێگای پەیوەندییو دەسەڵات پەیداکردن لەناو دەزگاکانی حکومەتیگرتبووەبەر، کەچی لەئەنجامدا بزاڤەکە نەیتوانی بگەڕێتەوە سەر رێچکە باوەکەی خۆی. پاش ماوەیەك هەمووان هاتنە سەر ئەوەی مامەرەزا بکەنە جێنشینی سەرەکی حەقەو شێخ عەبدولکەریم.

## مامە رەزاو ریفۆرمو ریبەری کردنی حەقە

مامــە رەزا لەســاڵی ١٩٠٥=١٣٢٣ی کۆچــی مــانگی=١٢٨٤ی کۆچــی هەتاوی لەشــەدەڵە لــە دایـك بـوو و بــرای شـێخ عەبدولکەریمــە. بەرواڵــەت پیاوێکی گەنم رەنگو بە ویقار بوو. هــەروەها خاوەن کەسایەتییەکی مام ناوەندو جێگیر بوو، قسەخۆش و هۆشیار بـوو، هــەردوو زمـانی عــەرەبی و فارسی زانیوەو لەئەدەبیاتی کوردی و فارسیدا، شارەزاییەکی تەوای هەبوو. تارادەیەکیش ئاگاداری پێشینەی مێژوویی کوردو نەتەوە موسڵمانەکانی تر بـوو. لـەماوەی ژیـانیدا چـەندین جـار دووچـاری زینـدانو ئەشـکەنجەو ئازارو دوورخستنەوە بووە. لەسەرەتای لاوێتیـدا لـەحوجرە خوێندویەتی و لەو بوارەدا کەسێکی پێشڕەو بووەو بەمـەنتقی رۆژگـار بـیری کردۆتـەوەو حـەزی بەپێشـکەوتنی بـاری کۆمەڵایـەتی گـەلی کـورد بـە گشـتی و توێـژە زەحمەتکێشەکەی بەتایبەتی کردوە. لـەو سۆنگەیەوە هاودەمی و گفتۆگۆی لەگەڵ کەڵـە پیاوەکـانی بـواری بیرو کولتـور هـەبووە، بەتایبـەتی لـەماوەی دوورخستنەوەی لەعیمارە، پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ میرحاج پەیدا کـردو هـەر لـەو رێگایـەوە هـەل بـۆ بزاڤـی حەقـە رەخسـا، تـا پـەیوەندیی بەکۆماری مەهابادەوە بکا. مامــەرەزا بەپاشـکۆو درێـژە پێـدەری رێچکـەی شێخ عەبدولکەریم لە بزاڤی حەقەدا لەقەڵەم دەدریٚ و لەماوەی رێبەری ئەمدا، زیـاتر لا لەمەسـەلە کۆمەڵایەتییـەکان کرایـەوەو بزاڤـی حەقـە هـەنگاوی بـۆ هێنانـە دی ئامانجە والا و نەتەوەییيـەکان نا. جگە لـەوە پەیوەندیی بزاڤـی حەقـە لـەماوەی رێبـەرێتی مامـە رەزادا لەگـەڵ بزاڤـە سیاسـییەکانی تــری ناوچەکـە پتــەوتر کـردو کاتــیٚ کۆمــاری مــەهاباد راگەیــەندرا، ژمارەیــەك

لەپەیڕەوانی حەقە بەفەرماندەیی شێخ محەمەد ئەمین چوونە مەهاباد.
هەروەها پەیوەندیی نێوان حەقەو بزاڤە سیاسییەکانی تری کوردستانی عیراق باش بوو، لە روانگەی ئەو پەیوەندییانەوە، مام رەزا هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە دەبێ بە رەوشێکی نوێ بزاڤی حەقە لەرووی سیاسی و ئایینییەوە رێک بخرێتەوەو سەرەنجام نەک تەنها لەچوارچێوە سۆفیگەرییەکەی دەرچێ، بەڵکو لایەنی شۆڕشی کۆمەڵایەتیش رەچاو بکا.
بۆ گەیشتن بەو مەرامە بابەتو ناونیشانی کردە ئامانجو بناغە بۆ دووبارە رێکخستنەوەی بزاڤەکەو بەوجۆرە بزاڤی حەقە بەرێچکەیەکی نوێو بەرەو ژیانێکی کۆمەڵایەتی نوێ هەنگاوی نا، لەوانە هاوکاریو بەشداری کردنی ژنانو باوەڕ بەخۆبوونی جەماوەر لەبەرەوپێش بردنی ئامانجەکانی کۆمەڵدا، خەبات لەدژی ناکۆکی کۆمەڵایەتیو وەستاندنەوە لەدژی زۆرداریو ستەمی سەر توێژی زەحمەتکێشی کردە دروشمی خۆی.
پرۆسەی سەر لەنوێ رێکخستنو دروستکردنی پەیوەندیی سیاسی و کۆمەڵایەتی بزاڤی حەقە، زۆر بە زیرەکیو بیرکردنەوەیەکی تایبەتەوە، لەلایەن مامەرەزاوە ئەنجام ئەدراو تەنانەت بووە هۆی ئەوەی زۆرینەی پەیڕەوانی حەمەسوور، بەتایبەتی ئەوانەی باوەڕیان بەگەڕانەوە بۆ شێوەی باوی سۆفیگەری نەقشبەندی هەبوو، رێبەرێتی مامەرەزا قبوڵ بکەن، چونکە مامەرەزا توانی سەرکەوتوانە ئەو ریفۆرمو دووبارە رێکخستنەوەیە ئەنجام بداو رای گشتی کۆمەڵ دەربارەی حەقە، کە بەبزاڤێکی لادەرو دەرچوو لەرێچکەی ئایینی خۆی تاوانبار دەکرا، بگۆڕێ بەڕایەکی ئیجابیو لەدژی ناحەزانو جیابوونەوە ناوخۆییەکان بوەستێتەوە. نووسینەوەو پەسەند کردنی ئەو پەیڕەوە ناوخۆییە نەتەوەیو مەزهەبییە، رەنگدانەوەی

جیاجیای لەناوەندە مەزهەبی و نەتەوەییەکاندا دروست کرد. بناغەی بزاڤی حەقە لەسەر ئەم هەشت بنەمایەی خوارەوە دارێژرا:

**یەکەم: برایەتی**

مەبەست لەبرایەتی، بریتی‌یە لەپەیوەندیی برایەتی نێوان پەیڕەوانی بزاڤەکە بە ژن و پیاوەوە. بەگوێرەی ئەم بنەمایە هیچ جۆرە جیاوازی‌یەك، لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵی بزاڤی حەقەدا نی‌یەو نابێ بوونی هەبێ. هەروەها بەهیچ کلۆجێ نابێ ناکۆکی چینایەتی(ئابووری و نەژادی) لەکۆمەڵی بزاڤی حەقەدا هەبێ و کەس بەهۆی ماڵی زۆرتر یان رەچەڵەکی هەڵبژاردەوە لەکەسی‌تر لەپێشتر نی‌یە. ئەگەرچی بزاڤی حەقە سەرەتا لەنێوان توێژە زەحمەتکێش و چەوساوەکانی کۆمەڵدا دەستی پێکرد، بەلام پاشان وردە وردە ئەندامی پێشکەوتووتر لەرووی کۆمەلایەتی و ئابووری، رەچەڵەکی، زانستی و...هتد لەتوێژەکانی ترەوەی بۆ خۆی راکێشا و هاتنە ناو بزاڤەکەوە. بۆ نموونە مەلا حسێن خانەقا، مەلا رەشید گۆمەتەیی پێشنوێژو ئیمامی جەماعەتی مزگەوتی عەسکەرو مەلا حامید سەرمۆرد، مەلا سەلام کەرکوکی، جەمیل عەلی ئاغا دزەیی.. هتد کە لەگەورە پیاوانی کاروباری مەزهەبی و لەموڵکدارە گەورەکانی ناوچەکە بوون، پەیوەندییان بەمامەرەزاوە کردبوو، تەنانەت مەحمود ئاغای پشدەر کە سەر بەتیرەی میراودەلی‌یەو سەرەتا دوژمنی سەرسەختی مامەرەزابوو، بەلام سەرەنجام بووە موریدو سەرسپاردەی مامە رەزاو پەیوەندیی بەحەقەوە کردو..

**دووەم: حەق پەرستی**

پەیڕەوانی بزاڤی حەقە، ئەوپەڕی لایەنگری حەق و حەقیقەتی رۆژگار بوون و بەرادەیەك بەهایان بۆ حەق دادەنا کە ئامادەبوون بەرگریی لەحەق بکەن، ئەگەرچی بەزیانی خۆشیان تەواوبوایە. رێدەکەوت چەندین جار لەدژی خزم و کەسوکاری خۆو بەقازانجی بێگانە بۆ رونکردنەوەی ناکۆکی یەك، شایەتیان داوەو پشتیوانیان لەخاوەن حەق کردووە، واتا بۆ دەرخستنی حەقیقەت، بە هیچ کلۆجێ دۆستایەتی و خزمایەتییان لەبەرچاو نەدەگرت.

**سێهەم: هاوبەشیی ئابووری**

لەنێوان پەیڕەوانی بزاڤی حەقەدا، بنەمای هاوبەشیی ئابووری لەسەرمایەو ماڵ و موڵك رەواجی هەبوو، بە گوێرەی ئەم بنەما نەگۆڕە هیچ یەکێ لەپەیڕەوانی حەقە بەرامبەر بەکۆمەڵی بزاڤەکە خۆی بە خاوەن ماڵ و سەرمایەو زەوی و ...، نەدەزانی و هەر سامان و سەرمایەیەکیان هەبوایە، بەموڵکی سەرجەم پەیڕەوانیان دەزانی و بەئەمانەتێکیان دادەنا کە لەلایەن خەڵکی ترەوە پێیان دراوە.

ئەو بنەمایەیان بەرادەیەك پەیڕەو دەکرد کە بەبێ ئاگاداری ئەوانی ترو ئەنجومەنی کۆمەڵایەتی بزاڤەکە، هیچ گۆڕان و ئاڵوگۆڕێکیان لەسامان و دارایی کەسایەتیدا ئەنجام نەدەداو لەو ناوچەیەدا پەیڕەوانی حەقە بەو رادەیە لەماڵ و موڵکی یەکتریدا، هاوبەش بوون کە تەنانەت بەری میوەی باغ و سێوییان لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکرد و هەندێجار وا رێدەکەوت کە سێوێك بەر چەند کەسێك دەکەوت. بۆ ئەنجامدانی کاری کێڵگەوبۆنەو رێورەسمەکان، ئەگەر پەیڕەوێك تەنها بوایە، بەکۆمەڵ کارەکەیان بۆ ئەنجام

ئـەداو ئەگـەر بـۆ هێنانـەدی مەبەسـتێك پێویسـتی بـەپارە بوایـە، ئـەوا بـە یارمـەتی و هاوکـاری و هاوبەشـیی ئـەوانی تـر، داواکاری‌یەکـەی جێبـەجێ دەکرا.

## چوارەم: ئابوونە یان مانگانە

بۆ پتـەوکردنی لایـەنی ئابوورییانـەی کۆمـەڵی بزاڤـی حەقـەو پێکـهێنانی سەرمایەیەکی گشتی‌و لەپێناو پاراستن‌و هێشتنەوەی بەڕێوەبردنی خانەقاو تەکیەکانی پەیڕەواندا، هەموو کەسێك چ ژن یان پیاو، چ منداڵ بێ یان لاو، چ کوڕ بێ یان کـچ دەبوایـە ئابوونـەی مانگانـەی خـۆی بـدا. ئابوونەکـەش دەدرایـە سەرپەرشـتکاری تەکیـەکان، کـە بـە سـەرتەکیە ناسـراو بـوو، یـان دەدرایە تـەبلیغکارانی بزاڤەکـە کـە بـە(براسـیار) نـاودەبران. ئـەوەندەی بـۆ خـەرجی‌ی تەکیە پێویست بوایـە خـەرج دەکـراو ئـەوەی دەمایـەوە رەوانـەی تەکیـەی کلکـەسماق دەکـرا کـە رۆڵـی تەکیـەی مەرکـەزی دەگـێڕاو بنکـەی مامەرەزابوو.

## پێنچەم: راوێژو راپرسی

هـەموو کـارێکی گشـتی‌ی کۆمـەڵی بزاڤـی حەقـە، بـەراوێژو راپرسـی‌ی هەمەلایەنـە ئـەنجام دەدرا. بـۆ چارەسـەرکردنی هـەر گرفـت‌و ناخۆشـی‌یەك، پەیڕەوان کۆدەبوونەوەو راوبۆچوونیان دەگۆڕییەوەو، بۆ دیاری‌کردنی هـەر رێگا چارەیەك، پەنادەبرایە بەر رای گشتی. ئەو پرۆسەیە لەناو لایـەنگرانی حەقەدا بە (پرس‌و رای ناو برایەتی )ناونرا بوو. لـەو کۆبونەوەیـەدا، هـەموو کەسێ مافی بەشداری‌و رادەربڕینی هەبوو، بەژن‌و پیاوەوە.

**شەشەم: ئازادیی ژنان**

پێشەوایانی بزاڤی حەقە لەو باوەڕەدابوون کە جیاوازیی لەنێوان ژن و پیاودا نی‌یەو هەموویان خوشك و برای یەکترن. ژن وەك هەر پیاوێك خاوەن مافی کۆمەڵایەتی‌یەو رۆڵی کاریگەری خۆی هەیە، لەبزاڤی کۆمەڵ و خێزان و لەراوێژو راپرسی و هەڵبژاردنی هاوسەرداو بەهیچ جۆرێ گوشار بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر ناخرێتە سەر ژن. لەناو پەیڕەوانی حەقەدا، شیربایی بوونی نی‌یەو تەنها مەرجی هاوسەرێتی، بریتی‌یە لەرازی بوون و ئامادەبوونی کوڕو کچ بۆ پێکەوەنانی خێزان. هەرچی وردەکارێکانی ترە، ئەوە وەك موسڵمانەکانی تر ئەنجام دەدرێ لەوانە: شیرینی خواردنەوە، مارە بڕین، مەراسیمی شایی و گوێزانەوەی بووك بۆ ماڵی خۆی.

ئەو بنەمایەی سەرەوە، بووە بەڵگەیەك بەدەستی ناحەزانی بزاڤەکەوەو بۆ ماوەیەکی زۆر لەنێوان پەیڕەوانی خۆیاندا، بەچەندین جۆر چیرۆکی نامەعقول و ناڕەوایان دروستکردو پڕوپاگەندەیان بۆ دەکرد، چونکە ئەو بنەما بنچینەیی‌یە، دژی چەوساندنەوەی ژن لەلایەن دەوڵەمەندەکانەوە بوو، ئەوانەی کچ و ژنیان دەکردە ئامرازێکی بازرگانی و پەیوەندیی‌یەکی ناڕەوای بە پەرژەوەندییەکانیان لەکاروباری عەشایەری و سیاسی و ئابووریدا. یان بەپێچەوانەوە کچێکی گەنج و جوانی سەر بەخێزانێکی هەژار بەزۆر دەدرایە پیاوێکی پیری موڵکدار، لەکاتێکدا ژن لەکۆمەڵی کوردەواریدا جۆرە ئازادی‌یەکی کۆمەڵایەتی وەك: لەبەرکردنی جل وبەرگی خۆماڵی و ئەنجامدانی کاروباری خێزان و هەندێ کاری دەرەوەی وەك بەخێوکردنی مەڕومالات و باخەوانی و گاوداری و بەخێوکردنی منداڵی هەبوو، جگە لەوە ژن لەهەڵبژاردنی هاوسەردا، ئازاد بووەو بەدەگمەن دووچاری زۆر دەبوو.

هەروەها لەکاتی تەنگانەو شەڕدا، وەکو پیاو دەستی دەدایە چەك و شان بەشانی پیاو ڕووبەڕوی دوژمن دەبووەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئازادی دان بەکچان و ژنان لەهەناوی بزاڤێکی مەزهەبی کۆمەڵایەتیداو لەناو کۆمەڵێکی دەمارگیرو کلاسیك وعەشایەریدا قورس بوو. سەرەڕای ئەوەش ئەو بنەمایە توانی پێداچوونەوەیەکی بنەڕەتی، لەرەوتی پێشکەوتنی بزاڤەکە بۆ پەیڕەوانی خۆی، لەناو هەموو توێژەکاندا چ لەشارو چ لەگوندەکاندا، بەهەژارو دەوڵەمەنەوە بێنێتە کایەوە.

حەوتەم : ڕەوش

ڕەوش بریتی بوو لەژمارەیەك ئامۆژگاری ئەخلاقی و پێویست بۆ هەمووان، بێ‌جیاوازی تا پەیڕەویی لێبکەن. هەر کەسێ پەیڕەویی لەو ئامۆژگارییانە نەکردایە، یان پێچەوانەی ئەو ئامۆژگاری‌یانە ڕەفتاری بکردایە، ئەوا وەك (بێ‌ڕەوش) لەقەڵەم دەدراو بەو هۆیەوە بەبڕێك پارە سزا دەدرا، یان بۆ ماوەیەك دەردەکرا، یان کارێکی قورسی پێ‌دەسپێردرا، ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەو ئامۆژگارییانە:

١- دەست و زمان پاکی و دوورکەوتنەوە لەدزی و درۆوبوختان و لادان.. هتد هەموو ئەندامەکانی لەش دەبێ لەو پیسی‌یانەی سەرەوەو شتی ناپەسەندی تر دووربن. ئەوەی بیویستایە ببێتە پەیڕەوی حەقەو پاش ڕاهێنانی بەو ئامۆژگارییانەی سەرەوە، بۆ ماوەیەك دەخرایە ژێر چاودێری و تاقی دەکرایەوە. سەرەنجام ئەگەر سەرپێچی‌یەکی لێببینرایە، ئەوا دەردەکراو وەك پەیڕەوکەر وەرنەدەگیرا، هەروەها پەیڕەوانی حەقە لەسەودانامەو ئەنجامدانی کاروبارەکاندا، نموونەی مرۆڤی ڕاستی و واقعی بوون و درۆیان نەدەکردو خۆیان لە پڕوپاگەندەو تەماع دەپاراست.

٢- پاکی‌و پاکژیی پاراستنی تەندروستی تاك‌و خێزان.. پەیڕەوانی حەقە بایەخێکی باڵایان بۆ پاکی‌و پاکژیی لەبەرچاو دەگرت‌و هەمیشە لەشولاریان پاك‌و جل‌و بەرگێکی خاوێن‌و رازاوەیان لەبەر دەکرد، لەوانە گۆرەوی لەخوری دروستکراویان تا ئەژنۆ لەپێ دەکردو ژنانیان بایەخێکی زۆریان بەپاکی‌و پاکژی کەل‌وپەلی ناومالٚ دەداو جل‌وبەرگی جوان‌و خاوێنیان دەپۆشی. هەروەها بە جوانترین شێوەی شیاو، چاودێرییان لەپاکژیی خۆراك‌و کەلوپەلی موبەق‌و سێتی چا خواردنەوە دەکرد.

٣- بەجێهێنانی ئەو فەرمانەی بە کۆمەڵ بڕیاریان لەسەر دەدراو سەرپێچی نەکردن لەبڕیارەکانی ئەنجومەن(دەرنەچوون لەریزی برایەتی ).

٤- بەجێهێنانی ئەوپەڕی وردبینی‌و سەر راستی‌و ویژدان لەسەودانامەو ئەنجامدانی کاروباردا، بەدوور لەتەماح‌و گرفت‌و ئازار دروست کردن بۆ خەڵکانی تر.

٥- دووره پەرێزی لەکەسانی جێگومان لەرووی ئایینی‌و دنیاییەوە. لەو سۆنگەیەوە کەمتر تێکەڵاوی گروپەکانی تر، جگە لە پەیڕەوانی حەقەیان دەکردو سەرەنجام ژیانێکی دیاری کراوو پەیوەندییەکی داخراویان هەبوو.

٦- لەکاتی یەکتر بینین‌و تەوقە کردندا، پەنچەکانی دەستیان دەخستە ناو پەنچەکانی دەستی یەکتروئەم بڕگەیان دەوتەوە: (یا کەریم‌و یا رەزا) کە مەبەستیان ناوەکانی خودا بوو، هەروەها ناوی دوو کەس لەدامەزرێنەران‌و پێشەوایانی بزاڤەکەش بوو و ئەو شێوە تەوقە کردنە، لەناو ژن‌و پیاوو منداڵ‌و گەنجدا باوو یەکسان بوو، بەڵام دیاردەی دەست ماچ کردن‌و... لەناویاندا هەڵوەشێندرابووەوەو نەبوو. بۆ تەوقە کردنیش یەك لەدوای یەك لە راستەوە دەست بە تەوقە کردن بەرەو چەپ دەکرا، بۆئەوەی کەسێ

بپەڕێنن و هەمووان لەو کاتەدا، لەسەر پێ دەوەستان، بەتایبەتیش لەنێوان سەرجەم دۆخەکانی تردا، بەو تەوقە کردنە(رەوش) دەوترا.

**هەشتەم: ڕێکخستنی کاروبار**

لەهەر گوندێکدا کە تاك و خێزانی پەیڕەوی حەقەی تێدا دەژیا، پێکەوە خانوویەکیان دروست دەکرد یان دەکڕی و دەیانکردە تەکیە. سەرجەم براو خوشکانی حەقەی ئەو گوندە، لەکاتی بێکاریدا، یان کاتێ میوانێك رووی تێکردایە، یان بۆ راوێژو راپرسی و هەواڵی یەکتر زانین، دەهاتنە تەکیەکە. پێشتر هەمووان ئاگادار دەکرانەوە، تا لەوێ کۆببنەوەو هەر پێشنیازێك بخرایەتە روو، راوێژو راپرسی(پرس و رای ناو برایەتی) لەسەر دەکراو پێشنیازەکە لێك دەدرایەوە. لەو تەکیانەدا، کاتێکی بەسوود بەسەر دەبرا، بەتایبەتی لەکاتی بێکاریدا، لە کەشێکی ئارام و هێمن و خۆشیدا، گوێ بۆ مۆسیقای خۆماڵی هەڵدەخرا، چیرۆك و داستان و سەرگوزشتەی باوباپیران دەگێردرایەوە، کورتە وتاری بەسوودو پەندو ئامۆژگاری و وتاری ئایینی و خواپەرستی و حەق پەرستی پێشکەش دەکرا. تەکیەکان هەمیشە نموونەی پاکی وپاکژی بوون، هاتنە ژوورەوە بۆ ناو تەکیە بە پێڵاوەوە و دانیشتن و خەوتن لای پەیڕەوانی حەقە قەدەغە بوو. لەهەموو گوندێکدا، یەکێ لەپەیڕەوانی حەقەی ئەو گوندە بە سەرپەرشتکارو نەقیبی تەکیەکە هەڵدەبژێردراو نازناوی (سەرتەکیە)ی پێ‌دەوترا. ئەرکی سەرتەکیە بریتی بوو لە پاراستن و سەرپەرشتی کردن و چاودێری‌کردن و بەڕێوەبردنی تەکیەو کۆکردنەوەی ئابوونە(سەرانە)ی هەر مانگێکی پەیڕەوان لەو گوندەدا. هەروەها سەرتەکیە هەرچی‌یەك بۆ تەکیە لەهەموو روویەکەوە پێویستی

بکردایە ئەنجامی دەداو پێشوازیی لەمیوانانی تەکیە دەکردو ئەگەر هەواڵ و پەیامێك هەبووایە، بە سەرجەم پەیڕەوانی دەگەیاند.

## پڕوپاگەندەکەرانی بزاڤی حەقە

لەسەرەتایی دەرکەوتنی بزاڤەکەدا، ژمارەیەك پەیڕەوو سەرسپاردەی شێخ عەبدولکەریم، بەهۆی جەزبەو حاڵ لێهاتنەوە، دەستیان لەکارو کاسبی هەڵگرت و ماڵ و ژن و منداڵیان تەرك کردو خۆیان بۆ تەبلیغ کردنی ئایینی حەقە تەرخان کردو کەوتنە گەڕان بەگوندەکاندا. ئەو پروپاگەندەکەرانە دەربارەی حەقە قسەیان بۆ خەڵك دەکرد. پاش مردنی شێخ عەبدولکەریم و جێگرتنەوەی لەلایەن مامەرەزاوە، مامەرەزا ئەو دەستە پروپاگەندەکەری وەك نوێنەری خۆی هەڵبژاردو لەنێوان پەیڕەوانی حەقەدا دەستەو گرووپی دوو کەسی پێکەوە بۆ پڕوپاگەندەکردنی ئایینی حەقە ڕەوانەی گوندو ناوچەکان کرد، ئەو وپێیان دەوترا(براسەیار)، واتە برای گەڕۆك. بێگومان پروپاگەندەکەران کەسانێکی زۆر زیرەك و زمان شیرن و ڕەوانبێژو هۆشیارو مەعقول بوون، لەوانە کاکەدینە، شێخ بەکرو شێخ سەلیم کە خەڵکی سەرگەڵو بوون و شێخ عارف ئیلەڵڵاو سەید عەبدوڵڵاو سەید عەلی کانی هەنجیری و... هتد.

## موخلس

ئەو دەستە پەیڕەوانەی لەگوندەکاندا جێگیر بوون و لەیەك شوێن نیشتەجێ دەبوون، پێیان دەوترا(موخلس) و بەو نازناوەوە ناوبانگیان دەرکرد، چونکە بەوپەری دڵسۆزییەوە کاری تەبلیغیان ئەنجام دەدا، لەوانە حاجی ئەحمەد سەرگەڵویی، حاجی مەحمود هەڵەدنی، سۆفی بەنی شیلە،

عەلی سالحی قەلاچوغەی ئاغجەلەر، مستەفای سەرمۆرد، محەمەد قوربانی ۆوزلو، مەلا عەبدوڵلای هەڵمۆرد، حاجی ئەحمەد بیرەسپان، سۆفی مەولود عومەر گومەت، محەمەد عەزیز کوێخا عەبدوڵلای مەرگە، حاجی محەمەد خۆشناو، مام عەلی کۆچی قەرەدەرە، حەمەبۆر کەرکوکیو محەمەد ئەمین عارەب لەکەرکوك‌و ...هتد. جگە لەوە موخلسی شارەکان هۆشیارو رووناکبیر بوون، لەوانە: مەلا سابیر سۆفی محەمەد لەسلێمانی.

## دیدی کۆمەلایەتی لەبزاڤی حەقەدا

لەو یاداشتانەی مستەفا عەسکەریدا کە دەربارەی بزاڤی حەقە نووسیوێتی‌و مامۆستا حەمزە عەبدوڵلا پەراوێزو پێشەکی‌و تەعلیقی لەسەر نووسیوە، دیدگای حزبایەتی پێوە دیارە، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەناوەندە رووناکبیرەکانی ئەو کاتەی عیراقدا، لەئایین‌و باوەڕو لێکدانەوەو توێژینەوەدا، زیاتر بایەخ بەدیدی حیزبی دەدراو بەداخەوە لەو دیدەوە، تەماشای زۆربەی رووداوەکان دەکرا، لەکاتێکدا زانیارییەکان دەربارەی ئایینە کۆنەکانی کوردستان‌و بارودۆخی کۆمەلایەتی‌و باوەڕداری نیشانی دەدەن کە بزاڤی حەقە گەڕانەوەیەکی دووبارەیە لەنەقشبەندی‌یەوە، بۆ شێوەی عەلەوی‌یە توندڕەوەکان=ئەهلی حەق=ئال حەق، کە بناغەکەی دەگەڕایەوە بۆ هەمان ری‌و رەسم‌و ئایین‌و نەریتی پەردیوەری‌و دامەزرێنەرانی ئەو ئایینە نوێ‌یەش، بریتی بوون لەبنەماڵەی کوڕانی شێخ عیسای بەرزنجی هەمەدانی‌و لەسەر رەوشی گەڕانەوە بۆ دۆخی سەرەتایی، کە بەگوێرەی کات چەند گۆڕانێك لەپێکهاتەی بنەماکانیدا کرا بوو. بەلام مستەفا عەسکەری نووسیویەتی: زۆربەی لایەنگرانی بزاڤەکە، جوتیارو باخەوان‌و درەوکاری گوندەکان بوون،خودی شێخ عەبدولکەریمش جوتیار

بوو، کە وەك ئەوانی تر لە سەر داهاتی کشتوکاڵ دەژیا، لەبەر ئەوە بەرەو ژیانێکی سۆسیالیستی هەنگاوی دەنا. هەرچەندە لەسەرەتایی بزاڤەکە، کەسانی هوشیاری زۆریان لەگەڵدا بوو، بەڵام خەڵکی خوێندەواریان لەناودا کەم بوو و بەجۆرێك توانای پێشکەوتنی خێرای بزاڤەکە لەئارادا نەبوو، هەر بۆیە بزاڤەکە بەشێکی تەمەنی خۆی لەمشتومڕو راگۆڕینەوە خەرج کردو پاشان کەوتە ژێر ئەشکەنجەو ئازارو گوشاری سیاسی و سەربازیی حکومەتی عیراقەوە، جگە لەوەی ژمارەیەکیان دووچاری زیندان و دوورخستنەوەو دەرکردن لەناوچەکە بوون، بزاڤەکە نەیتوانی بەرنامەکەی خۆی بەگوێرەی خواستو ئامانجی کۆتایی رێك بخاو پەیڕەوێکی ناوخۆی رێكو پێك بنووسێتەوە(؟!!) بەجۆرێ هەموان ئاگاداری ئامانجەکانی بزاڤەکە بن، هەروەها بزاڤەکە یەکێتی و هاوکاری و ئاشتی کردبووە دروشمی خۆی. لە لێکدانەوەیەکی گشتیدا، بزاڤەکە، وەك بزاڤێکی نیمچە سۆسیالیستی کاڵوکرچ دێتە پێش چاو، چونکە وەك باسکرا، بنەما سەرەکی یەکانی بزاڤەکە داوای نەهێشتنی جیاوازیی چینایەتی نێوان دەوڵەمەندو هەژار، شێخ و مسکێن، دەرەبەگ و جوتیار دەکردو بەتوندی دژی ئەو ناکۆکی یە کۆمەڵایەتییانە بوو. لەو سۆنگەیەوە باوەڕیان وابوو کە چینە چەوساوەو زەحمەتکێشەکان، دەبێ لەدەوری یەك کۆببنەوەو یەکبگرن و هەوڵ بدەن هیچ هەژارێکیان تێدا نەمێنێ و یارو غەمخۆری یەکبن، بەتایبەتی بەرامبەر بەتوێژی زەحمەتکێشی ناو پەیڕەوانی بزاڤەکە. بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش، حەقە چەندین قوربانیدا، لەوانە حسێن کوێرەکانی و مام سالح گۆمەشینی، جگە لەوەی پەیڕەوانی بزاڤەکە دووچاری ئەشکەنجەو زیندان و ئازاری زۆر بوون، بێئەوەی روو لەبیروباوەڕی خۆیان وەرگێڕن.

لە بۆچوونەکانی خۆیدا محەمەدی مەلا کەریم سەبارەت بە ئەنگێزەی یەکگرتنی چینی چەوساوەی ناو بزاڤەکەوە نووسیویەتی کە ئەگەر بەو جۆرە بێ، ئەوە نیشانەی پلەیەکی بالآیی هۆشیاری‌یە، بەلآم نە مستەفا عەسکەری بەلگەیەکی بۆ سەلماندنی ئەو قسەیە خستۆتە روو، نە منیش(محەمەد مەلا کەریم) نیشانەیەکی ئەو بۆچوونە بەدی دەکەم. (هەرچۆنێ بێ، دەبێ بزانین کە بزاڤی حەقە، جگە لەدووبارە گەڕانەوە لەتەریقەتی نەقشبەندی‌یەوە بۆ ئاینی پێشڕەوی عەلەوی‌یە توندڕەوەکان=ئەهلی حەق=ئال حەق، بەرێبەری نەوەکانی شێخ عیسای بەرزنجی هەمەدانی، شتێکی تر نەبووەو نی‌یە، ئەگەرچی لەو ماوەیەی گەڕانەوەکەدا، پەیوەندیی خۆی لەگەڵ رابردوو بچڕاندو خالێکی دەستپێکردنی تری بۆ خۆی هەلبژارد).

## بزاڤی حەقەو ریشە ئاینی‌یەکانی

زۆربەی پەیڕەوانی حەقە، ئەحکامە شەرعی‌یەکانیان پەکخستبوو. هەروەها زۆربەیان ئەرکەو فەرزەکانی خۆیان تەرك کردبوو. بۆیە خەلکی ناوچەکە ئەو رەفتارەیان بەنیشانەیەکی خوانەناسی پەیڕەوانی ئەو بزاڤە لەقەلەم دەدا. بەلآم لەراستیدا پەیڕەوانی حەقە خوانەناس نەبوون، بەلکو باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرو قورئان‌و فەرمانە شەرعیەکان، زۆر پتەو بوو، تەنانەت شێوازو بیرکردنەوەی خۆیان بەخواپەرستی راستەقینەو حەق پەرستی راستەقینە دادەنا. هەروەها لە لێدوان‌و بڕەودان‌و پڕوپاگەندەی شێخ عەبدولکەریم‌و مامە رەزاشدا هەرگیز ئاماژە بۆ رەتکردنەوەی ئەحکام نابینرێ، جگە لەوە موریدەکانی شێخ عەبدولکەریم لەتەریقەتی نەقشبەندیدا، بەراشکاوی شەریعەتیان بەرقەرار دەکردو تەنها گروپی(برا

سەیار) فەرزەکانیان جێبەجێ نەدەکرد، ئەوەیش پەیوەندیی بەحاڵەتی ناثاسایی بوونو جەزبەی ئەو (برا سەیار)انەوە هەبوو، بەجۆرێك نەك تەنها فەرزەکان، بەڵکو ڕێو ڕەسمی تاکو کۆمەڵایەتی وەك کارو کشتوکاڵ خێزانو ژیانیشیان واز لێهێنا بوو و تەنها سەرگەرمی بڵاوکردنەوەی حەقە بوون. خەڵکی بەو (برا سەیار)انەیان دەوت شێت. لەماوەی ڕێبەری کردنی مامە ڕەزادا، زۆربەی پەیڕەوانی ئەهلی حەقو موریدەکان لەسەر ئەنجامدانی ئەحکامی تاکەکی سوور بوون، تەنانەت خودی مامەڕەزا، لەکاتی نوێژی بەیانیداو لەسەر بەڕماڵی نوێژکردندا، دووچاری نەخۆشی مەرگ بوو.

## دەستگیرکردنی مامە ڕەزاو کاردانەوەی پەیڕەوان

مامەڕەزا توانی زیاتر بنەماکانی بزاڤی حەقە برەو پێبداو و بایەخ بەپەیوەندیی و مەسەلە کۆمەڵایەتی‌یەکان بدا، لەبەرامبەردا ژمارەیەکی فراوانی خەڵك‌و دانیشتوانی ئەو ناوچانەی پڕوپاگەندەیان تێدا دەکرا، پەیوەندییان بەبزاڤی حەقەوە کردو ئەرك‌و ڕێ‌و ڕەسم‌و نەریتی بزاڤەکەیان پەسەند کرد. تەکیەو خانەقاکان، کە یەکەمیان تایبەت بە پەیڕەوانی بزاڤەکەو دووەمیان شوێنی کۆبوونەوەی نەقشبەندییان بوو، زۆر پەرەیان سەندو لەهەموو شوێنێك هەر باسی حەقە بوو.

وا ڕێکەوت هاوکات لەگەڵ بەلوتکە گەیشتنی بزاڤی حەقەدا، ساڵی ١٩٤٣ی‌ز =١٣٢٢ی کۆچی هەتاویدا، شۆڕشی بارزان دەستی پێکرد، لەو ماوەیەدا حکومەتی عیراق لە بزاڤی حەقە کەوتبوە ترسەوە، بۆیە لەساڵی ١٩٤٤ی‌ز =١٣٢٣ی کۆچی لە کردەوەیەکی غافڵگیرانەدا، مامەڕەزای دەستگیر کردو دووری خستەوە. لەکاتی دەستگیرکردنیدا، مامەڕەزا تەنیا فریایی ئەوە کەوت کە پەیامێکی سەرزارەکی بداتە پەیڕەوانی بزاڤەکە، کە بەهۆی خزمە نزیکەکانی خۆیەوە، جاڕی بۆ دراو ڕاگەیەندرا. پاش دەستگیرکردنی مامەڕەزا، سەرجەم پەیڕەوکاران پێکەوە بەرەو ناوەندە حکومییە بەرپرسەکانی کەرکوك کەوتنەڕێ‌و بڕیاریان دا تا گێڕانەوەو ئازادکردنی مامەڕەزا، دەست لەهەوڵەکانیان هەڵنەگرن. سەرئەنجام حکومەت ناچار بوو مامەڕەزا ئازاد بکاو بگەڕێتەوە بۆ کلکە سماق.

کلکە سماق، لە پاش شەدەڵە گەورەترین تەکیەی بزاڤەکەی لێبوو، ئەم گوندەش دەکەوێتە دەوروبەری ناوچەی میرزا ڕۆستەمی سەر بە ناحیەی

رانیەو سەر به هەولێر بوو. سەعید قەزازی موتەسەرفی ئەو کاتی هەولێر، هاتە ناوچەی دوکان و بانگێشتی مامەرەزای بۆ دیدارێکی دوو قۆڵی کرد. کەچی یەکسەر لەگەڵ گەیشتنی مامە رەزا، سەعید قەزاز بێدواکەوتن مامە رەزای دەستگیر کردو بە ئۆتۆمبیلە تایبەتی‌یەکەی خۆی، لەو ناوچەیە دەری کردو دەست بەجێ رەوانەی عیمارەی کرد.

هەر کە پەیڕەوان ئاگادار کرانەوە مامەرەزا دەستگیرکراوە، سەرجەم حەقەی ناوچەکە، پێکەوە دەستیان کرد بە فرۆشتنی ماڵ و گوزەران و کێڵگەکانیان و بەرەو ناحیەی ئاغجەلەر کەوتنە رێ. لەرێگا لە گۆپتەپە بۆ ماوەیەکی کورت وەستان، تا هەموان کۆببنەوە، ئنجا پێکەوە بەرەو شوان کەوتنە رێ، تا لەوێوە بەرەو کەرکوک بڕۆن. لەنزیك گوندی حاجی بەیخانی ناوچەی شوان، هێزەکانی حکومەتی عیراق رێیان لەپەیڕەوان گرت و نەیانهێشت بەرەو کەرکوك بڕۆن، جگە لەوە کاکەرەزای کوڕی کاکە عەلی عەسکەری و دوانزە کەسی تریان لێ‌دەستگیر کردن و رەوانەی کەرکوك کران. پێشتریش شێخ محەمەد ئەمینی مەلحەی یارمەتی دەرو راوێژکاری مامە رەزاو شێخ مستەفای کوڕی مامەرەزا، لەناوچەی میرزا رۆستەم دەستگیر کرابوون و رەوانەی ناحیەی رانیە کرا بوون.

لەو رێپێوانە دوورو درێژەدا، جگە لەرێگرتن، هێزەکانی حکومەت بەدوای کۆڕوکۆبوونەوەی بەشداربوانی رێپێوانەکەشدا دەگەڕان و بەچەندین رەوش و شێوازی جیاجیا، ئازارو ئەشکەنجەو هەڕەشەیان لێدەکردن، بەڵام پەیڕەوان سووربوون لەسەر درێژەدان بە رێپێوانەکەو خۆیان گەیاندە گوندی یاروەلی. لەو سەروبەندەدا کاربەدەستانی حکومەت بۆ چۆنێتی رێگرتن لەتەنینەوەی رێپێوانەکە، کەوتنە راوێژکردن، چونکە بەشداربوانی

ڕێپێوانەکە پیاوو ژن و منداڵ و پیرو گەنجی تێدابوو، ژمارەیان زۆر بوو و ئەگەر بەو شێوەیە بەربلاوە، خۆیان بکەن بە شاردا، دەبێتە مایەی شەرمەزاریی حکومەت، بۆیە کاربەدەستانی حکومەت بە ناچاری کەوتنە دانوستاندن لە گەڵ بەشداربوانی ڕێپێوانەکە. بۆ ئەو مەبەستەش پەیڕەوان لەسەربازگەیەکی مەشقی هاوینەی چۆڵکراوی نزیك گوندی یاروەلیدا بە شێوەیەکی کاتی جێگیرکران و پارێزگاری هەر سێ پارێزگای هەولێرو کەرکوك و سلێمانی و فەرماندەکانی پۆلیسی ئەو پارێزگایانە، لە شوێنی ناوبراودا، کەوتنە دانوستاندن لەگەڵ بەشداربوانی ڕێپێوانەکەدا. لەبەرئەوەی حکومەت هیچ بەڵگەیەکی بۆ تاوانبارکردنی دەسگیرکراوەکان بە دەستەوە نەبوو، ڕەوتی دانوستاندنەکە چ لەدادگاکان و چ لەو سەربازگە چۆڵکراوەدا بە جیددی بەڕێوە دەچوو. ئەگەرچی حکومەت هەمیشە هەوڵی دەدا پەیڕەوان بخەڵەتێنێ و کۆتایی بەڕێپێوانەکە بهێنێ، بۆیە گوێی لەداواکاری و بۆچوونەکانیان دەگرت و بەڵێنی جێبەجێ کردنی دەدا، کەچی بەکردەوە، هەنگاوی ئیجابی بۆ نەدەنا. ماوەیەکی زۆر تێپەڕی و وەرزی پایز هات، کەش و هەوا ساردی کردو نەخۆشی دەستی بە بلاوبوونەوە لەناو سەربازگەکەدا کردو بەو هۆیەوە ژمارەیەك پیاوی پیرو منداڵ گیانیان لەدەست داو تەرمەکانیان هەر لەو سەربازگەیەدا بە خاك سپێردرا. لەئەنجامدا پەیڕەوانی حەقە کۆبوونەوەیەکی فراوانیان لە سەربازگەکەدا کردو لەبڕیارنامەیەکدا ڕایانگەیاند کە گوێ بە بەڵێنەکانی حکومەتی عیراق نادەن و درێژە بە ڕێپێوانەکەیان بەرەو کەرکوك دەدەن. کاربەدەستانی حکومەت هەر کە ئاگاداری ئەو جموجۆڵەی پەیڕەوانی حەقە بوون، چەندین یەکەی چەکداریان بۆ ڕێگرتن لەڕێپێوانەکە ڕەوانەی ناوچەکە کردو

فەرماندە سەربازی‌یەکان، جگە لەبەستنی ڕێگا، هەڕەشەیان کرد کە ئەگەر پاشەکەشە نەکەن، ئەوا دەدرێنە بەر دەسڕێژی گوللە. بەڵام بەشداربوانی ڕێپێوانەکە بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی ئەو هەڕەشانە ڕایانگەیاند کە ئێمە نامانەوێ بە چەك و توندوتیژی وەڵامی هەنگاوەکانی حکومەت بدەینەوەو ئامانجی ئێمە تەنها ناڕەزایی دەربڕینە، بەرامبەر بە دەستگیرکردنی سەرانی بزاڤەکە. هەروەها پەیڕەوانی بزاڤەکە ڕاشکاوانە ڕایانگەیاند کە تا دواکەسیان دەکوژرێ، پاشەکشە ناکەن و حکومەتیش ئازادە هەر شێوازێك بگرێتە بەر. ئنجا ڕێپێوانەکە درێژەی کێشا وگەیشتنە سەر ڕێگای هەولێرو دواتر چوونە ناو شاری کەرکوکەوە، لەنزیك ماڵی پارێزگار بارەگەیان خست، سەرجەم دانشتوانی کەرکوك ئاگاداری ڕێپێوانەکە بوون و لەنزیکەوە چاودێرییان دەکرد، جگە لەوە زۆربەی پیاوە گەورەکانی شارو ناودارانی بواری زانست و ئەدەب، بەنهێنی ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاری کردنی پەیڕەوانی حەقە دەربڕی و یارمەتیان پێشکەش کردن و گفتوگۆیان لەگەڵ سەرانی ڕێپێوانەکە، بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی هەڵوێستی حکومەت کرد. پاش چەند ڕۆژێ، حکومەت لەرووی ناچارییەوەو بۆ بڵاوە پێکردنی مانگرتوەکان و بۆ شاردنەوەی ڕێپپوانەکە لەچاوی دانیشتوانی کەرکوك، هەروەها بە بیانووی سەرما و سۆڵەوە، ژمارەیەك خێزانی بەشدار بووی ڕێپێوانەکەی لەچەند خانوویەکی چۆڵی گەڕەکی زێویەی پشت چایخانەی یادگار، لەسەر ڕێگای کۆنی سلێمانی جێگیر کردو ئەوانی تریشی لەناوچە جیاجیاکانی شارەکەداو لەچەند خانوویەکدا جێگیرکردو دووبارە دانوستاندن لە نێوان کاربەدەستانی حکومەت و نوێنەرانی ڕێپێوانەکەی پەیڕەوانی حەقەدا دەستی پێکردەوە. بەڵام ئەم جارە وا دیار بوو حکومەت دەیویست چەند

داواکاری‌یەکی مانگرتوان، بەتایبەتی ئازادکردنی دەستگیراوەکان بێنێتەدی، بۆیە سەرەنجام بە هەماهەنگی هەردوولا ئەم هەنگاوانە نرا:

١- مامەرەزا دەگەڕێتەوە سلێمانی و دوابەدوای ئەویش سەرجەم بەشداربوانی ڕێپێوانەکە دەگەڕێنەوە جێگا و ڕێگای خۆیان لە کلکەسماق.

٢- سەرجەم دەستگیرکراوەکانی حەقە ئازاد دەکرێن، چونکە جگە لەو کەسانەی پێشتر ناویان برا، هەموو ئەو پەیڕەوکارانەی حەقەش کە خزمەتی سەربازی‌یان ئەنجام دەدا، دەستگیرکرابوون و لەزینداندا بوون.

٣- حکومەت قەرەبووی ئەو زیانانە دەکات کە بەمانگرتوان و سەرکردەکانیان کەوتووە.

٤- گەڕەکێك لەناوچەی ئاغجەلەر یان بتوێن بۆ نیشتەجێبوونی پەیڕەوانی حەقە دیاری بکرێ و بۆ ئەو مەبەستە، بینا و قوتابخانە و بنکەی تەندروستی لەو شوێنەدا دروست بکرێ و زەوی کشتوکاڵییان بەسەردا دابەش بکرێ.

٥- مانگرتوان بگەڕێنەوە ناوچەی شوان، تا بوار بۆ حکومەت بڕەخسێ، ئەو خاڵانەی سەرەوە جێبەجێ بکا.

پاش مۆرکردنی ئەو ڕێکەوتننامەیە، لەلایەن نوێنەرانی هەردوولا، مامە سەلامی برای مامەرەزا بۆ دیداری مامەرەزا ڕەوانەی عیمارە کرا، تا لەنزیکەوە بەندەکانی ڕێکەوتننامەکەی پێ ڕابگەیەنێ و هەڵوێستی بۆ نوێنەرانی حکومەت و پەیڕەوە مانگرتووەکانی خۆی بهێنێ. بۆ گەڕانەوەی ئەو نوێنەرەی حەقە لەعیمارە، سێ ڕۆژ مۆڵەت بەمانگرتوان درا لەناو کەرکوکدا بمێننەوە، بەڵام مامە سەلام نەیتوانی لەو مۆڵەتە سێ ڕۆژیەدا پەیامێك بۆ مانگرتوان بهێنێتەوە، بۆیە نیگەرانی و ساردی کەوتە دڵی

مانگرتوان و ژمارەیەکیان بەسەرپەرشتی کاکە رەزای کوڕی عەلی عەسکەری چووە رێدار لەناوچەی شوان، کەچی ئەوانی تر باوەڕیان بەو چوونە نەبوو و دەیانوت: حکومەتی عیراق دەیەوێ فریومان بداو تا کاتێ مامە رەزا ئازاد نەکرێ، لەکەرکوك دەرناچین. بەڵام پاشان مامە سەلام گەڕایەوە و پەیامی مامە رەزای دەربارەی رازی بوون لەسەر رێکەوتنەکە پێڕاگەیاندن، ئنجا ئەوانیش یەك دەستە گەڕانەوە بۆ لای هاوبیرەکانیان، لەناوچەی شوان و لەو گوندانەی ناوچەکەدا بڵاوبونەوە. پاشان سێ رۆژ مۆڵەت بە مامە رەزا درا تا بگەڕێتەوە سلێمانی و پاش ماوەیەك رەوانەی هەڵەبجە کراو دواجار رەوانەی بیارە کرا. حکومەتی عیراق ئەو نیگەرانی و ساردبوونەوەی ناو مانگرتوانی قۆزتەوە و کردییە بیانوویەك بۆ خۆدزینەوە لەجێبەجێکردنی بەندەکانی تری رێکەوتنەکە و تەنها بەندی تایبەت بە ئازاد کردنی مامەرەزا و دەستگیرکراوەکانی تری جێبەجێکرد. بۆیە مانگرتوان بەناچاری و لەوپەڕی تەنگدەستی و نەداریدا، گەڕانەوە جێگاوماڵی خۆیان و ژیانیان لەهیچەوە دەست پێکردەوە، چونکە ئەو بەشداربوانەی رێپێوانەکە، هەموو شتێکی خۆیان لەماڵ و منداڵ و موڵك لەدەست دابوو، تەنانەت ژمارەیەکیان نانی وشکیشیان نەبوو. بەڵام ئەو ژمارە کەمەی پەیڕەوان کە هەندێ شتیان بۆ مابووەوە، دەستی نەدارەکانیان گرت و وردە وردە ژیانیان گۆڕاو بەهۆی کاسبی و خۆماندووکردنەوە، زۆری نەخایەند دووبارە هەلومەرجی ژیانی پێشوتریان بەدەست هێنایەوە و بوون بەخاوەن زەوی و مەڕومالآت و خانووی خۆیان. هەروەها لەبەرئەوەی خەڵکانێکی سەر راست و پاك بوون، خەڵکی ناوچەکەش لەبەر ئەو لایەنە ئیجابییە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی یانە، زۆر هاوکارییان کردن. پاش گوزەراندنی ئەو مەینەتی و

ئازارو نارەحەتی‌یانە، کۆمەڵی پەیڕەوانی حەقە دووچاری گۆشەگیرییەکی قووڵ بوون، بەڵام پەیڕەوانی حەقە ئەو گۆشەگیری‌یە کاری تێنەکردن‌و بەهیچ کلۆجێ گۆڕانیان لەبەرنامەی خۆیاندا دروست نەکرد، بەڵکو دیسانەوە دەستیان بەدروستکردن‌و ئاوەدانکردنەوەی خانەقاو تەکیەکان کردەوەو لەماوەیەکی کورتدا، توانیان بارودۆخی پێش مانگرتنەکە بەشێوەیەکی گشتی بەدەست بهێننەوە. ڕێپێوانی مانگرتوانی حەقە (بە چوون‌و گەڕانەوە) سێ مانگی خایەندو تەنها لەیارەوەڵی ٢٥ڕۆژ وەستان، واتە ڕێپێوانەکە لەمانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٤=١٣٢٨ی کۆچی هەتاوی دەستی پێکردو لەمانگی کانونی یەکەمدا کۆتایی هات. لەماوەی ئەو سێ مانگەدا، مامە ڕەزا لەناوچەکەدا نەبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٩-١٣٢٨ی حکومەتی عیراق‌و نوێنەری سیاسی‌ی ئینگلیزەکان، ڕێگایان پێدا بگەڕێتەوە کلکەسماق بەو مەرجەی لەژێر چاودێریدا بێ‌و بێ‌ئاگاداری کاربەدەستانی حکومەت لەناوچەکە دەرنەچێ، بۆلەوە لەساڵی ١٩٥٢=١٣٣٠-ی پاش چەندین ساڵ سنووردارکردن، بۆ یەکەمین چار مۆڵەت بە مامە ڕەزا درا، سەردانی پەیڕەوانی خۆی لەناوچەی سورداش بکا.

(لێرەدا ئاماژەیەك بۆ ڕاپۆرتی ئەدمۆندزی ڕاوێژکاری وەزارەتی بەریتانیا دەکەم دەربارەی ئەو بەدگومانییە قووڵەی، بەرامبەر هەموو ئەو کەسانە هەیبووە کەدژی ڕەوتی کۆلۆنیالیزمیانەی بەریتانیا لەکوردستان دەجوڵانەوە، بەتایبەتی دەربارەی سەرەتاو دەرئەنجامی بزاڤی حەقە. لەو بارەیەوە، ئەدمۆندز نووسیویەتی کە نەقشبەندییەکانی کوردستان (گوندنشینەکان، بە تایبەتی گوندە دوورە دەستەکان، نەك ڕووناکبیری شارەکان) بەزۆری کاری سەیرو سەمەرەیان دەنواند. من گومانم لەوەدا

نی‌یە کە ئەو مەیل‌و داب‌ونەریت بەزاندنەکە بۆ ماوەیەکی زۆر لەو گوندە کوێستان‌و دوور دەستانەی سنووری سورداش‌و مەرگە، کە پەیوەندیی‌یان بە جیهانی دەرەوە نەبوو و کەمتر رووبەرووی بەرپرسانی حکومەت دەبوون، مەیلێکی خۆماڵی بوو. بەڵام پاش چەندین ساڵ، واتە لەساڵی ١٩٣٢=١٣١- ی کۆچی هەتاوی بۆ یەکەمین جار ئاگاداری ئەو رەوتە بووم. ژمارەیەك جەندرمە، کە بۆ کاری تەبلیغ کردن چووبوونە گوندی هەڵەدنی مەلیك شێخ مەحمود، لەچوار میلی سەرگەڵو، لەکاتی گەڕانەوە راپۆرتێکیان دەربارەی ئەو شتانەی بینیبویان نووسیبوو). کاربەدەستانی پارێزگاکە سەرەتا لەدروستی ناوەڕۆکی راپۆرتەکە دڵنیا نەبوون، بەڵام پاش ئەوەی ژمارەیەك بازرگانی جێ‌متمانەی تووتن، جگە لەوەی چەند دیاردەیەکی لەو جۆرەیان لەسەرگەڵو بینی‌بوو، سکاڵایەکیشان تۆمار کردبوو کە گوایە لەکاتێکدا بەرهەڵستی ئەو کەسانەیان کردووە، کوتەکیان خواردوە، تەنانەت لێکۆڵینەوەکان لەچیرۆکێکی سەیرەوە دەستی پێکرد: شێخ عەبدولکەریم ناوێ، دانیشتووی شەدەڵەیە نزیك سەرگەڵو کە یەکێك بوو لەخزمەکانی حاجی شێخ عارف‌و تەریقەتێکی بەناوی تەریقەتی حەقەوە داناوە یا ژیاندۆتەوە. تەریقەتەکەی لەسەر ئەم دەقی (رقصە الصوفیە)و دانرابوو، ونووسینی یەکێك لەباوباپیرانی دانرابوو. خودی حاجی (شێخ عارف) وەك کەسایەتییەکی گرنگی ناوچەکە، کە چەند بەرپرسێتی‌یەکێشی بەرامبەر بەحکومەت لەئەستۆدا بوو، بە وریاییەوە خۆی لەپشت رەوتەکە حەشار دابوو.

ئەو تەریقەتە نهێنی‌یە، زۆربەی بنەماو سلوکەکانی لابرد بوو(...) پاش رووداوێك کە تیایدا ژمارەیەك سۆفی حاڵ لێهاتوو هەڵیان کوتابووە سەر

مزگــەوتی ســەرگەڵوو(...) یــان ســووتاندبوو، شــێخەکان بانگکرانــە سلێمانی وداوای ڕوونکردنەوەیان لێکرا. شێخەکانیش لەوەڵامدا وتیان ئێمە ئەو ڕەفتارەو ڕەفتاری لەو جۆرە ڕسوا دەکەین، بەڵام ئەگەر موریدێك لەکاتی حاڵ لێهاتنداو بێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێ، بەشێوەیەکی کاتی کارێکی پێچەوانەی مەزهەبو ئەخلاق ئەنجام بدات، ئەوا گلەیی لێ ناکرێو پاساوی خۆی هەیەو بەو جۆرە کەوتنە هەڵوێستی بەرگریکردنەوە. ئەگەرچی من ناتوانم دروستی ئەو قسانەی سەرەوە بسەلمێنم، بەڵام گومانی تێدا نی‌یە کە ئەو ڕاپۆرتانە ڕاست نەبوون.. و بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەسەر یەك، ناو بەناو زەنگی مەترسی لێدەدرا کە گوایە مەزهەبی حەقە پەیڕەوانی تازەی پەیدا کردوەو دزەی کردۆتە هەناوی ناوچە هاوسنووریەکانەوە.

لەئابی ١٩٣٦شەهریوەری ١٣١٥=جەمادی دووەمی ١٣٥٤، واتا کاتێ کە مەزهەبی هەقە لەجۆش‌و خرۆش کەوتبوو، شەوێکیان میوانی شێخ عەبدولکەریم بووم لەشەدەڵە. گوندی شەدەڵە دەکەوێتە دۆڵێکی تەنگەبەری بەشی سەرووی ڕووباری تابین، لەنێوان چەرمەبان* و پیرەمەگروون. گومانی تێدا نی‌یە کە شێخە گەورەکان، لەهەڵبژاردنی هەڵکەوتی گونددا، لەڕووی سەربازی‌و سروشتی جوانی ناوچەکەوە، زەوق‌و سەلیقەیەکی باشیان هەبووە، لەو سۆنگەیەوە شێخ عەبدولکەریم بێ‌هاوتا بووە، چونکە تەکیەکەی لەشوێنێکی بڵندو دامێنی چیایەکدا دروست کردبوو، کە لەلای ڕۆژئاوایەوە، کۆتایی بەریزێ داری سپیدار دەهات‌و هێندەی تر سروشتی دۆڵەکەی جوانتر کردبوو، بەتایبەتی کاتێ ئەو سروشتە جوانە تێکەڵ بەفەرشی جوانی ئێران دەبوو، ئەو فەرشانە بۆ پێشوازی کردن‌و لە لێواری

* دیارە نوسەر مەبەستی گوندی (چەرمەگا)یە (وەرگێر)

سـەرەوەی حـەوزێکی بـەردینی گـەورەدا ڕاخرابـوون و جۆگایـەکی ئـاوی چیاکانی تـێدەڕژا. سپێتی بێگەردی عەمامەو عەبای خانە خوێ یەکـەم، لەگەڵ ریشە رەش و درێژەکەی کە دیار بوو تازە بۆیەکراوە، جیاوازی‌یەکی زۆریان هەبوو. شێخ بەهەمان شێوازی باوەڕدارە بێگەردەکان بە نازەوە قسەی دەکردو بەروالەت حەق لەکەسی تر لەو نزیکتر نەبوو، بەڵام ئەو روناکی‌یە شادی بەخشەی، خۆی لەقوڵایی چاوەکانیدا حەشار دابوو، لەگەڵ ئەو جێدانەی شەوێلگەی(فك) خوارووی دەمی، دوو سیمای بەتەواوی جیاوازی دابووە روخساری. قسەکانی بەدەر لەحیکمەتی دنیایی نەبوون. من لەکاتێکدا لەو دامێنەی تری دۆڵەکە دانیشتبووم کە رەزو مێو پۆشیبووی، دەمڕوانی‌یە پیرەمەگرون و هەرچیم دەکرد ئەوەم پێ‌قبوڵ نەدەکرا کە ئەم کەسە هەمان ئەو ئیمامو پێشەوا داهێنراوە(بدعتی)بێ کە تا پێش چەند مانگێ، حکومەتی نیگەران کردبوو. لەساڵی ١٩٤٤ز=١٣٢٣ی کۆچی هەتاوی، واتە لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا، پێشهاتێکی ناخۆش لەناوچەکەدا ڕوویدا: پارێزگاری گەنج، بەڵام زۆر لێهاتووی هەولێر سەعید قەزاز بێ ئاگاداركردنەوەی بەغداو بێراوێژکردن لەگەڵ هاوکارانی خۆی لەکەرکوك و سلێمانی، کە زیاتر پەیڕەوانی حەقەیان تێدا دەژیا، لەناکاو مامە رەزای جێگری شێخ عەبدولکەریم، کە لەگوندی کلکلە سماق دەژیا، دەستگیرکردو رەوانەی ئۆردوگای گیراوە سیاسی‌یەکانی عیمارەی کرد. لەئەنجامی ئەو هەنگاوەدا، بە سەدان کەس لەپەیڕەوان بەژن و منداڵەوە، گوندەکانی خۆیان چۆڵکردو بۆ گەیشتن بەمورشدی دوورخراوەیان، دەستیان بە ڕێپێوانێکی ٥٠٠میلی کرد. حکومەت زۆر بەزەحمەت توانی ڕێپێوانەکە لەکەرکوك ڕاگرێ و سەرباری ناخۆشی و ئازارو

مەینەتی زۆر، دەستیان لەڕێپێوانەکە هەڵنەگرت، تا سەرەنجام مامە رەزا هێنرایەوە سلێمانی کە شوێنێکی لەبارتر بوو بۆ زیارەت و دەست ماچ کردنی شێخ و پەیڕەوان بەئاسانی سەردانیان دەکرد. پاش گەڕانەوەی بۆ سلێمانی، مامە رەزام بینی، پیرەمێردێکی ئارام و لەسەرخۆبوو. ئەگەرچی بواری رەخنە لەتەریقەتەکەی هەبوو، بەڵام خودی مامە رەزا، بەهیچ کلۆجێ مایەی مەترسی بۆ حکومەت نەبوو.(س.ج. ئەدموندز.کردها، ترکها، عربها، ترجمە یونسی بانە، ص٢٢٤-٢٢٦) ژمارەی مانگرتوانی حەقە تەنها لەسەربازگەی یاروەلی نزیك کەرکوك بە ١٢هەزار کەس لەقەڵەم دراوە. هەروەها ڕێپێوانەکە ئاشتیخوازانە و بێبەکارهێنانی، هیچ جۆرە چەکێك بەرپاکرا. شایانی باسە هەموو یەکێك لەبەشداربوانی ڕێپێوانەکە، تەنها دارێکی سووری جۆری ئاڵ و باڵوی کێوی، یان چوالەی کێوی بەدەستەوە بوو، هەر لەبەر ئەوەش دوژمنانی بزاڤەکە نازناوی(دارەقوڵە) یان بە سەردا بڕیبوو.

## مردنی مامە ڕەزاو بەردەوامی بزاڤی حەقە

### ڕۆژی ۱۹۵۳/٦/۳۰=۱۳۳۲ی کۆچی هەتاوی-۱۳۷۲ی کۆچی مانگی

مامەڕەزا لەگوندی کلکلەسماق لەناکاو نەخۆش کەوت و بەهۆی سەکتەوە ئیفلیج بوو. ماوەیەکی دووروودرێژ خرایە ژێر چارەسەکردنەوەو سەرەنجام توانی لەگەڵ پەرستارو یارمەتیدەرێك، بەدار بڕوا. نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا تا لەڕۆژی ۱۹٦۱/۲/۲٥=۱۳٤۰ی کۆچی هەتاوی. لەسلێمانی کۆچی دوایی کردو کاکە حەمەی کوڕی جێگای گرتەوە (بڕوانە: نگاهی دوبارە بە جنبش حقە، مصطفی عسکری، با مقدمەو حواشی و تصحیح محمد ملا کریمو...،۱۸۹۳ بغداد). ئەگەرچی بەهۆی ساردبوونەوەو دابڕانی چەند سەد ساڵەوە، بزاڤی حەقە سەربەخۆییەکی پێکهاتەیی لەگەڵ بنەما و ڕێ و ڕەسمی دێرینی عەلوییە توندڕەوەکان=ئەهل حەق=ئال حەق پەیدا کرد، بەڵام وەرگیراوو ژیاندنەوەی ئاینی پەردیوەرییەو پەیوەندییەکی ریشەیی و مێژوویی و پتەوی لەگەڵ مەکتەبی سوڵتان ئیسحاقدا هەیە. هاوکات لەگەڵ بزاڤی حەقەدا، لەنێوان ئەهلی حەقە=ئال حەقی ئێرانیشدا بزاڤێکی هاوشێوە دەستی پێکرد کە زۆر ڕووی هاوبەشی دەروونی و ریشەیی لەگەڵ حەقەدا هەبوو، کە لەجێگایەکی تردا لەوێش دەکۆڵینەوە.

# ڕاپەڕین و بزاڤی عەلەوییەکانی دەرسیم لەتورکیا
# ساڵی ١٣١٥ی کۆچی هەتاوی ١٩٣٦ز

ناوچەی دەرسیمی تورکیا زێدی عەلەوییە توندڕەوەکان= ئەهلی حەق= ئال حەقەیە. ئەتاتورك پاش دەرکردنی یاسا عیلمانییەکان و گۆڕینی خەتی باوو ئاسایی دێرینی ناوچەکە بۆ خەتی لاتین و ئەولەویەت دان بەنەژادی زۆرینەو هەوڵدان بۆ لەناوبردنی کەلتووری ئەو کەمینانەی لەپانتایی جوگرافی تورکیادا، بەدرێژایی چەندین سەدە لەگەڵ خوشك و براکانیان بەشداری پێشخستنی ئەو سەر زەمینەیان کردبوو، ڕۆڵی گرنگ و کاریگەریان هەبوو، کەواتە دژایەتیکردن و سەرکوتکردنی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، یەکەمین بەرپەرچدانەوەی هەنگاوەکانی ئەتاتورك و دیکتاتۆرییەتی عیلمانی لەهەناوی عەلەوییەکانەوە سەری هەڵدا. ئەتاتورك بەبیانووی ڕەتکردنەوەی داواکارییەکانی لەلایەن دانیشتوانی دەرسیمەوە، لەساڵی ١٩٣٦ (١٣١٥ی کۆچی هەتاوی) لەشکری ڕەوانەی ناوچەکە کردو ناوی دێرینی ناوچەکەشی لەدەرسیمەوە گۆڕی بۆ تۆنجەلی.

ئەو کات سەید ڕەزا کوردی عەلەوی سەرۆکایەتی ڕاپەڕینە مەزهەبییەکەی دەرسیمی دەکردو لەپەیامێکدا، لەشکری پەلاماردەری تورکی لەئاکامی هێرشی نایاسایی و زۆردارانە بۆ سەر خەڵکی ڕەش و ڕووت ئاگادارکردەوەو داوای لەسەرکردەکانی سوپای تورك، لەوانە جەنەڕاڵ ئالپ دوگان کرد تا بەبڕیارەکەی خۆیاندا بچنەوە.

بەڵام جەنەڕاڵ ئالپ دوگان، نەك تەنها پەیامەکەی سەید ڕەزای کوردی عەلەوی پشت گوێ خست، بەڵکو فەرمانی بۆمبارانی ناوچە شاخاوی و دەشتاییەکانی دەرسیمیشی دەرکرد، پاش ئەوەی سەید ڕەزا لەڕێگای

یاسایی و ئاشتیخوازانەوە لەگەڵ سوپای تورك هیچی بۆ نەکرا، بەناچاری لەگەڵ خێڵەکانی زازا دەستیان دایە چەك و راپەڕینێکی چەکدارانەیان لەدژی سوپای دەستدرێژیکەر رێکخست، پەیڕەوانی سەید رەزا، بۆ بەرگریکردن لەئایین و باوەڕو زێدی خۆیان، کەوتنە خەباتی چەکدارانە، سوپای تورك بۆ دامرکاندنەوەی بزاڤەکە بەکۆرپەیی، دیسانەوە کەوتنە بۆمبارانی سەنگەرو بنکەو شوێنە شاخاوییەکان و گوندو شارۆچکەکان، تەنانەت کێڵگەو رەزو باخەکانیش بۆمباران کران، سوپای داگیرکەر، بەوەشەوە نەوەستاو کەوتە تەقاندنەوەی ئەشکەوتەکانی کێوەکانی دەرسیم، شادڕەوان زنار سلۆپی، کەیەکێ لەکەڵەپیاوانی راپەڕینی عەلەوییەکانی دەرسیم بوو، لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا، نووسیویەتی: لەترسی کردەوە نامرۆڤانەکانی سوپای داگیرکەر، هەزاران ژن و منداڵ و نەخۆش و پیرو پەککەوتە خۆیان لەئەشکەوتەکانی کوتوزی داغ Kutuzikdoxی دۆڵی ئیسکوردا Eyskurحەشاردا بوو، بەڵام سوپای تورك هەر کەشوێنەکانی دەستینشانکرد، بەشێوازێکی زۆر وەحشییانەو نامرۆڤانە، دەرگاو رێگای دەرباز بوونیانی داخست و ئەشکەوت و پەناگاکانیانی تەقاندەوەو سووتاندی، لەکاتێکدا سەرانی سوپا بەباشی دەیانزانی کە ئەو خەڵکانە هەموویان کەسانی مەدەنین، کەچی زۆر دڕندانە بەزیندوویی سوتێنران، حکومەتی ناوەند لەپاساوی ئەوتاوانە گەورەیەداو بۆ چەواشەکردنی رای گشتی، ئەو قەتلوعامەی بەکاردانەوەی شارستانێتی لائیك بەرامبەر بە وەحشیگەری کۆنەپەرستی ناو بردو سەید رەزای کوردی عەلەویی بەپیاوی بێگانەو یەکێتیی سۆڤیت تاوانبار کرد(؟!).

سەید رەزای کوردی عەلەوی، لەپێناو رێکخستن و پێکهێنانی سیستمێکی بەرگری، ئیسماعیل حەقی بەگی کردە فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی بزاڤەکە، تا بەهاوکاری عەلی شێر کاروباری سەربازی ئەنجام بدەن، هەروەها دکتۆر محەمەد نوری دەرسیمی لەساڵی ١٩٣٧ز (١٣١٦ی کۆچی هەتاوی) وەك نوێنەرو وتەبێژی بزاڤی عەلەوییەکانی دەرسیم هەڵبژاردو رەوانەی سوریای کرد، تا بەهۆی دیدارو چاوپێکەوتنەوە، رووداوەکانی دەرسیم بەجیهان رابگەیەنێت. لەو سۆنگەیەوە دکتۆر محەمەد نوری دەرسیمی لەسوریا، بەهاوکاری دکتۆر کامەران بەدرخان سەردانی میسریان کرد تا جیهانی رۆژاوا لەچۆنێتی جموجۆڵی عەلەوییەکان، بەرامبەر بە لەشکری لائیك ئاشکرا بکەن.

ئەتاتورك و حکومەتی ناوەند، کاتێ لەچالاکییەکانی دکتۆر محەمەد نوری دەرسیمی ئاگاداربوونەوە کەهەوڵی سەلماندن و دەرخستنی رەوایی بزاڤی عەلەوییەکان دەداو روخساری دوژمنکارانەی دەستدرێژیکاران ئاشکرا دەکا، کەوتنە پیلان گێڕان و خەڵاتێکی (٤) هەزار سکە ئاڵتونییان بۆ کوشتنی دکتۆر دەرسیمی تەرخانکرد. هەروەها حکومەتی ناوەندی تورکیا، بۆ لەباربردنی هەوڵەکانی دکتۆر دەرسیمی، گوشارێکی دیپلوماسییان خستەسەر جیهانی ئیسلام و ئەوروپاو ئەو گوشارانە بەڕادەیەك کاریگەربوون کە رێکخراوی وڵاتانی یەکگرتوو و جیهانی ئیسلام بێ دەنگییان هەڵبژاردو وەڵامی نامەو داواکارییەکانی دکتۆر دەرسیمییان نەدایەوە.

پاش ئەوەی سەید رەزا لەکۆمەکی جیهان و سەرنج راکێشانیان بۆ ئەو ستەمەی لەعەلەوییەکانی دەرسیم دەکرێ، نا ئومێد بوو، لەڕووی

ناچارییەوە داوای دانوستاندن لەگەڵ حکومەتی ناوەند دەکاو سەید برایمی کوڕی خۆی لە ساڵی ١٩٣٧ دەنێریتە لای جەنەڕاڵ دوگانی، فەرماندەی هێزە سەربازییە پەلامار دەرەکان، بەڵام جەنەڕاڵ دوگان نەك تەنها پێشوازی لەو هەنگاوە نەکرد، بەڵکو داوای خۆبەدەستەوەدانی بێ قەیدو شەرتی هێزە چەکدارەکانی کردو بەپێی ئەو داواکارییە دەبوایە ٨ هەزار چەك تەسلیم بەلەشکری تورك بکرێ. (لەهەندێ یادداشتدا، ٨٠هەزار چەك نووسراوە).

پاش ئەو پێشهاتە، جەنەڕاڵ دوگان بەهەموو هێزێکیو بەهەموو جۆرە چەكو کەلوپەلێکی سەربازییەوە، هێرشی کردە سەر دەرسیمو سڵی لەهیچ جۆرە دوژمنایەتیو خوێن ڕشتنو کردەوەیەکی نامرۆڤانە، دەرحەق بە هاوولاتییە مەدەنییەکانی ناوچە نەکردەوە، کەچی سەرەڕای ئەو هەموو هێزە سەربازیو قەتڵوعامە، نەیتوانی هیچ بەهیچ بکاو دزە بکاتە سنووری ژێر دەسەڵاتی خەباتگێڕەکانەوە. بەڵام بەداخەوە بزافی دەرسیم لەناوەوە، دووچاری ناکۆکیو خیانەت هاتو سەرەنجام دڵی خەباتگێڕە ڕاپەڕیوەکانی سارد کردەوە، لەو سەروبەندەدا، کاتێ عەلی شێرو یەکێ لەفەرماندە گەورەکانی خەباتگێڕان، لەلایەن سەید ڕەزاوە ڕاسپێردران بۆ ئەنجامدانی کاروباری دەرەوەی بزاڤەکە، سەردانی یەکێ لەولاتانی هاوسنوور بکەن، کەچی ڕووبەڕووی ناڕەزایی سەید ڕەهبەری برازای سەید ڕەزا بووەوە، سەید ڕەهبەر لەژێرەوە، پەیوەندیی لەگەڵ حکومەتی ناوەند دروستکردبوو، بۆیە بەفەرمانی حکومەت، عەلی شێرو زەریفەی هاوسەری عەلیشێری سەربڕیو لاشەکانیانی ناردە خزمەت فەرماندەکانی لەشکری ئەتاتورك.

لەسەرێکی ترەوە، شاهین ئاغای بەگی هۆزەکانی بەختیاریی دەرسیم،

کەیەکێبوو لەپیاوە دیارو سەرکردەکانی هێزە چەکدارەکانی بزاڤەکە، بەپیلانی خدر ناوێ کوژرا.

ئەو رووداوە ناخۆشانە بوون بەهۆی پەرتەوازە کردنی بارودۆخی خەباتگێڕەکان، ئەگەرچی تا دەهات جەسوورانەتر بەرگرییان لەدژی سەرکوتکردن دەکرد، لەو رووەوە سەید رەزا لەزستانی ئەو ساڵەدا، نەخشەی هێرشێکی گورچکبڕی بۆسەر بارەگای سەرەکی لەشکری دوژمن دارشت و خستیانە ژێر ئابلۆقەی خۆیانەوەو گورزی کاریگەریان لەو بارەگایە وەشاند، بەجۆرێ جەنەڕاڵ دوگان کەوتە ژێر گوشارەوەو بەناچاری پێشنیازەکەی پێشووی، لەبارەی دانوستاندن لەگەڵ سەید رەزا قبوڵ کردو پەیامێکی بۆ نارد، لەو سۆنگەیەوە کە سەید رەزا رێبەرێکی مەزهەبی راستگۆ بوو، پەیامەکەی جەنەڕاڵ دوگانی بە پێی یاسا نێو دەوڵەتییەکان رەوشی باوی هێزە ناکۆکەکان لێك دایەوەو پەسەندی کردو نەیزانی ئەوە پیلان و تەڵەیەکە بۆ چەواشەکردن و ساردکردنەوەی راپەڕیوەکان. دوا بەدوای ئەو بانگێشتە، سەید رەزاو ژمارەیەك لەسەرانی بزاڤەکەو گەورەپیاوانی هۆزو عەشیرەتەکان، ئەوانەی پەیوەندییان بەبزاڤەکەوە کردبوو، بەنیازی دانوستاندن و رەخساندنی گوزەرانێکی بەرێژە باشتر بۆ دانیشتوانی دەرسیم، بەرەو شاری ئەرزەنجان کەوتنەرێ، بەلام لەگەڵ گەیشتنیان بۆ ئەرزەنجان لەرۆژی ١٩٣٧/٩/٥، سەرجەم نوێنەران و سەرانی بزاڤەکە دەستگیرکران و رۆژی ١٩٣٧/١١/١٠ رەوانەی شاری (ئەلعزین) کران.

پاشان دادگاییکردنی سەید رەزا کوردی عەلەوی و هاوڕێکانی لەدادگایەکی سەربازی، سەردەمی جەنگدا دەستی پێکرد، خودی ئەتاتورك بەشداریی دانیشتنەکانی دادگای کردو لەنزیکەوە سەید رەزای ناسی، پاش

هەفتەیەك دادگاییکردن، دادگا بڕیاری لەسێدارەدانی سەید رەزاو ۲۷ هاوڕێی دەرکردو ۲۳ کەسی تریان بەزیندانیکردنی درێژخایەن حوکمدران.

رۆژی ۱۹۳۷/۱۱/۱۸، کەدەبێ بەرۆژی رەشی راپەڕینەکەی دەرسیم ناوببرێ، سەید رەزاو سەید رسییك حسێنیی کوڕیو قەنبەر ئاغای ئیلبێگی هۆزەکانی یوسفیانو سەید حسێن ئاغای ئیلبێگی هۆزەکانی کوڕەشییان لەتاریکی شەوی ئەو رۆژەدا، چوونە سەر داری ئازادیو لەسێدارەدران، لەساتەوەختی لەسێدارەدانی سەید رەزاداو بەپێی ئەو سەرچاوە ئاگادارەی چۆنێتی پرۆسەی ئیعدامکردنەکەیان تۆمار کردبوو، نووسراوە: سەید رەزا شیعرێکی بەزمانی کوردی خوێندەوە، ئەو زمانەی کە قەدەغەبوو لەئیداراتو دەوروبەری بنکە سەربازییەکانو تەنانەت شەقامەکانی ژێر دەسەڵاتی مستەفا کەمال پاشادا قسەی پێ بکرێو بەتاوان لەقەڵەم دەدرا، بەخوێندنەوەی ئەو شیعرە سەید رەزا بێ دەنگی شەوی شکاندو بەدەنگی بەرز وتی:

ئەز رۆڵەی سالاری کەربەلام

من لەکوشتن دەترسێنن؟

سوێندم بەیەزدانی پاك ئەو جنایەتەتان بێ تۆڵە

نامێنێتەوە، ئەی زاڵمینە شەرمەزار بن

(Armance. Jimare 99/1989 idamkirna seyid Reza. Capa sweden)

دکتۆر محەمەد دەرسیمی، دەربارەی ئیعدامکردنی سەید رەزا کوردی عەلەوی، لەلایەن حکومەتی کەمال پاشاوە نووسیویەتی: کاتێ سەید رەزایان بردە سەرداری ئیعدامکردن، سەر فرازو سەربەرزو سەرو ئاسا هەنگاوی دەنا، هەروەها لەدرێژەی ئەو شیعرە شەو شکێنەیدا دەیوت، من

تەمەنم٧٥ ساڵە، ئێوە من ناکوژن و من نامرم، بەڵکو شەهید دەبم و خوێنی هیچ شەهیدێك بەناحەق ناڕێژرێ و خوێنی منیش بێ تۆڵە نامێنێتەوە.

(Medya cunes Roya Mediya Jimara 38/1993 Istanbul)

پاشان زۆر لەسەرخۆ دەچێتە سەر سێدارەکەو بەشادمانی، وەك کەسێك کەبەدوا هەوارگەی خۆی گەیشتبێ، پەتی سێدارەکە دەکاتە ملی خۆی و وەك چۆن دوگمەی کراسێك دابخەی، ئاوها پەتی سێدارەکە توند گرێ دەدا، بەوجۆرە سەرکردەی تەمەن ٧٥ ساڵەی راپەڕینی عەولەوییەکانی زاگرۆس، لەدژی حکومەتی لائیکیی مستەفا کەمال پاشا شەهید کرا. پاش ئیعدام کردنی سەید رەزا، عیسمەت ئینۆنۆی سەرۆك وەزیرانی تورکیا، لەچاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا وتی: چیتر لەدەرسیمدا گرفتی ترمان نییەو ئەو ناوچەیەمان پاکسازی کردو یاخیبوونی چەکدارانە لەناوچەکەدا نەما، بەڵام ئەو قسانە لەپڕوپاگەندە بەو لاوە هیچی تر نەبوون، چونکە جەلال بایەری گەورە وەزیری ئەو لە کۆبوونەوەی رۆژی ١٩٣٨/٧/٣٠ی پەرلەمانی تورکیادا، رایگەیاندکە یەکێ لەگرفتەکانی ئێستای حکومەت، کێشەی دەرسیمەو پێویستە بەپێشبینی هەمەلایەنەو ئۆپراسیۆنی سەربازییەوە کۆتایی بەکێشەی ئەو ناوچەیە بهێنرێت.

یونس نادریی رۆژنامەوانی بەناوبانگی تورکیا، لەمانگی حوزەیرانی ١٩٣٨دا لەوتارێکدا نووسی: گوایە حکومەت ئەمساڵی بەساڵی پاکسازی کردنی دەرسیم ناولێناوەو بەنیازە لەو ناوچەیەدا ئۆپراسیۆنی سەربازی ئەنجام بدات.

ئەو لێدوانانە راست دەرچوون، چونکە عەلەوییەکانی دەرسیم بەهیچ جۆرێ حسابیان بۆ حکومەتە لائیکییەکەی کەمال پاشا نەکردو ملیان کەچ

نەکرد، بۆیە لەڕووی ناچاری کەمال پاشا پەنای بردەبەر دەرباری رەزا شای ئێران و حکومەتی عیراق، تاسنووری خۆیان بەڕووی خەباتگێرانی دەرسیمدا ببەستن، ئینجا هێزە سەربازییەکانی کەمال پاشا لەمانگی ئەیلول و ئۆکتۆبەری ١٩٣٨دا، جارێکی تر پەلاماری کێوو دەشت و دەوروبەری دەرسیمیان داو بەبەکارهێنانی تۆپ و بۆمب و چەکی پێشکەوتووی ئەو سەردەمە کەوتنە وێزەی خەڵکی ناوچەکە.

پرۆفسۆر دکتۆر جەلیلی جەلیل مێژوونووس و زانای گەورەی کورد مامۆستای بەشی کوردناسی لەئەکادیمیای رۆژهەڵاتناسیی لێنینگراد، دەربارەی مەزهەبی کوردە عەولەوییەکان و راپەرینەکەی سەید رەزا کوردی عەلەوی نووسیویەتی: ئایین و ئاینداری لەژیان و گوزەرانی ئێمەدا، رۆڵێکی گەورەی لەئەستۆدایە، تورکەکان ئەو ئەندێشانەی ئێمەیان بەهەلزانی و سوودیان لێوەرگرت، هەروەها پرۆفیسۆر جەلیلی دەڵێ کەلەنێوان کوردەکاندا، زۆر بیروباوەڕو ئایین بوون بەهۆی لەناوبردنی ستەم و زۆردارانی سیاسی زاڵ بەسەر کۆمەڵدا، لەو سۆنگەیەوە راپەڕینی عەولەوییەکانی دەرسیم، ژێرخانێکی ئایینی و مەزهەبی هەبوو. کەمالیستەکان بۆ لەکەدارکردنی کەسایەتی سیاسی مەزهەبی سەید رەزا لەبەرچاو پەیڕەوانی، هەروەها لەبەرچاو گروپە ئیسلامییەکانی تری تورکیا پڕوپاگەندەیان بۆ ئەوە کرد کەگوایە سەید رەزا نەك هەر سەید نییە، بەڵکو لەبنەماڵەو رەچەڵەکی پێغەمبەریش نییە، تەنانەت لەسەردەمی منداڵیدا لەکەنیسەیەکدا گەورە بووە(!!؟) هەروەها پڕوپاگەندەکانی حکومەت لەوەش زیاتر رۆیشتن و بەپەروەردەی دەستی شەیتانیان لەقەڵەمدا، لەکاتێکدا کەدانیشتوانی دەرسیم بەپەیڕەوانی عەلەوییەکانی زاگرۆس دادەنرێن و

مەزهەبی عەولەوییەکانی زاگرۆس لەدێرزەمانەوە لەناویاندا باوبووەو بەپێی قسـەی ئاگـاداران، سـەید رەزا وەك چـۆن لەسـەرداری سـێدارە خـۆی ناسـاندووە، لەسـەیدەکانی حسـێنی‌یەو زۆر دلێرانـەو بەشـانازییەوە، رێبەرێتی بزافی عەلەوییەکانی ئەو ناوچەیەی، تاساتەوەختی لەسێدارەدانی کردو ئەرکەکانی سەرشانی خۆی بەجێ گەیاند.(ئەحمەدی شەریفی- ئاوێنە- ژمارە ١٤-١٥، سالی ١٣٧٣، لاپەڕە ١٨-٢٠- راپەڕین سەیید رەزای کورد دژی ئەتا تورك)

# زنجیرەی بڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێران

| ژ | ناوی کتێب | زمان | نووسەر | بابەت | ساڵی دەرچوون | وەرگێر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | شائیسماعیلی یەکەم و جەنگی چالدێران | فارسی | هاشم حیجازی فەر | مێژوویی | ١٩٩٩ | کەمال رەشید |
| ٢ | رێکخراوە نێو دەوڵەتی و هەرێمییەکان | عەرەبی | ئەحمەد موسەوی | سیاسی | ١٩٩٨ | عەلی قادر عوبێد |
| ٣ | بنەماکانی دارشتن لە میدیاکاندا | فارسی | ئومێد مەسعودی | راگەیاندن | ١٩٩٩ | مەجید ساڵح |
| ٤ | *History A Brief of Kordistan* | کوردی | فوئاد تاهیر سادق | مێژوو | ٢٠٠٢ | فوئاد تاهیر سادق |
| ٥ | کاریگەری نست | عەرەبی | د.عەلی وەردی | دەروونناسی | ١٩٩٥ | سەمەد زەنگەنە |
| ٦ | دیموکراسی | فارسی | ئانتونی ئاربلاستەر | دیموکراسی | ٢٠٠٠ | رێباز مستەفا |
| ٧ | شمشێری دیمۆکلیس | عەرەبی | نازم حیکمەت | شانۆنامە | ١٩٧٤ | عەزیز گەردی |
| ٨ | بەڵگنامەکانی ئینگلیز | ئینگلیزی | ئا/بلال ن.شمشیر | سیاسی | ١٩٩١ | سەلمان عەلی |
| ٩ | چۆن لەگەڵ منداڵەکەمدا رەفتار بکەم؟ | فارسی | د.گاریر | پەروەردەیی | ٢٠٠٠ | شەیدا سەلاح |
| ١٠ | شەترەنج | ئەڵمانی | ستیڤان سڤایك | نۆڤلێت | ٢٠٠٠ | عەبدولئەمین دەشتی |
| ١١ | سەرمایەداری هاوبەشی | عەرەبی | ئالان مینك | سیاسی/ئابووری | ٢٠٠١ | دلێر میرزا |
| ١٢ | جیهانێکی لێکترازاو | عەرەبی | ئەنتۆنی گیدنز | سیاسی | ٢٠٠٠ | عەبدوڵڵا قەرەداغی |
| ١٣ | ناسنامە بکوژەکان | عەرەبی | ئەمین مەعلوف | سیاسی | ١٩٩٩ | کەژاڵ ئەحمەد |
| ١٤ | جريمة العراق في الابادة الجماعية | الانجليزية | منظمة حقوق الانسان | وثائقي | ٢٠٠١ | جمال ميرزا عزيز |
| ١٥ | دیموکراسی چییە | فارسی | دیڤید بیتهام | سیاسی | ٢٠٠٠ | شۆرش جوانرۆیی |
| ١٦ | دەربارەی دیموکراسی | فارسی | رۆبەرت داڵ | سیاسی | ١٩٩٩ | ئامانج عەزیزکەندی |
| ١٧ | سەرهەڵدانی ئاژاوەگێری | ئینگلیزی | رۆبەرت دی کاپلان | سیاسی | ٢٠٠٠ | شاخەوان مەنسور |